# شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری نەمر

# ٣

(فەتانەت - عیصمەت)

محمد فتح الله گولەن

شانازیی مرۆڤایەتی

# نووری ئەمر

## ٣

## ( فەتانەت - عیصمەت )

نووسینی

**محمد فتح الله گولەن**

وەرگێڕانی

**دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان**

چاپی یەکەم

**تشرینی یەکەم ٢٠١٢**

**تیراژ : ٥٠٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردنی (٢٢١٨)ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێبەخشراوە**

**شوێنی چاپ**

Neşe
Basım Yayım

Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 8330
www.nesematbaacilik.com



**دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان**
www.irfanpublishing.com

# پێڕستی بابەتەکان

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِينَ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ

وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

# پێشەکی

باسکردنی کەسایەتیی بەرز و ناوازەی حەزرەتی محمد المصطفی (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، زیاد لە باسکردنیش، پێشکەش کردنی وەك چارەیەك بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی و ئیکسیرێك بۆ دەردە ناسۆرەکانی.. هەروەها ناساندنی ژیانی موبارەکی بە شێوەیەك کە شایستەی ئەو زاتە مەزنە بێت، لەو بابەتە گرنگانەیە کە وەك زۆر کەسی تر، دنیای هزر و هەستی منیشی خستبووە ژێر فشارەوە و لە هەموو ڕوویەکەوە بووبووە خواست و خولیایەکی بەرنەگیراو...

ئەو مایەی شانازی مرۆڤایەتییە. ئەوەتا چواردە سەدەیە لە سەرانسەری دنیادا گەورەترین بیرمەند و کەڵەفەیلەسوف و ئەو زانا و ڕووناکبیرانەش کە هەر یەکەیان ئەستێرەی گەشی ئاسمانی هزر و بیرمانن، لەدوایەوە دەستەنەزەر وەستاون و لە ڕوویدا دەڵێن: "تۆ ئەو مرۆڤەیت کە شانازی بە شوێنکەوتەییتەوە دەکەین."

بۆ گەورەیی ئەو ئەوەندە بەسە کە سەرباری ئەو هەموو تێکدان و کاولکارییە ماددی و مەعنەوییانەی لەم چەرخەدا کراون، کەچی هێشتا لە منارەکانەوە زایەڵەی "أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله" دەبیستین و، شاباڵ گرتەی ڕۆحی ڕەوانی موحەممەدی بە هەموو لایەکدا دەبینین و، لەگەڵ ڕۆحانییەکاندا ڕۆژی پێنج جار ئێمەش دێینە جۆش و خرۆش.. دیسانەوە سەبارەت بە مەزنی و شکۆی ئەو دەتوانین بڵێین: سەرەڕای هەوڵی سەرومڕی دوژمنانی دین لە ناوەوە و دەرەوە لەپێناو گومڕاکردن و لەڕێ لادانی نەوەی نوێ، کەچی وا ئەمڕۆ چەندەها لاوی تازە پێگەیشتوو، هەرچەند لە قۆناغێکی زەمەنی ئەوتۆشدان کە دەرککردنیان بە "حەقیقەتی ئەحمەدی" وەك پێویست سەخت و دژوارە، چەشنی بەرەو پیرچوونی پەروانە بۆ ڕووناکی، بەرەو حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىَ اللهُ تَعَالَىَ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) باڵ دەگرن.

بەم کارەشیان هەڵوێستێك دەنوێنن کە لە دنیادا هاوتای نییە. دەستی زەمەن کۆتاتر بوو لەوەی بتوانێت هیچ حەقیقەتێکی تایبەت بەو لە ناخماندا کۆن و ڕەنگپەڕ بکات. بەڵێ، ئەو هێشتا تەڕو تازەیە لە سینەماندا. هەروەك زۆرجار بە دۆستەکانیشم دەڵێم؛ هەرکات دەچمە مەدینەی مونەووەرە، بۆن و بەرامەی ئەو سەروەرە بە جۆرێ دەمپێچێت، هەر دەڵێی هەنگاوێك لەولاترەوە بەخۆی شاد دەبم و بە دەنگە ژیانبەخشەکەیەوە پێم دەڵێ: "مَرْحَباً، أَهْلاً وَ سَهْلاً" و بەخێرهاتنم دەکات. جا ئیتر پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەنێوماندا تا ئەو ڕادەیە زیندە و تازەیە، هەر واش بەتازەیی و پاراویی دەمێنێتەوە.

بەڵێ، زەمەن پیر دەبێت و بەساڵا دەچێت. هەروەك چۆن هەندێك فیکر و بۆچوونیش پووچ و نابوود دەبن و لە بەها دەکەون. کەچی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەوێنەی ئەو خونچەیەی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ئاڵتر و پاراوتر دەبێ، هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە.

پێم وایە ئەگەر هێندەی کەسانی دی کە شتانی تر باس دەکەن، بمانتوانیبایە پێغەمبەری نازدار باس بکەین -کە بەداخەوە نەمانتوانیوە- بەو ئەندازەیەی کەسانی تر دەخرێنە پێش چاو و برەویان پێ دەدرێت، زەمینە بسازایە بۆ ڕۆشنایی خستنە سەر لایەنەکانی کەسایەتیی ئەو سەروەرە، هونەر و گشت یەکە و دامەزراوەکانی ژیان بۆ ناساندنی ئەو سەفەربەر بکرانایە، ئەوا ئەو کات لە دەروونی نەوەکانی ئەمرۆدا تەنها ئەو تەختی دادەنا و، دڵەکانیش تەنها بۆ ئەو لێیان دەدا.. سەرەڕای هەموو ئەمانە، وا ئێستا لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای دنیادا، ڕۆژ دوای ڕۆژ مرۆڤەکان هەریەکە و بە گۆزەکەی دەستیەوە بەرەو ئەو سەرچاوە سازگار و خاوێنە ڕادەکەن کە بە "منهل العذب المورود" ناوی دەبەم و کۆششی ئەوە دەکەن بگەنە مەنزڵی ئەو سوڵتانەی کە تاج لەسەری خۆرەکان دەنێت.

بەڵێ، ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا، لەپێشی هەمووشیانەوە ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و ئەڵمانیا، تێبینیی بووژانەوەیەك دەکەین ڕووەو ئەو. لە زۆر جێشدا موسوڵمانان بە تەشی دەستیانەوە سەرگەرمی ڕستنی بنەماکانی بەرنامەکەی

ئەون و، نەخش و نیگاری ناسك و دڵڕفێن تایبەت بە ئیسلام دەچنن. هەر دەڵێی ڕۆحیەتی "عەصری سەعادەت" سەرلەنوێ لە نێو موسوڵمانانداندا زیندوویووەتەوە. بارودۆخی جیهانی ئیسلامیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەمەدا نییە... ئەوەتا لەبری ئەوانەی یەك دوو سەدە لەمەوبەر بەبێ هیچ داوەرییەکی ژیریی و هەروا بە ساکاری هاتبوونە ڕیزی موسوڵمانانەوە، ئەمرۆ چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەواری وا هاتووەتە مەیدان کە لێکۆڵینەوەی زانستیانەی ڕەهەندەکانی ئیسلام دەکات و لە ژێر شەبەنگی پرشنگداری زانستدا شوێن پێی حەزرەتی موحەممەدی (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەڵگرتووە... ئەوانەش کە تا دوێنێ توێژی خوێندەوارانیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا و، زانکۆ و مەڵبەندەکانی فێربوونیان کردبووە شوێنکەوتەی تاقمێك "....یزم" و، دەزگا نیشتیمانیەکانیشیان بۆ بەرژەوەندی کوفر وەگەڕخستبوو، لەمەودوا هەروەك توانەوەی شەختە سەهۆڵینەکان، یەك لەدوای یەك دەتوێنــەوە و بەخێرایـی بەرەو رسـول الله (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) دەکەونە ڕێ.

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و وێڵی لقێکن خۆیانی پێوە ڕاگیر بکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یا درەنگ، مایەپووچی و بێ ئاکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بەپرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕادەکەن. ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە. ئەوە "مۆریس بۆکای" و "ڕۆجێ گارودی" و چەندەهای تری نەناسراویش...

بەڵام داخۆ ئێمە وەك پێویست ئەو "سوڵتانی دڵان"ەمان ناسیوە کە سوڵتانەکان فێری سوڵتانداری دەکات؟ جا بۆچی نێوە سەغڵەت بکەم! ئایا منێك کە لە پێنج ساڵییەوە سەرم لە سوجدەدایە و خۆم بە "قطمیر"[1]ی گەردن بەستراوی دەرگانەکەی دەزانم، توانیومە بەتەواوی بیناسێنم؟ یاخود تا چەند سەرکەوتوو بووم لە گەیاندنی ئەوەی کە دەیزانم؟ جا بۆیە لێرەدا ڕووی گوفتارم دەکەمە هەموو ئەوانەی وان لە مەقامی ناساندنی ئەودا و، خۆشم دەخەمە ڕیزیانەوە و دەڵێم: ئایا توانیومانە ئەو

[1] قطمیر ئەو ناوەیە کە لە سەگەکەی "أصحاب الکهف" نراوە.

سەرووەرەی کە شاهی تەختی دڵانە بە شێوەیەك کە شایانی قەدر و قیمەتی بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆحەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. جا ئەو دەم، بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە دەکەوتە پەرواز و، لەپێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکات...

لە کاتێکدا ئادەمیزاد هێندەی ئاشنایی و ناسینی خۆشەویستی ئاڕاستەی شتان دەکات، بەرامبەر ئەو شتانەش کە نایزانێت و ئاشنایی نییە، هەردەم جۆرێك لە دوژمنایەتی نواندووە. هەر بۆیە ئەو خاڵەی کە دوژمنان بەدرێژایی تەمەنیان هەوڵی خۆیانی تێدا چڕدەکەنەوە، بریتییە لە سڕینەوەی "نامی جەلیلی موحەممەدی" لە یادگەکاندا و، گۆشکردنی نەوەی نوێ لەسەر دوژمنایەتی کردنی فەخری کائینات (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ). بەڵام ئەوە چ درەوشانەوەیەکی لوتف ئامێزە کە سەرەڕای خواستی دوژمنان بۆ ڕیشەکەن کردنی ناوی ئەو لە دەروونەکاندا، کەچی وا ئەمڕۆ تێکڕای بەربەستەکانی گەیشتن بەو تەی کراون! نەخوازەڵا لاوان، کە وەك دڵخۆشیی ئەو کەسەی لە بیاباندا خەریك بوویێت لە تینواندا بمرێت، کەچی لە پڕێکدا و بە شێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوانی نەکردبێت لە پەنا سەریدا ئاوێکی سازگاری کەوسەرئاسای دەستکەوتبێت، ئاوەها بەو چەشنە خۆیان هەڵدەدەنە ئامێزی پڕ سۆزی ئەو نازدارەوە. بێگومان ئەو سینە پر سۆز و میهرەش لەئامێزیان دەگرێت و هەرگیز ئەو کەسانە بێ بەش ناکات کە بەرەو لای دێن.

نازانم قەت سەرنجی ئەو کەسانەتان داوە کە لە ڕۆژانی هەینیدا مزگەوتەکان سەرڕێژ دەکەن؟ ئەگەر بەوردی سەرنجتان دابێت، ئەوا بینیوتانە کە زۆربەیان لە گەنجانن. داخۆ دەبێت ئەو پاڵنەرە چی بێت کە لە بەرامبەر پەلکێشکاریی بەرنامە بۆ داڕێژراوی نەوەکان بۆ ناو گێژاوی ترسناکی گومڕایی و سەرکەشیدا، وای

لەو گەنجانە کردبێ کە بەبێ گوێدانە ساردوسڕی زستان و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڵدەلەرزن لە سەرمادا، دەستنوێژ بگرن و لە ناهەموارترین هەلومەرجدا بەرەو مزگەوتەکان هەنگاو بنێن؟ گەر پێتان باش بێ من وەڵام دەدەمەوە: ئەوە جازیبەی قودسیی حەزرەتی موحەممەدە...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکیشدا ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیوە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و بەوێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن: "ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟" بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بووبێت و هەموو شتێك کۆتایی هاتبێت...

جیهان بەهەڵەداوان بەرەو لای ئەو دێت. ئەوەتا ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن و، ئەو دەروونانەش کە بەڕووی جیهانی فیکردا واڵان، شوێنی دەکەون و زۆرێکیش لەوانەی کە تا ڕۆژانێك لەبەرەی دوژمنانیدا بوون، وا ئێستا دەبنە دۆستی زۆر نزیکی و دەچنە داڵدەی ئەوەوە، هەروەك بەڕاستیش چوون... ئیدی ئەمڕۆ تەنانەت بە پێوانە و کێشانەکانی بەرەی بەرامبەریش حەزرەتی موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سەنگی خۆی هەیە و ئەوانیش دان دەنێن بە قەدر و گەورەییەکەیدا... پێغەمبەری خوا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "بە دە کەس لە ئوممەتەکەم کێشرام، من سەنگینتر دەرچووم. ئەوجا بە سەد، لەپاشان بە هەزار کەس کێشرام، دیسان هەر من سەنگینتر بووم. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئەو دوو مەلائیکەتەی بەم کارە ڕاسپێررابوون، وتیان: وازبێنە، خۆ ئەگەر بە هەموو ئوممەتەکەشی بکێشرێ، هێشتا هەر ئەم قورستر دەبێت."[1] جا خۆ ئەوەش هاتە دی. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) یەکێك لەو خەونانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە

١ الدارمي، المقدمة ٣؛ بزار، المسند ٤٣٧/٩؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٢٥٥/٨.

دیویەتی: "لە تایەکی تەرازوودا من و لە تاکەی تریشیدا هەموو ئوممەتەکەم دانرا، من سەنگینتر بووم."[1]

بەڵێ، ئەگەر سەرجەم ئەصحاب و تابیعین و شوێنکەوتوانی تابیعین و ئەوانەی دوای ئەوانیش و ئەو کەسایەتییە مەزنانەش کە تا ڕۆژی قیامەت دێن و ئەو خواناسانەش کە ڕێچکەی چوونە نێو دڵانیان دۆزیوەتەوە و تێکڕای ئەولیا و ئەصفیا و موقەڕڕەبین، هەر هەموویان لە تای تەرازوویەکدا دابنرێن، ئەوا دیسان سوڵتانی دڵان، نووری چاوان قورستر دەبێت. ئاخر چۆن نا! لە کاتێکدا بوون لەبەر حورمەتی ڕووی ئەو بەدیهێنراوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هۆی بەدیهاتنی بوونەوەرانە. لە وتەیەکدا کە وەك فەرمووده ناوبانگی دەرکردووە، بەم جۆرە باسکراوە: لَوْلَاكَ لَوْلَاكَ مَا خَلَقْتُ الْأَفْلَاكَ "ئەگەر تۆ نەبوویتایە، بوونم بەدی نەدەهێنا."[2] بەڵێ وایە، نووسینی کتێبێك کە تێگەیشتنی مەحاڵ بێت، کارێکی بێ هودەیە. خوای گەورەش لە هەموو کارێکی بێ هودە و بەهەوانتە پاك و بێگەردە. بەم جۆرە، زۆر پێویست بوو ڕابەرێکی دەنگ زوڵاڵی وەك سەرداری زەمان و مەکان، حەزرەتی عالی مەقام (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بێت و واتای دێڕەکانی گەردوون ڕوون بکاتەوە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە بوونی ڕاڤەکار و ڕاگەیەنەرێك زۆر پێویست بوو تا ئەوەی ڕاستییەکانی پشت پەردەی بوون ئاشکرا بکات. هەروەها ئەو مرۆڤەی کە گەردوونی بێ بن، بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی ناویەوە بۆ خزمەتی ڕام کراوە، ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە لە کوێوە هاتووە.. بۆ کوێ دەڕوات.. و نامزەدی چ شتێکە... کەوابێ، ئەگەر ئەو نەبووایە، گەردوونیش و مرۆڤیش هیچ مانایەکیان نەدەبوو... بەڵێ، حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەو مرۆڤەیە کە واتای بۆ شتان گەڕاندەوە. ئەو لە نازدارترین خۆشەویست خۆشەویستترە لامان.

لێرەدا - لەگەڵ دان نانم بەوەی کە خۆم بە گوناهبارترینی باوەڕداران دەزانم -

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٧٦/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ٥٨/٩.
٢ علي القاري، الأسرار المرفوعة ٣٨٥؛ عجلوني، كشف الخفاء ٢١٤/٢.

هەستێکم هەیە بێ باسکردنی تێناپەڕم. نیازیشم لە گێڕانەوەی ئەوەیە کە: ئەگەر من تا ئەو ڕادەیە پێغەمبەری خوام خۆشبوێت، کێ دەزانێت مەشخەڵی ئەوینی ئەو لەو دڵانەدا کە لێهاتنیان هەیە، تا چ پلەیەك بڵێسەی سەندووە!.. بۆیە دەبێت لەم سۆنگەیەوە بڕوانرێتە ئەو حاڵەتە ڕۆحیەی دەیگێڕمەوە. دەنا، پێم شەرمە لە حوزووڕتاندا باسی شتێك بکەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێت.

ئەو کاتەی خوای گەورە بە نسیبی کردم دەموچاوی گوناهکارم بسووم بەو خاکە موبارەکەدا، شارەکەی پێغەمبەری خوا هێندە درەوشاوە بوو لە لام و چێژێکی ڕۆحی وام چەشت، ئەگەر لەو کاتەدا -بە فەرزی مەحاڵ- لە هەموو دەروازەکانی بەهەشتەوە بانگهێشت بکرامایە، باوەڕ بکەن نەدەچووم بۆ هیچ کامیان و مانەوەم لە شارەکەی رسول الله دا هەڵدەبژارد. لە ڕاستیدا بەهەشت ئاوات و ئارەزووی هەموومانە. تاکە موسوڵمانێکیش نییە ئەم ئاواتەی نەبێت. ئەی مەگەر هەموو بەیانی و ئێوارانێك لە دوعاکانماندا لە پەروەردگار ناپاڕێینەوە کە پەنامان بدات لە دۆزەخ و بمانخاتە بەهەشتەکەیەوە؟ لەگەڵ داننانم بە هەموو ئەمانەدا، دەڵێم: ئەگەر لەو کاتەدا بانگ بکرامایە بۆ بەدەست هێنانی ئەو پایە بەرزەی کە لە دواڕۆژدا بەدەست دێت، لەوانەیە مۆڵەتم لە پەروەردگارم بخواستایە و عەرزی ئارەزووی مانەوەم بکردایە لە ڕەوزەی پاکی رسول الله دا. تکا دەکەم وا گومان نەبەن بەمانە شایستەیی و لێهاتوویی خۆم بۆ ئەو مەقامە بەرزانە دەربڕیبێت، بەڵکو تەنها ویستوومە ئاماژەیەك بۆ ئەو خۆشەویستییە بکەم کە بۆ پێغەمبەری خوا هەمە. گەرنا، بەدرێژایی ژیانم لەو کەسانە بووم کە دوعا دەکەن و دەپاڕێنەوە تا خوای گەورە شەرەفمەندیان بکات بەوەی ببنە کۆیلەی گەردنبەندی بچووکترین هاوەڵی پێغەمبەری خوا. زۆرجاریش ئەم دوعایە ویردی سەر زوبانمان بووە: "پەروەردگارا، بۆ ساتێکیش بێت لە خولیای دەموچاو سووین بە تۆزی بەر پێیان بەدوورمان مەگرە." ئامین.

لە "ماڵی خوا"شدا ناخم لە هەمان جۆش و خرۆش تەژی بوو. لەوانەیە ئەمانە هەست و نەستی هاوبەشی هەموومان بن. ماوەتەوە بڵێم؛ ئەوانەی پڕاوپڕی ئەم

هەستانە دەژین، تەنها من و چەند کەسێکی هاوشێوەی من نین، بەڵکو پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) شەیدا و ئەویندارى واى هەيە، ئەم حاڵەتە ڕۆحيەى من گێڕامەوە، بەلاى ئەوانەوە زۆر کرچ و کاڵ و سەرەتايى دەبێت.

جا مادەم باس گەيشتە ئێرە، پێم خۆشە بيرەوەرييەکى تريشتان عەرز بکەم: لەگەڵ کاك عارف حيکمەت کە ئەو کات ئەندام پەرلەمان بوو، لە حەج پێکەوە بووين. کاك عارف پەيمانى دابوو کە: "ئەگەر بچمە مەدينە، شەرت بێ وەك گوێدرێژ لە خۆڵەکەيدا خۆم بگەوزێنم." جا هەر کە پێى نايە خاکى مەدينەوە، پەيمانەکەى هێنايەجێ. ئەوەبوو ئەو ڕۆحە بەرزە خۆى لە خۆڵدا گەوزاند و تەپاوتلى تێدا دەکرد. لێرە و لەوێ هەرکات ئەو ديمەنەم دێتەوە ياد، خۆم پێ ناگيرێ و چاوانم پڕ دەبن لە فرمێسك.

حەزرەتى موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێغەمبەرە. بەڵام پێغەمبەرێك کە گشت پێغەمبەرانى پێش خۆى لە منارەى پێغەمبەرايەتييانەوە مزگێنى هاتنيان داوە. خواى گەورە لە قورئانى پيرۆزدا ئەو پەيمانەمان بۆ تۆمار دەکات کە لە سەرجەم پێغەمبەرانى وەرگرتووە سەبارەت بە باوەڕهێنان و پشتيوانى کردنى ئەو پێغەمبەرەى کە خۆيان مژدەى هاتنيان داوە:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ (آل عمران : ٨١)

"(ياديان بێنە) کاتێك خوا پەيمانى لە يەکە يەکەى پێغەمبەران وەرگرت، کاتێك کتێب و دانايى پێبەخشين بەوەى کە ئەگەر: لە ئايندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن و بەڕاستدانەرى ئەوەى ئێوەش بوو، ئەوە دەبێت باوەڕى پێ بهێنن و پشتگيرى بکەن. ئينجا خوا فەرمووى: ئايا بڕيارتاندا و پەيمانى منتان بەو جۆرە وەرگرت کە پێم ڕاگەياندن؟ وتيان: بڕيارماندا (و هەروا دەکەين).

ئەوسا خوا پێی فەرموون: دە بەشایەت بن و منیش لەگەڵتان یەکێکم لە شایەتەکان."

ئیتر ئەو پێغەمبەرانەش لەو پەیمانەیاندا کە بە پەروەردگاریان دابوو، ڕاستگۆ بوون و لە هەموو جووڵە و کردەیەکیاندا لەو چوارچێوەیەدا مانەوە. ئەوەتا کاتێك سەروەرمان میعراجی کرد، هەموویان بە ڕۆحیانەت لەدوایەوە نوێژیان کرد.[1] بەڵێ، وەك بڵێی هەموو پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ ٱلسَّلَامُ) لە پێشەکی هەمووشیانەوە؛ حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی نوح و حەزرەتی موسا و حەزرەتی عیسا دەیانویست ببنە بانگبێژ و قامەت خوێنی. حەزرەتی مەسیح لە ئینجیلدا ئەو پێغەمبەرە قەدربەرزەی دەخستە بەرچاو و دەیوت: "من دەڕۆم تا سەرداری زەمان بێت."[2] بەڵێ، ئەو دەمەی بەرەو ئاسمان بڵند بووەوە، دامێنی ئاسمانەکان پڕ بوون لە گەوهەر و، ئەستێرەکان بەوێنەی بەردی سەر ڕێ لەژێر پێیدا ڕاخران. کاتێکیش خۆر گەیشتە ئاسۆکەی حەزرەتی موحەممەد (عَلَيۡهِ أَفۡضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، خولیا و سەودای سەری بووبووە ئەوەی ببێتە گەوهەرێك لە تاجەکەی موستەفادا. بەڵێ، هەموو ئەمانە وەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەرایەتییەکەیدا پەرواز بووبوون و دەسووڕانەوە. ئیتر لەمانەوە چی دەربچێت!

لەتاو شەمعەی نووری ئەحمەد جوبرەئیل بووە پەروانە

لەتاو جەماڵی نووری موحەممەد مەلەك پەروانەئاسا

سەرگەرمی سووڕانە...

هاودەم لەتەك ئەمانەشدا، لە ڕوانگەی خەسڵەتە ئادەمییەکانیشەوە لە لوتکەدا بوو و ڕابەرایەتی و پێشەنگیی ئێمەی ئادەمیی دەکرد. بۆ نموونە؛ پێغەمبەری خوا سەرۆك خێزانێکی کامڵی بێ هاوتا بوو. ئەوەتا لە ماوەیەکی دیاریکراوی ژیانیدا، نۆ دانە ئافرەت لە ژێر نیکاح و بەڕێوەبردنی ئەودا بوون.[3] لەگەڵ ئەمەشدا

١ مسلم، الإيمان ٢٧٨.
٢ يوحنا، باب ١٦، ڕستەی ٧-١٥.
٣ البخاري، النكاح ٤، ١٠٢.

بواری نەدا لە نێوانیاندا هیچ جۆرە دەمەقاڵێ و بارگرژییەك ڕوبدات. جا ئەگەر ئەو ڕۆڵانەی لەو خانەیەدا -کە تنۆك تنۆك ئیکسیری نبووەتی لێ دەچۆڕی- گۆش و پەروەردە کران، هەریەکەو بەسەر سەدەیەکدا دابەش بکرانایە، ئەوا دەبوونە موجتەهید و موجەددیدانێك بەس بن بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەو سەدەیە. داخۆ دەبێت چەند کەس لەم ڕووەوە پێغەمبەری خوایان ناسیبێت!..

حەزرەتی فەخری عالەم (عَلَيْهِ اَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە هەمان کاتدا سەرکردەیەکی سەربازیی بێ وێنەش بوو. ئەوەتا بە مشتێك مرۆڤەوە کە وەك خەرمانەی مانگ دەوریان دابوو، جەنگی بەرووی جیهاندا ڕاگەیاند و تەخت و سەرای چەندین گەورە سوڵتانی یەکسانی خاك کرد و چەندینی تریشیانی کردە بەندەی بەردەرگانەکەی. ئەمە لەکاتێکدا کە بە ڕواڵەت هونەر و زانستی جەنگی لە کەسەوە فێرنەبووبوو.

ئینجا پێغەمبەری نازدار (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئەو مرۆڤە مەزنە بوو کە زانستەکان لای ئەو دەگەیشتنە پایان. دەتوت لە شاشەیەکدا تەماشای ئەو ڕووداوانە دەکات کە تا ڕۆژی قیامەت دێنە سەر شانۆی بوون یان هەروەك ئەوەی لە تۆمارێکی غەیبیدا بیانخوێنێتەوە، ئاوا لە یەك بە یەکیان دەدوا. تەنانەت دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیەش بەسەر کۆچکردنیدا بۆ خانەی جاویدانی، کەچی وا ئەمڕۆ هەموو لایەکمان لەو کۆتا خاڵەدا کە زانست و تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی سەردەم پێی گەیشتووە، ئەو بەیداخە شەکاوەیە دەبینین کە رسول اللّٰه (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) چواردە سەدە لەمەوپێش هەڵی کردووە.. ئیدی ئەوانەیان کە خوای گەورە هیدایەتی لەچارە نووسیون، "کەلیمەی قودسییەی تەییبە" دەهێنن و هەر یەکێکیان دەبێتە ئەڵقەیەکی نوورین لە زنجیرە کاروانی موسوڵماناندا. ئەمەش نموونەیەك لەنێو هەزاران نموونەدا:

لە کاسێتێکی ڤیدیۆییدا تەماشای دکتۆرێکی بەڕەگەز کەنەدیم کرد کە ناوی "کیث مۆر" بوو. ئەم دکتۆرە، پسپۆڕی زانستی کۆرپەلەزانی و پرۆفیسۆری توێکارییە لە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی "تۆرۆنتۆ". مۆر کاتێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە گوێبیستی قۆناغەکانی گەشەی کۆرپەلە دەبێت لە سکی دایکدا،

کە ڕاستییەکی زانستییە و تەنها لە ڕێگەی تەکنەلۆجیای پێشکەوتووی ئەم سەردەمەوە دۆزراوەتەوە، یەکسەر دەڵێت: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ" و بەمە تەسلیمییەتی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا دەردەبڕێت. هەروەها زانایەکی فیسیۆلۆجی یابانیش کاتێك ئایەتەکانی قورئان سەبارەت بە بوارەکەی خۆی دەبینێت دەڵێت: "أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ" -هەرچەندە لەسەر زاریشی گران بوو- و بۆ ساتێکیش چییە لە هاتنە ناو ئیسلام دوودڵ نابێت.

بەڵێ، هەروەك ئاشکرایە لەو شوێنەدا کە زانستەکان دەچەقن و پەکیان دەکەوێت، قورئانی پیرۆز چەندین دەروازەیان بەڕوودا واڵادەکات. کۆتا خاڵیش کە زانست و زانیاری پێی بگات، لەگەڵ خاڵی دەستپێکی پێغەمبەری خوادا یەکدەگرێتەوە. باشە، بەڵام کێ ئەمانەی فێرکردووە؟ ئەو، وانەی لە زاتی "العَلِیم" و "الخَبِیر"ەوە وەرگرتبوو و، "موعەللیمی ئەزەلی" لەودیو ڕەحلەی تەدریسەکەیەوە بوو. هەربۆیە دەستی زەمەن نەگەیشتە چمکی مەعریفەتەکەی تا کۆنی بکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پاراوتر و نوێتر دەبووەوە. هەتا دنیاش دنیا بێت هەر لە تازەبوونەوەدا دەبێت.

ئینجا حەزرەتی حبیب الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ) بە شێوەیەك کە بۆ هیچ کەسێکی تر نەڕەخسابێت، لە لایەن هاوەڵانیەوە خۆشدەویسترا. بۆ نموونە: لە کۆتایی ڕووداوی "ماء الرجیع"دا، کاتێك کافرانی دڵ پڕ لە قین "خوبەیبی کوڕی عەدی"یان ڕاپێچی پەتی سێدارە دەکرد، ئەم پرسیارەیان ئاڕاستە کرد: "ئایا پێت خۆش بوو ئێستا موحەممەد لە جێگەی تۆدا بووایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بەئاسوودەیی ژیانت بەسەر ببردایە؟" وەڵامی ئەم پرسیارە ڕوون و یەکلایی و بێ پەروا بوو:

"نەخێر وەڵڵاهی، ڕازی نابم لەپای ڕزگاربوونی مندا، تەنانەت دڕکێکیش بچێت بە پێی پێغەمبەری خوادا."

جا لەپاش نواندنی ئەم تابلۆ مەردانەیە لەسەر سەکۆی سێدارە، حەزرەتی خوبەیب

(رضي الله عنه) دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: "خوایە گیان، بەبێ ماڵئاوایی کردن لە خۆشەویستەکەت هاتم بۆ ئێرە. دەسا سەلامی منی پێ بگەیەنە." پێغەمبەری خوا کە لەو کاتەدا لەنێو ئەصحابدا دانیشتبوو و قسەی دەکرد، لە پڕ هەستایە سەرپێ و فەرمووی: "سەلامی خوا لە تۆش ئەی خوبەیب." کاتێکیش هاوەڵان پرسیاریان کرد، پێغەمبەری نازدار (عليه الصلاة والسلام) بەچاوی پڕ فرمێسکەوە وەڵامی دانەوە: "موشریکەکان خوبەیبیان شەهید کرد. لە دواساتەکانیدا سەلامی بۆ ناردم، منیش وەڵامی سەلامەکەیم دایەوە."[1]

دیمەنێکی تر کە تا ئێستاش دڵگوشادی دەبەخشێتە دەروونی هەموو ئیماندارێك: کاتێك حەزرەتی "سومەیرا" لە غەزای ئوحوددا دەنگۆی شەهیدکردنی پێغەمبەری خوا دەبیستێت، دەستبەجێ خۆی دەگەیەنێتە دامێنی چیای ئوحود... جا کە لەوێ پێی دەڵێن: "باوکت".."مێردەکەت".." کوڕەکانت" شەهیدبوون و تەرمەکانیانی پیشان دەدرێت، ئەم شێرەژنە گوێ بە هیچ کام لەمانە نادات و بەملاو ئەولادا هەر بەدوای پێغەمبەری خوادا دەگەڕێت و لەبەر خۆیەوە ورتەی دێت و دەڵێت: "رسول الله چی بەسەر هاتووە؟" ئینجا کە شوێنی پێغەمبەری خوای پێ نیشان دەدەن، بەڕاکردن بەرەو ئەو شوێنە دەڕوات و لەبەردەم پێغەمبەری خوادا خۆی دەدات بە زەویدا و دەڵێت: كُلُّ مُصِيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ "ئیتر هەر ئەوەندەی کە تۆ لە ژیاندایت، هەرچی بەڵاو موسیبەت هەیە سووك و بێ ئەرزشە."[2] بەڵێ، رسول الله (عليه الصلاة والسلام) ئا بەو شێوەیە جێی خۆی لە دڵ و دەروونەکاندا کردبووە.

نموونەیەکی تر: مەردی ئاسۆکان لەودیوی ئاسمانەکانەوە بانگهێشت کرابوو. ئیدی وادەی جێهێشتنی ئەو دۆستانە هاتبووە پێش کە بیست و سێ ساڵ پێکەوەبیان هەبوو. هەر بۆیە لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا کەمێك بە دڵتەنگی و خەفەتەوە دەچووە لای هاوەڵانی. ئەم حاڵەتەی پێغەمبەری خوا هێندە کاری لە ئەصحاب

١ سعيد بن منصور، السنن ٣٤٩/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ٢٦٠/٥؛ إبن كثير، البداية و النهاية ٦٦/٤.

٢ إبن هشام، الصراط النبوية ٥٠/٤؛ الطبري، تأريخ الأمم و الملوك ٧٤/٢؛ الهيثمي، مجمع الزوائد ١١٥/٦.

دەکرد و هەستی دەبزواندن، کاتێك پێغەمبەر دەچووەوە خانەی سەعادەتی، دەتوت لە سینەی هەر یەکێکیاندا شنەی خەزان هەڵی کردووە. ئەوەبوو هاوەڵی بەڕێز موعاذی کوڕی جەبەل (رضيَ اللهُ عَنْهُ) لە لایەن پێغەمبەری خواوە ڕاسپێررابوو کە بچێت بۆ یەمەن. ئیتر ئەویش لەو نێوانەدا هاتوچۆی دەکرد. کاتێك دەڕۆیشت پەیامەکانی پێغەمبەری دەبرد. لە گەڕانەوەشدا ئەو مەسەلە و گرفتانەی دەهێنا کە چاوەڕوانی چارەسەر بوون. بەر لەوەی دوایەمین گەشتی ئەنجام بدات، دەچووە خزمەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) داوای دوعای لێ دەکرد، ئینجا بەڕێ دەکەوت. بەڵام ئەمجارەیان جیاواز لە جارانی پێشوو، حەزرەت پێی فەرموو: "لەسەر خێر بڕۆیت ئەی موعاذ، بەڵام ئەم جارەیان لەگەڕانەوەتدا لەوانەیە تەنها بتوانیت سەردانی مزگەوتەکەم و گۆڕەکەم بکەیت." ئەم چەند وشەیە برووسکەیەك بوو و دای لە حەزرەتی موعاذ. لە پەلوپۆ کەوت و فرمێسك لە چاوانی داباری. دەتوت ئەژنۆی شکاوە. چوون بۆ یەمەن بە لایەك، تەنانەت توانای نەبوو لە شوێنی خۆیشی هەستێت.[1]

لەلایەکی ترەوە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەروەك موو لە ماست دەربێنێت، ئاوەها بەئاسانی سەرجەم ئەو گرفت و کێشانەی چارەسەر دەکرد کە تایبەت بوون بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. "بێرنارد شۆ" کە سیازدە سەدە دوای ئەو هاتووە، تەنها یەکێکە لەو سەدان مرۆڤەی بەرەی بەرامبەر کە بەم وتانەی خوارەوەی ئەم ڕاستییەی قبووڵ کردووە: "مرۆڤایەتی چەندە ئاتاجی ئەو حەزرەتی موحەممەدەیە کە هەموو کێشە و گرفتە کەڵەکەبووەکانی ئەم چەرخەی بە وێنەی سانایی خواردنەوەی کوپێك قاوە چارەسەر دەکرد." فەزیلەت و گەورەیی ئەوەیە کە دوژمنیش دانی پێدا بنێت.

بەڵێ، ئەو کاتەی مرۆڤایەتی بۆ لای حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەگەڕێتەوە، بە ئاسوودەیی و دڵنیایی شاد دەبێتەوە. ئیتر ئەو کات، دەستی دەگاتە

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٥/٥؛ البزار، المسند ٩١/٧-٩٢؛ إبن حبان، الصحيح ٤١٤/٢؛ الطبراني، المعجم الكبير ١٢١/٢٠.

ئاسۆ پرشنگەکان و لە دەربەدەری و گاڵتەجاڕیی دەستی ڕۆژگار و پەژموورده‌یی دنیاو ئاخیرەت ڕزگاری دەبێ و بەرەو ئاسمانی مرۆڤایەتی بەرزدەبێتەوە. تەنانەت لەگەڵ کۆسپ و ڕێگریی هەموو هێزە نەیارەکانیشدا، سروەی ئەم دووەمین بوژانەوەیە هەڵیکردووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾

(الصف: ٨-٩)

"ئەوانە دەیانەوێت بە فوو، بە قەڵەی دەم نووری خوا بکوژێننەوە!! (خەیاڵیان خاوە) خوا نووری خۆی (ئاینی خۆی) تەواو دەکات و دەیچەسپێنێت، هەرچەندە کافر و بێ بڕواکان پێی سەغڵەت بن و پێشیان ناخۆش بێت. هەر ئەو خوایە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموویی و ئاینی حەق و ڕاستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە هاوبەش پەیداکارانیش پێیان ناخۆش بێت."

بەڵێ، خوای گەورە دینەکەی خۆی سەردەخات. سینەو دڵە ئاتاجەکانیش کەمەندکێشی دەبن و بەختەوەری و دڵنیایی خۆیان لەودا دەبیننەوە و دەگەنە ئاستێك، هەر لە دنیادا وا دەزانن چوونەتە بەهەشتەوە. جا کافر و ستەمکارانی دنیای ئەولا و مونافیقانی ئاسیاش کە لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا مرۆڤەکان دەقۆزنەوە و بێ ئاگایانی ناوخۆشمان، پێیان خۆش بێت یان نا، ڕۆژێك دێت ئەو شاهی شاهانەی کە لە لایەن پێغەمبەرانەوە بە "سوڵتانی ئەنبیا" ناسراوە و ڕۆژی پێنج جار ناوی پڕشکۆی بەگوێی جیهاندا دەدرێت، دەچێتە نێو گشت دڵەکانەوە و دەبێتە خۆشەویست و لەدڵدا هەڵگیراوی هەموو لایەك.

ئەو لە هەمان کاتدا کانگای دڵنیایی و ئارامییە. ئێمە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی کە ئەو پەیامەی ئەو هێناویەتی، لە هەمان کاتدا سەرچاوەی ئاسودەیی و

دڵنیاییشه. گەورەترین شاهیدی ئەم ڕاستییەش مێژووه. تاکه ڕێگەی دووباره چەشتنەوەی ئەم ئارامییەش بە مرۆڤایەتی، بریتییه لە ناساندنی ئەو سەروەرە و ئەو نوورەی که هێناویەتی. چونکه هەر کات مرۆڤایەتی چاکتر ئەو پێغەمبەرەی ناسی، خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبێ و لە سایەی ئەو خۆشەویستییەشدا سیمای کۆمەڵگە دەگۆڕڕێت.[1]

جا لە چوارچێوەی ئەم پێشەکییەدا که پێشینان بە "دیباجە" ناویان دەبرد، پشت ئەستوور بە لوتف و کەرەمی پەروەردگار، هەوڵماندا بەکورتی چەند شتێکی پیرۆزی ئاسا دەربارەی ڕەهەندە جیاوازەکانی سەروەری هەردوو جیهان، مایەی شانازی بوونەوەران عەرز بکەین.

لە ڕاستیدا هەر وتەیەك باس لەو بکات جوان و شیرینە. ئەوەش که جوان و پەسەند نییە، دەبێت بدرێتە پاڵ دەربڕین و شێوازەکەی. جا ئەگەر لە دەربڕین و شێوازدا کەموکورتییەك هەبێت، ئەوا بەتەواوەتی بۆ من دەگەڕێتەوە. ئەوەشی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە (صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، تەنها و تەنها جوانییە.

[1] حەزرەتی عەلی (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) بەم شێوەیە باسی پێغەمبەری خوای دەکرد: مَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ "هەرکەس - ئاکارە بەرزەکانی - بزانیایە و تێکەڵاوی بکردایە، ئەوی - لە هەموو شتێك - خۆشتر دەویست." الترمذي، المناقب ٨؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٢٨/٦؛ البيهقي، الشعب الأيمان ١٥٠/٢.

## فەتانەت و چەند سیفەتێکی سەروەرمان

### ١. سۆز و میهرەبانی

دیوێکی تری فەتانەتی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، سۆز و میهرەبانییەکەیەتی. لە هەمان کاتدا، لە سۆز و میهرەبانییەکەیدا ئاسۆیەکی تری دەرکێکی بێوێنە پەنهانە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا وەك تاقانە نمایندەی ڕەحمانییەت و ڕەحیمیەتی پەروەردگار لەسەر زەوی، کاریگەری ئەم دوو سیفەتە موبارەکەی وەك ئیکسیرێك بەکارهێناوە و لە سەرجەم دڵاندا تەختی خۆشەویستی خۆی داناوە. لە ڕاستیشدا هیچ شتێکی تر هێندەی سۆز و بەزەیی و نەرمونیانی و دڵسۆزی و لەدڵەوەبوون، مرۆڤ لای خەڵکی خۆشەویست و پەسەند ناکات. بۆیە دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ڕێی ناسکی دەروونی و لێهاتنە بێ وێنەکەی و فەتانەتەکەیەوە، زۆر بەباشی سوودی لە سۆز و میهرەبانییەکەی وەرگرت و وەك مەودایەکی تری فەتانەتەکەی بەکاری هێنا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە بەڵگەیەکی تر دادەنرێت لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی. خوای گەورە (عَزَّ وَجَلَّ) ئەوی وەك ڕەحمەت ناردووە بۆ هەموو جیهانیان. بەڵێ، ئەو ئاوێنەی پرشنگدار و درەوشاوەی ڕەحمەتی کردگاری میهرەبانە. هەر دەڵێی چاوگێکی سازگار و حەوزێکی کەوسەرە لە جەرگەی بیابانی کاکی بەکاکیدا، هەرکێ دەستی دابێتە گۆزەکەی و بەرەو ئەو مێرگە کەوتبێتە ڕێ، پێی گەیشتووە؛ هەم گۆزەکەی پڕکردووە، هەم بە کامی دڵیشی لەو ئاوە سازگارەی نۆش کردووە. جا ئیتر بەم ڕەحمەتەیەوە هەروەك کانیاوێکی کەوسەرینە کە بەڕووی هەمواندا کرابێتەوە... هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ سوودی لێوەربگرێت.

ئەوەتا ئەو پێشەوا سەروەرە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەڕێی فەتانەتە سەرسوڕهێنەکەیەوە دەتوت ئەم ڕەحمەتەی ماهییەتی کردووەتە داوێکی نوورینی بە بەهەشت گرێدراوەوە

و ئەو ڕۆحانەی پێ ڕاو دەكات كە تینووی ڕەحمەتەكەین. هەركێ بكەوتایەتە كەشی ئەفسوناویی ئەو داوەوە، دواجار خۆی لە لوتكەدا دەبینیەوە. ئیتر ڕەحمەت لەناو دەستی ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بووبووە كلیلێكی سیحری لەم جۆرە. ئینجا هەر بەم كلیلە هەموو ئەو قوفڵە كوێرەوەبوو و ژەنگگرتووانەی كردەوە كە كرانەوەیان بە ئەستەم دەبینرا و مەشخەڵی ئیمانی لە گشت دەروونەكاندا داگیرساند.

بەڵێ، لەنێو تەواوی مرۆڤایەتیدا ئەم كلیلە ئاڵتوونییە ئەسپەردەی ئەو حەزرەتی محمد المصطفى‌یە كرا كە ڕۆح ئاڵتوونیە و كانزاكەشی ئاڵتوونی پاڵفتەیە. چونكە شیاوترین كەس ئەو كلیلە وەربگرێ، ئەوە. بەڵێ، خوای گەورە ئەمانەت بە كەسێك دەسپێرێت كە شایستەی بێت. جا بۆیە كلیلی ئەو دڵەشی كە بە ئەمانەت بە مرۆڤ سپاردبوو، سپاردیە شیاوترین كەسی ئەو كارە، ئەویش سەرداری هەردوو جیهان، حەزرەتی محمد المصطفى‌یە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمْ).

بەڵێ، خوای گەورە (جَلَّ جَلالُهُ) وەك ڕەحمەت ناردوویەتی بۆ جیهانیان، ئەویش لەنێو ئەوپەڕی هاوسەنگیدا، بەباشترین شێوە نرخاندی. بیرمان نەچێت هاوسەنگی لە ڕەحمەتیشدا زۆر گرنگە.

## زیادەڕەوی و كەمڕەوی لە ڕەحمەتدا

وەك چۆن هەموو شتێك زیادەڕەوی و كەمڕەویی هەیە، بەكارهێنانی ڕەحمەتیش ئاوا زیادڕەوی و كەمڕەوی خۆی هەیە. هزر و ڕەفتاری هەندێك لەو دەستە و تاقمانەش كە لافی مرۆڤدۆستی لێدەدەن، دیارترین نموونەی خراپ بەكارهێنانی ڕەحمەتە. ئەوانە، بە دەمكوتینێكی ناهاوسەنگانە لە خۆشەویستی و مرۆڤدۆستی لەلایەك و، لە لایەكی تریش بەوەی كە هیچان هەست بە پەیوەندییەكی دڵسۆزانە و

له دڵەوە ناکەن بەرامبەر بە باوەڕداران و دینداران، زیندووترین نموونەی ئەم بابەتە پێك دێنن. بەڵێ، ئەگەر لەدەستیان بێت، کەسانی دیندار و موسڵمان لە خوێنی خۆیاندا دەگەوزێنن چونکە خۆشەویستی ئەوان تەنها بۆ خۆیان و ئەوانەیە کە وەك خۆیان بیردەکەنەوە. لە ڕاستیدا ئەم خۆشەویستییەش ئەو خۆشەویستییە حەسبییە بێ بەرامبەرە نییە کە ئێمە لێی تێگەیشتووین، بەڵکو خۆشەویستییەکە لەسەر بناغەی بەرژەوەندیخوازی بنیات نراوە. لە کاتێکدا ڕەحمەتەکەی پێغەمبەری خوا سەرتاپا لەنێو ئیستیقامەت و ڕاستڕەویدا ڕێی کردووە و نەك تەنها مرۆڤایەتی، بگرە سەرانسەری بوونەوەرانیشی گرتبووەوە و لە گرتنەوەشیدایە...

ئیماندارانیش لە لایەن خۆیانەوە سوودمەندی ئەو ڕەحمەتە بوون کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) نوێنەرایەتیی دەکرد. چونکە ئەو بەرامبەر بە ئیمانداران "رؤوف" و "رحیم"ە[1] واتە، مامەڵەی لە دڵەوەیە و دڵسۆزانەیە، دڵی نەرمە، هەروەها زۆر بەبەزەیی و میهرەبانە. لە پاڵ باوەڕداراندا، بێباوەڕ و مونافیقانیش پشکی خۆیان لەو ڕەحمەتە بەرکەوتووە. بگرە تەنانەت حەزرەتی جوبرەئیلیش پشکی تایبەتی خۆی هەیە لەم ڕەحمەتە.[2] جا وەرە فراوانی و بەرینی ئەم ڕەحمەتە بەوە مەزندە بکە کە گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی تەنانەت شەیتانیش بەچاوی ئومێدەوە بۆی بڕوانێت.[3]

بێگومان ڕەحمەتەکەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، لە کۆمەڵە کەس و دەستە و تاقمێکی دیاریکراودا قەتیس نەمابوو. هەروەها نەشدەچوو ڕەحمەت وەك ئامرازێك بۆ بەرژەوەندیخوازی بەکار بهێنێت وەك ئەوەی لە ئێستادا کەسانێك بەکاری دەهێنن.

---

١ بڕوانە: سورەتی التوبة، ئایەتی ١٢٨.
٢ قاضي عياض، الشفاء ١/١٧.
٣ طبراني، المجمع الكبير ١٦٨/٣.

## چەواشەکاری هیومانیزم

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بدەین بەو ڕاستییەی کە بەشێك لە بزاوتەکانی ئەمڕۆ، چەمکی مرۆڤدۆستی وەك پەردەیەك بەکاردەهێنن بۆ هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤەکان. ئاخر ئێوە بڵێن، چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان ئەو دۆستی و نزیکییەی ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن، لەگەڵ دۆستی و نزیکیی لەگەڵ مار و دووپشکدا؟! بۆیە دەبێت بە هیچ شێوەیەك ئەو خۆشەویستییەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەرجەستەی کردووە، لەگەڵ ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ خۆشەویستی تێکەڵ نەکرێت. بەڵێ، بەوێنەی تێکڕای چەمك و بوارەکانی تر، تێڕوانینی ئیسلام بۆ خۆشەویستی، هەڵگری مۆرکی تایبەت بە خۆیەتی، کە لە هەمان کاتدا دنیاش و ئاخیرەتیشی لەخۆ گرتووە و دارای هاوسەنگییە.

حەزرەتی محمد (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە ڕوانگەی پەیامەکەیەوە بە خۆشەویستییەکەوە هاتبوو کە تەواوی مرۆڤایەتی و گشت بوونەوەرانی لەئامێز گرتبوو. بەڵام ئەم شەفەقەتە بەرین و میهرە قووڵەی -وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا- جیاواز لە تێڕوانینی شەفەقەت و خۆشەویستی کەسانێك کە ئەم جۆرە مەسەلانە دەقۆزنەوە، تەنها وەك چەمکێکی ڕووت لە دووتوێی لاپەڕەکاندا نەمابووەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە کورتترین ماوەدا خرایە بواری جێبەجێ کردنەوە و بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە لە واقیعدا بەرجەستە کرا. لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا هزر و تێڕوانینێکی نییە کە بەکردە نەکرابێت. ئاخر چۆن وا نەبێت، لە کاتێکدا ئەو یەکپارچە بزاوت و کردارە.

جا لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بەوپەڕی دڵسۆزی و لەدڵ هەڵقوڵاویی، هەروەها وەك چەمکێکی گەردوونی، ڕەحمەتە بێسنوورەکەی ناخی بەسەر تەواوی بوونەوەراندا پەرش کردووە، بۆیە دەبینین لە گوڵزاری زاریەوە

هەرچی لەعل و گەوهەرێك هاتبێتە دەر، زەمینەی کرداریان خەملاندووە. بۆ نموونە، کاتێك باسی مامەڵەی میهرەبانانەی دەکرد بەرامبەر گیانداران، نموونەی پەندئامێز و بەرجەستەی لەم جۆرەی دەهێنایەوە. ئەم دوو نمونەیەی پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أَلفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بۆمان دەگێڕێتەوە، لەو شتانە نین کە بیر بچنەوە:

"خوای گەورە بەهۆی سەگێکەوە لە ئافرەتێکی بەدڕەوشت خۆشبوو و خستیە بەهەشتەوە. ئەوەبوو لەسەر بیرێك سەگێك لە تاو تینوێتی زمانی دەرهێنابوو لاسکە لاسکی بوو. لەو کاتەشدا ئەم ئافرەتە بەویادا تێدەپەڕێ، کاتێك حاڵی ئەو گیاندارە بەستەزمانە دەبینێ، خۆی پێناگیرێ و دەستبەجێ پشتێنەکەی ناوقەدی لێ دەکاتەوە و دەیبەستێت بە پێڵاوەکەیەوە. ئینجا ئاو لە بیرەکە دەهێنێتە دەرەوە و سەگەکە تێراو دەکات، ئیتر بەم شێوەیە ئەو گیاندارە لە مردن ڕزگاری دەبێت. جا ئیدی مامەڵەی ئەو ئافرەتە بەرامبەر بە سەگێك، بوو بە مایەی لێخۆشبوونی و، خوای گەورە خستیە بەهەشتەوە."[1]

لە دژەجەمسەری ئەمەدا، نموونەیەکی تر هەیە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بەم شێوەیە بۆمان دەگێڕێتەوە:

"ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە چووە دۆزەخەوە. لەبەر ئەوەی لە ماڵەوە توندی کردبوو، نە ئەوەبوو ئاو و خۆراکی بداتێ، نە ئەوەشبوو ئازادی بکات، تا ئەوەی پشیلەکە لە برسا مردار بووەوە. ئیتر ئەو ئافرەتەش بەهۆی ئەو پشیلەیەوەوە چووە دۆزەخەوە."[2]

پێغەمبەری پێشەوا بە ئەرکی گەیاندنی پەیامی ئەم ڕەحمەتە بەرفراوانەوە هاتووە. ئەو "مَنهَلُ العَذبِ المورود"ە. واتە، کانیاوێکی سازگاری شیرینە، هەرکێ

١ بخاري، الأنبياء ٥٤؛ مسلم، سلام ١٥٣-١٥٥.
٢ بخاري، مسقط ٩، مسلم، سلام ١٥١-١٥٢.

گۆزەی ئیدراکی خۆی تێوەردا، سەررێژ لە ڕەحمەت دەریدەکێشێتەوە. ئەوانەشی ئاوی ژیان بەدەستی ئەو دەنۆشن، وەك ئەوە وایە گەیشتبن بە نەمری.

خۆزگایا ئەوانەی وا چ بە جەبری، چ بە لوتفی لەسەر ئەم حەوزە کەوسەرەن، قەدر و بەهای ئەویان بزانیایە!

جا بۆ ئەوەی قسەکانمان هەروا بە پەتی نەمێنێتەوە، پێم خۆشە چەند نموونەیەکی بەرجەستەتان عەرز بکەم. بەڵام بەر لەوە، لایەنێك هەیە تا سەرنجتان بۆلای ڕانەکێشم ناچمە سەر برگەی دواتر.

## لە هەموو شتێکدا لوتکەیە

ئەو کەسانەی لە هەندێك بوار و پیشەدا دەچنە پێش، پێچەوانەی ئەو بوارانەی تیایدا چوونەتە پێش، لە کایە و بوارەکانی تردا بەهەمان ڕێژە و بە شێوەیەکی بەرچاو لەدواوەن.

بۆ نموونە، سەرکردەیەکی سوپا، یاخود سەربازێك، هەرچەندە لە بواری سەربازیشدا سەرکەوتوو و لێهاتوو بێت، کەچی جاری وا هەیە لە بوارەکانی دیکەدا لەوانەیە هێندەی شوانێك تێگەیشتوو و هەستیار و میهرەبان نەبێت. تەنانەت هەندێ جار لە ئاکامی ئاوێتەبوونی سروشتی وەها کەسێك لەگەڵ کوشتن و برینداا، لەوانەیە هەر نەزانێت ڕەحم و بەزەیی چییە. چونکە ئەوەندە کوشت و بڕی کردووە، لەڕوویەکەوە هەستەکانی کوێر بوونەتەوە و هەست بەو ئازار و ئەشکەنجە ویژدانییە ناکات کە هەر کەسێکی تر لە کوشتنەوە هەستی پێدەکات.

لەوانەیە سیاسەتمەدارێك لە بوارەکەی خۆیدا زۆر سەرکەوتوو بێت.. بەڵام دەکرێ هەر بەو ڕێژەیەش سازش لەسەر ڕاستی و دروستی بکات و مافی کەسانی

تر پێشێل بکات. بە دەربڕینێکی تر، بە ڕێژەی چوونە پێشەوەی لە سیاسەتدا، هەموو کات ئەگەری ئەوەی هەیە لە سەرڕاستی و جوامێری بکشێتە دواوە. ئەمە هەروەك ئەوە وایە لە لایەکەوە بەرەو لوتکە هەڵبکشێیت، بەڵام لە لایەکی ترەوە بەرەو کەندەڵان تلۆر ببیتەوە.

لەولاتریشەوە یەکێکی تر دەبینی خۆی داوەتە دەم تەوژمی ئەزمونگەرایی و نیازیەتی هەرچی شت هەیە بە ئەزموون و تاقیکاری بیسەلمێنێت. کەچی هەر ئەم مرۆڤە لە ژیانی قەلبی و ڕۆحی خۆیدا سفریشی تێ نەپەڕاندووە. بگرە جاری وا هەیە، دەبینی کەسانێك لە ڕووی ئەقڵ و مەنتیقەوە وەك لوتکەی ئەڤەرێست هەڵکشاون بە ئاسماندا، کەچی کاتێك لێیان ورد دەبیتەوە، دەبینی لە ڕووی ژیانی مەعنەوییەوە هەروەك دەریای مردوو چوون بە قووڵدا.

چەندین کەسی وا لەوانەی هەموو شتێك دەگەڕێننەوە بۆ ماددە و ژیرییان دابەزیوەتە چاویان، لە بەرامبەر مەنتیقی وەحیدا لە گەوج گەوجترن و چاویان مەعنەویات نابینێت.

وەك لەم کورتە ڕوونکردنەوەیەشەوە بۆمان دەرکەوت، هەندێ جار دەبینی هەندێ کەس لە هەندێ بواری دیاریکراودا دەستی باڵایان هەیە و سەرکەوتوون، کەچی هەمان ئەو کەسانە، لە کۆمەڵە بوارێکی دیکەدا کە زۆر لەوانەی پێشوو گرنگتر و چارەنووسسازتریشن، هیچ شارەزاییەکیان نییە و سەرکەوتنیان تۆمار نەکردووە. واتە، ئەو سیفەتە دژبەیەکانەی لە مرۆڤدا کۆ بوونەتەوە، وەك بڵێی لە دژی یەکتر بەکارن. کاتێك سیفەتێکیان بەرەو پێش دەچێت و گەشە دەسێنێت، ئەوی تریان تووشی سستی دەبێت و بەناکامی دەمێنێتەوە.

لە کاتێکدا ئەم حاڵەتە لە پێغەمبەری خوادا هەرگیز بەم شێوەیە نییە. ئەو، لە پاڵ ئەوەدا کە جەنگاوەرێکی بەتوانایە، لە هەمان کاتیشدا دەریایەکی بێ بنە

له میهره‌بانی.. ڕاسته سیاسه‌تمه‌داره.. به‌ڵام هێنده‌ی ئه‌وه‌ش خاوه‌ن جوامێری و مه‌ردایه‌تی‌یه و گه‌رموگوڕیی لیَ ده‌بارێت. هاوده‌م له‌گه‌ڵ گرنگیدانی به ئه‌زموون و تاقیکاری، له لوتکه‌ی ژیانی قه‌لبی و ڕۆحیشدا هاتوچۆ ده‌کات.

دیمه‌نه‌کانی جه‌نگی ئوحود کاریگه‌رترین نموونه‌ی ئه‌م ڕاستییه‌ن. ئێوه بیهێننه پێشچاوی خۆتان، حه‌زره‌تی حه‌مزه که مام و برای شیریی پێغه‌مبه‌ری خوا بوو و هێنده‌ی گیانی خۆی خۆشی ده‌ویست، شه‌هید کرا.. سه‌رباری شه‌هیدییش، جه‌سته‌ی له‌ت و په‌ت کرا.[1] هه‌ر له‌وێدا عه‌بدوڵڵای کوڕی جه‌حشی کوڕه پووریشی هه‌نجن هه‌نجن کرا.[2] ته‌نانه‌ت سه‌ری موباره‌کی خۆیشی بریندار بوو و ددانه‌کانی شکان و جه‌سته‌ی خه‌ڵتانی خوێن بوو.[3] له ساته‌وه‌ختێکی ئاوادا که دوژمنان به هه‌موو ڕق و تووڕه‌ییه‌کیانه‌وه گه‌له‌کۆمه‌یان لێکردبوو و به هه‌موو تواناکیانه‌وه هه‌وڵیان ده‌دا له‌ناوی به‌رن، ئه‌م مرۆڤه به‌رز و بڵنده، له‌ترسی ئه‌وه‌ی که ئه‌گه‌ر خوێنی بڕژێت خوای گه‌وره خوێنڕێژانی له‌ناو ده‌بات، ده‌له‌رزی و ده‌سته‌کانی به‌رز کردبووه‌وه و ده‌یوت:

اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ "خودایه! له قه‌ومه‌که‌م خۆشبه، چونکه ئه‌وان نازانن (من کێم)."[4]

ئه‌وه چ تێڕوانینێکی سه‌رسامکه‌ره بۆ شه‌فه‌قه‌ت! ئه‌وه‌تا دوژمنانی هێرشیان هێناوه‌ته سه‌ری و سوورن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی بیکوژن، که‌چی ئه‌م نه‌ك هه‌ر نه‌فره‌ت و دوعایان لیَ ناکات، بگره به‌کوڵ بۆیان ده‌پاڕێته‌وه و دوعایان بۆ ده‌کات!

هه‌تاوه‌کو فه‌تحی مه‌ککه، خراپه‌یه‌ك نه‌مابوو دوژمنانی به‌رامبه‌ری نه‌یکه‌ن.

---

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٤٤-٤٥.
٢ إبن هشام، السيرة النبوية ٤/٤٧.
٣ بخاري، مغازي ٢٤؛ مسلم، جهاد ١٠١-١٠٤.
٤ بخاري، الأنبياء ٥٤؛ مسلم، جهاد ١٠٤-١٠٥؛ قرطبي،الجامع لأحكام القرءان ٤/١٩٩-٢٠٠.

ئاخر تۆ بیریکەرەوە؛ گەماڕۆت بەسەردا دەسەپێنن و لە ماڵ و موڵکت دەکەن و لەناو جەرگەی بیابانێکدا بەجێت دەهێڵن، ئینجا دوایی پەیماننامەیەکی پڕ تاڵاو و ناسۆر بە دیواری کەعبەدا هەڵدەواسن و تیایدا دەڵێن:

”کڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازی لەگەڵ ئەم دوورخراوانەدا قەدەغەیە...“ ئینجا بۆ ماوەی سێ ساڵ لەو هەلومەرجە دژوارەی بیاباندا ناچاری مانەوەت دەکەن.. هەر ئەوەندە نا، بەڵکو کار دەگاتە ئەوەی کەسە نزیکەکانیشت دەستەوسان بن لە هاوکاری کردنت، ئیدی تۆش ناچار دەبیت بە گژوگیا زیندەگیت بگوزەرێنیت. حاڵ دەگاتە ئەوەی منداڵ و بەتەمەنەکان لە برساندا بمرن.. وێڕای هەموو ئەمانەش، ڕێت لە شتێك ناکەوێت ناوی مرۆڤایەتی و جوامێری بێت.. پاشان وەك ئەوەی هەموو ئەمانە بەس نەبووێت، لە ماڵ و نیشتیمانەکەی خۆشت دەردەکرێیت و پەڕاگەندەی شوێنانی دی دەکرێیت، نا.. نا، گومان نەبەیت لەوێش بهێڵن وچانێك بدەیت و هەناسەیەك هەڵمژیت، بەڵکو لەوێش بەئاسوودەیی وازت لێناهێنن و هەر ڕۆژەو بە فێڵ و تەڵەکەیەکی جیاوازەوە بەرۆکت دەگرن، پاشان لە بەدر و ئوحود و خەندەقدا چەندین جار لەگەڵیان دەستەویەخە دەجەنگیت و بەردەوام هەراسان دەکرێیت. تەنانەت لە سروشتیترین مافی وەك زیارەت کردنی کەعبەی پیرۆزیش بێبەش دەکرێیت.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش، ڕێکەوتننامەیەك قبووڵ دەکەیت کە سەختترین مەرجی لەخۆ گرتووە و بەڕواڵەت لە دژتە. ئەوجا بێ ئەوەی حەسرەتی دووریی برەوێنیتەوە، بەناچاری دەگەڕێیتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووی. بەدواشیدا پەروەردگار دەرگای لوتف و کەرەمی خۆیت لێ دەکاتەوە و بە سەرکردایەتی سوپایەکی مەزن فەتحی مەککە دەکەیت و دەسەڵاتی ئەوێ دەگریتە دەست...

جا ئێستا دەپرسم: دوای ئەم هەموو شتە، داخۆ مامەڵەت چۆن دەبوو لەگەڵیان؟

ئایا دەتتوانی بڵێیت: إِذْهَبُوا فَأَنْتُم الطُّلَقَاء، لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ اليَوم "بڕۆن وا ئێوە ئازادن، ئەمڕۆ سەرزەنشت و لۆمەتان لەسەر نییە."[1]

من بەش بە حاڵی خۆم، ئەگەر لە پێغەمبەری خواوە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) ئەم وانەیە فێرنەبوومایە، هەرگیز نەمدەتوانی بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم. پێشبینی دەکەم ئێوەش هەمان بۆچوونتان هەبێت. بەڵام ئەو، تەنانەت ئەو دەمەش کە قەڵغانەکەی بەستبوو و خوودەکەی لەسەر کردبوو و تیرەکانیشی لەنێو تیردانەکەی نابوو و غاری بە ئەسپەکەی دەدا و دەچووە ناو کەعبەوە؛ هەر پاڵەوانی سۆز و بەزەیی بوو. ئەوەبوو ڕووی کردە خەڵکی مەککە و لێی پرسین: "وا دەزانن ئێستا چیتان بەسەر دێنم؟" هەموویان بەجارێك وەڵامیان دایەوە: "تۆ کەریمی کوڕی کەریمیت. جگە لە کەرەم، چاوەڕێی هیچ شتێکی ترت لێ ناکرێت."

ئیتر ئەویش هاوشێوەی هەڵوێستەکەی حەزرەتی یوسف لەبەرامبەر براکانیدا، فەرمووی:

﴿ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ (یوسف : ٩٢) "ئەمڕۆ سەرزەنشت و لۆمەتان لەسەر نییە. خوا لێتان خۆشبێت، ئەو زاتە لە هەموو میهرەبانان میهرەبانترە."[2]

لە ژیانیدا هەرگیز کەمتەرخەمی نەکردووە لە تەگبیرکاری گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویستدا. هیچ کەسێکیش نییە هێندەی ئەو بەجوانی تەگبیر و تەوەککولی پێکەوە کۆ کردبێتەوە.

کاتێك ویستی بەرەو بەدر بچێت، هاوەڵانی تاقی کردەوە. ئەو هاوەڵانەی کە هەریەکەیان بۆ خۆی بارستەیەك بوو لە وزە و وورە و هێزێکی مەعنەوی وایان هەبوو

---

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٧٤/٥؛ بيهقي، السنن الكبرى ١١٨/٩.
٢ بيهقي، السنن الكبرى ١١٨/٩.

که بەتەنها دەرەقەتی سوپایەك دەهاتن. کاتێك حەزرەتی سەعدی کوڕی موعاذ دەیوت:

"یا رسول الله، تۆ تاوەکو "برك الغماد" ئەسپەکەت تاوبدە، ئەوسا دەبینی یەك کەسیش چییە لە ئێمە دوا ناکەوێت." ئاوا نموونەی ئەم ورە و هێزە مەعنەویەی دەدا بەدەستەوە. ئەی ئەوە بۆ نالێی کە بەردەوام دەیوت: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە ڕۆح و گیانمان، کامەیان دەفەرموویت لە خزمەتتدایە. ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەش ماڵ و سەروەتمان، چەندت دەوێت بیبە و بە کێی دەدەیت بیدە."[1]

سەربازەکان ئامادە بوون. دەتوت هەر یەکێکیان سەعدی کوڕی موعازێکە بۆ خۆی. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللّٰهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) کەمتەرخەمی نانوێنێت لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی پێویست و، بەبێ کەموکوڕی سەرجەم ئەو ئامادەکارییە پێشوەختانە دەهێنێتەجێ کە بۆ جەنگ پێویستن. دوابەدوای ئەم دوعا کردارییەش، دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و بە دڵێکی بەکوڵەوە لە خوا دەپاڕێتەوە و دەست دەکا بە دوعا کردن. هەم بەجۆرێك ڕۆچووبووە دوعاوە، عەباکەی سەرشانی کەوتە خوارەوە، کەچی ئەو هەر هەستیشی پێ نەکرد. حەزرەتی ئەبوبەکریش (رضيَاللّٰهُعَنْهُ) کە چاودێری ئەم دیمەنەی دەکرد، خۆی پێ نەگیرا و چووە لایەوە و عەباکەی دایەوە بەسەر شانیدا و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، تکایە ئیتر بەسە. دڵنیا بە خوای گەورە هەرگیز غەمبارت ناکات، ئەم هەموو دوعا و پاڕانەوەیە بەسە."[2]

بەڵێ، لە لایەکەوە ئەم جۆرە لە تەگبیر و ڕەچاوکردنی هۆکارەکان، لە لایەکی تریشەوە، تا ئەو ڕادەیە تەوەککول و پشت بەستن بە پەروەردگار، لە ڕاستیدا ئەمە تایبەتمەندییەکە وێنەی نییە و بە تەنها بۆ ئەو مرۆڤە لوتکەیە مویەسەر بووە.

---

١ ابن كثير، البداية والنهاية ٣/٢٦٤.

٢ بخاري، مغازي ٤؛ مسلم، جهاد ٥٨؛ ترمذي، تفسير سورة (٨) ٣.

## ڕەحمەتی گەردوونی

وەك لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان پێدا، پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەو مرۆڤە ڕەحمەت پەخشێنە بوو کە هەموان، بە باوەڕدار و بێباوەڕ و مونافیقەوە بەهرەمەندی میهر و سۆزە بێ سنوورەکەی بوون. ئەوەتا مرۆڤی باوەڕدار سوود لە ڕەحمەتەکەی وەردەگرێت چونکە ئەو خۆی فەرموویەتی: "من لە خودی باوەڕداران نزیکترم بۆ خۆیان."[1] ئەگەرچی موفەسسیران ئایەتی: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ (الأحزاب : ٦) وەك بەڵگە دەهێننەوە و دەڵێن: "پێغەمبەری خوا بۆ باوەڕداران لە گیانی خۆیان خۆشەویسترە." بەڵام لەڕاستییدا هەردوو واتاکە لەیەکەوە نزیکن. ئەوەتا ئێمە ئەومان لە خۆمان خۆشتر دەوێت. پێغەمبەری خواش (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە هەمان ئەندازە ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە بەو جۆرە خۆشیان دەوێت. ئاخر چونکە ئەو گەورەترین نموونەی جوامێری و مەردایەتییە.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا خۆشەویستییەکی مەنتیقیانە و داوەرییانەیە. ئەگەرچی ئەم خۆشەویستییە دیوێکی عاطیفیشی هەبێت، کەچی زۆرتر خۆی لە مەودا مەعریفی و قووڵییە مەنتیقییەکەیدا دەبینێتەوە. خۆ ئەگەر بێت و ئیشی لەسەر بکرێت و پەرەی پێ بدرێت، ئەوا بەجۆرێك لە ناخی مرۆڤدا ڕەگ دادەکوتێت، بە وێنەی عەوداڵیی مەجنون بۆ لەیلا، ئاوەها ئەویش لە هەموو جێیەکدا عەوداڵی پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەبێت و دەکەوێتە سۆراغی. بەڵێ، بەردەوام عەوداڵی دەبێ و لەگەڵ هەر ناوهێنانێکیشیدا تەزوو بە لەشیدا دێ و بەبێ ئەو ژیانی لێ دەبێتە ماتەمینگا. بۆیە دەبینی هەمیشە وەك نەی لە چڕینی بەستەی خەمبزوێنی جودایی ئازیزدایە.

بەڵێ هەر وایە، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە نەفسی خۆمان نزیکترە

١ بخاري، كفالة ٥، إستقراض ١١؛ مسلم، جمعة ٤٣، فرائض ١٤-١٦.

بۆمان. جا چۆن وا نەبێت، لە کاتێکدا زۆربەی جار ئێمە جگە لە خراپە و بەدفەڕی هیچی ترمان لە نەفسمان نەدیوە، کەچی هەمیشە لوتف و چاکە و میهرەبانی و سۆز و جوامێریمان لەو دیوە. ئەو، نوێنەری ڕەحمەتی پەروەردگارە. کەوابێ بە دڵنیاییەوە لە خۆمان بۆ خۆمان نزیکتر و لەپێشترە.

ئەوەتا دەفەرموێت: "من لە باوەڕدارانِ بۆ خۆیان نزیکترم." ئینجا دەفەرموێت: گەر دەتانەوێت ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡ ﴾ (الأحزاب : ٦) بەدواشیدا بەردەوام دەبێت لەسەر فەرمایشتەکانی: مَنْ تُوَفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ "هەرکەسێك مرد و قەرزی لەسەر مابوو، ئەوا من بۆی دەدەمەوە. هەرکەسیش ماڵ و سامانێکی لەدوا بەجێما، ئەوا بۆ میراتگرەکانیەتی."[1]

ئەم فەرموودەیەش بەسەرهاتێکی خۆی هەیە:

ڕۆژێکیان تەرمێکیان هێنا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەن. پێغەمبەری خوا پرسی: "ئایا ئەم مردووە قەرزی لەسەرە؟" ئەوانەی لەوێ بوون وتیان: "بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، زۆر قەرزدارە." کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) ئەم وەڵامەی بیست، فەرمووی: "مادام وایە ئێوە نوێژ لەسەر براکەتان بکەن، من نوێژ لەسەر کەسێك ناکەم قەرزار بێت." بەڵام ئەم حاڵەتە لەسەر دڵی خۆیشی زۆر سەخت و گران بوو. بەڵام دواتر کە هەندێ دەرامەتی کەوتە دەست، لەبارەی ئەو باوەڕدارانەوە کە دەمردن، دەیفەرموو: "سەرپەرشتیاری فلانە کەس منم، هەرکەسێ قەرزێکی هەیە وەریگرێتەوە، با بێت بۆ لای من."[2]

لە ڕاستیدا ئەم نزیکی و لەپێشترییەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆ

١ بخاري، إستقراض ١١؛ مسلم، فرائض ١٤-١٦.
٢ بخاري، كفالة ٥، إستقراض ١١؛ مسلم، جمعة ٤٣، فرائض ١٤-١٦.

ئیمانداران لە خۆیان، لە دنیا و قیامەتدا، ڕەحمەتە. ئەم ڕووەی ڕەحمەتەکەشی هەتا هەتایە هەر بەردەوام دەبێت.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بۆ دووڕووانیش هەر ڕەحمەتە. ئەوەتا لە سایەی ئەو ڕەحمەتە فراوانەدا لە دنیادا سزا نەدران. دەهاتنە ناو مزگەوت و بەناو موسڵماناندا دەهاتن و دەچوون و لە هەموو ئەو مافانە سوودمەند دەبوون کە موسڵمانان سوودیان لێ دەبینی. بەڵام ئەو سەروەرە هیچ کات پەردەی لەڕوو هەڵنەماڵین. ئاگاداری دیوی ناوەوەی زۆربەیان بوو، تەنانەت ناوەکانیشیانی بە حەزرەتی حوزافە (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وتبوو.[1] هەر وەك لە ڕیوایەتێکدا هاتووە، لەبەر ئەم هۆیە حەزرەتی عومەر چاودێری حەزرەتی حوزافەی دەکرد، دیتبای نوێژ لەسەر جەنازەیەك ناکات، ئەویش نوێژی لەسەر نەدەکرد.[2]

لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام نەهات ئابڕوویان بەرێت. بەڵکو بەهۆی مانەوەی بەردەوامیان لەنێو موسوڵماناندا، هەر هیچ نەبێ کوفرە ڕەهاکەیان گۆڕا بۆ گومان و دوودڵی. بەم جۆرەش، چێژەکانی دنیایان هەموو بەجارێ لێ تاڵ نەبوو. ئاخر زۆر زەحمەتە کەسێك باوەڕی وابێت بەرەو نەمان دەچێت و لەگەڵ ئەوەشدا لەزەت لە دنیا وەرگرێت. خۆ ئەگەر کوفرەکەیان ئەوەندە گومان و دوودڵیی تێکەڵ بووبێت کە بڵێن: "لەوانەیە ئاخیرەت هەبێت." ئەوا ڕەنگە ئەوکات ژیان بەتەواوەتی بۆیان نەبێت بە تاڵاو. جا ئیدی لەم ڕووەوە، پێغەمبەی خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بە جۆرێك لە جۆرەکان بووەتە ڕەحمەت بۆ دووڕوانیش.

کافریش پشکی خۆی هەبووە لە ڕەحمەتی ئەو "رَحْمَةً لِلعالَمِيْنَ"دا. چونکە دەزانین خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) گەل و هۆزەکانی پێشووی بەهۆی بێ باوەڕی و سەرکەشییانەوە هەموو بەجارێك لەناوبردووە. کەچی لەپاش ناردنی پێشەوای

---

1 إبن الأثير، أسود الغابة ١/٢٦٨.
2 إبن الأثير، أسود الغابة ١/٢٦٨.

مرۆڤایەتییەوە، لەناوبردنی بەکۆمەڵی هەڵگرت، بەم جۆرەش مرۆڤەکان لەم چەشنە سزایە ڕزگاریان بوو. ئەمەش بۆ خۆی ڕەحمەتێکی گەورەیە بۆ بێ باوەڕان لە دنیادا.

لەم بارەوە خوای گەورە ڕووی گوفتاری دەکاتە حبیب الله و دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ (الأنفال : ٣٣) ”بێگومان هەتا تۆ لەناویاندا بیت، خوای گەورە سزایان نادات، هەتا ئەوانیش داوای لێخۆشبوون بکەن، خوای گەورە سزادەریان نییە.“

بەڵێ، لەبەر حورمەتی پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ)، خوای گەورە لەناوبردنی بەکۆمەڵی هەڵگرتووە. جا وەرە بڕوانە قەدر و قیمەتی ئەو پێشەوا نازدارە لەلای پەروەردگاری، ئەوەی لە کاتێکدا حەزرەتی مەسیح ڕوو دەکاتە پەروەردگاری و دەفەرموێت: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ﴾ (المائدة : ١١٨) ”جا ئەگەر سزا و ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسەر لادان و تاوانیان)، ئەوا بەڕاستی ئەوانە بەندەی خۆتن.“ دەبینی خوای گەورە بە دوایین پێغەمبەرەکەی خۆی دەفەرموێت : ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾ (الأنفال : ٣٣) ”تا تۆ لە ناویاندا بیت، خوای گەورە سزا و ئەشکەنجەیان نادات.“

بە واتایەکی تر، هەتاوەکو تۆ لە دەروونیاندا بژیت و بە زیندوویی ڕاتبگرن، خوای گەورە سزایان نادات. تاوەکو لەسەر زەویدا ناوت بهێنرێت و یادی شیرینت لەسەر زوبانان بێت.. واتە، تا ئەو کاتەی مرۆڤەکان گیانفیدای ڕێبازەکەت بن، خوای گەورە لەناویان نابات.

بەشێکی دیکەی بەهرەمەند بوونی کافران لە ڕەحمەتەکەی رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بریتیە لەو لایەنەی کە بەم فەرموودەیە گوزارشتی لێ کردووە: إِنِّي لَمْ

أُبْعَثْ لَعَّاناً وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً "من وەك ڕەحمەت نێردراوم، نەوەك نەفرەتكار."[1]

واتە، لە لایەن پەروەردگارەوە وەك ڕەحمەت نێردراوم بۆ هەموان. بۆ ئەوە نەنێررام دوعا لە خەڵكی بكەم و نەفرەتیان بۆ بنێرم سا بەڵكو بەڵا و موسیبەتیان بەسەردا ببارێت. هەر بۆیە دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) بەردەوام بەتەنگ هیدایەتی تەنانەت سەرسەختترین دوژمنەكانی ئیسلامیشەوە بووە و لەو پێناوەدا چی لە دەست هاتبێت ئەنجامی داوە.

تەنانەت جوبرەئیلیش بەشی خۆی سوودی لەو نوورە وەرگرتووە كە پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِأَفۡضَلُصَلَاةٍوَسَلَامٍ) هێناویەتی. ڕۆژێكیان پێغەمبەری پێشەوامان ئاماژەی بۆ قورئان كرد و لە حەزرەتی جوبرەئیلی پرسی: هَلْ أَصَابَكَ مِن هَذِهِ الرَّحمَةَ شَيء "ئایا هیچ شتێكت لەم ڕەحمەتە بەر كەوتووە؟" حەزرەتی جوبرەئیلیش وەڵامی دایەوە: "بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، چونكە منیش لە عاقیبەتی خۆم دڵنیا نەبووم. بەڵام كاتێك ئایەتی ﴿ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴾ "لە ئاسمانەكاندا گوێڕایەڵی دەكرێت، وەحییەكان ئەمانەتی ئەو دەكرێن." دابەزی، ئیتر منیش دڵنیا بوومەوە لە عاقیبەتم."[2]

لە فەرموودەیەكی دیكەشدا پێغەمبەری ڕەحمەت دەفەرموێت: أَنَا مُحَمَّدٌ وَأَحْمَدٌ وَالْمُقَفِّي وَالْحَاشِرُ وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ وَنَبِيُّ الرَّحْمَةِ "من موحەممەد و ئەحمەد و موقەففا (واتە كۆتا پێغەمبەر) و حاشیرم (لەدوای من حەشر بەرپا دەبێت، هیچ پێغەمبەرێك ناكەوێتە نێوانمانەوە. خوای گەورە مرۆڤەكان لەبەردەم مندا حەشر دەكات.) هەروەها من پێغەمبەری تەوبە و ڕەحمەتم."[3]

---

١ مسلم، بر ٨٧.
٢ قاضي عياض، الشفاء ١/١٧.
٣ أحمد بن حنبل، المسند ٣٩٥/٤؛ مسلم، فضائل ١٢٦.

دەرگای تەوبە تا ڕۆژی قیامەت لەسەر پشتە.[1] چونکە حەزرەتی موحەممەد (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێغەمبەری تەوبەیە و پێغەمبەرایەتییەکەشی هەتاوەکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت.

ئەگەر منداڵێکی ببینیایە دەگری، ئەمیش دادەنیشت و لەگەڵیدا دەگریا. تاسە و ناسۆری دایکی جەرگسووتاوی لە ویژدانیدا هەست پێ دەکرد. ئەمەش فەرموودەیەك لە حەزرەتی ئەنەسەوە (رضيَ اللهُ عَنْهُ) و، دیمەنێك لە سۆز و میهرەبانییە بێ وێنەکەی کە بووەتە ویردی سەر زوبان:

إِنِّي لَأَدْخُلُ الصَّلَاةَ أُرِيدُ إِطَالَتَهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأُخَفِّفُ مِنْ شِدَّةِ وَجْدِ أُمِّهِ بِهِ

"جاری وا هەیە نوێژ دادەبەستم و دەمەوێت درێژی بکەمەوە. پاشان گوێم لە گریەی منداڵێك دەبێت، جا لەبەر ئەوەی دەزانم دایکی چەندە پەرۆشییەتی، بۆیە درێژەی پێ نادەم و کۆتایی پێ دێنم."[2]

نوێژی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تا بڵێی درێژ بوو. بەتایبەت نوێژە سوننەتەکانی، کە بەچەشنێك بوو، تەنانەت هاوەڵانیش بەرگەیان نەدەگرت.[3] جا ئیتر بە نییەتی ئەنجامدانی نوێژێکی ئاواوە دەستی دەکرد بە نوێژ، بەڵام هەر کە لە نوێژەکەیدا گوێی لە گریانی منداڵێك دەبوو، یەکسەر نوێژەکەی خێرا دەکرد. چونکە لەو سەردەمەدا بە مەبەستی نوێژکردن لە دوای پێغەمبەری خواوە ئافرەتانیش بەشداری نوێژی جەماعەتیان دەکرد. بۆیە پێغەمبەر بەو هەستەوە کە نەوەك دایکی ئەو منداڵە لە مزگەوت بێ، نوێژەکەی خێرا دەکرد و بەم شێوەیە دایکەکەی ئاسوودە دەکرد.

١ بڕوانە: ترمذي، دعوات ٩٨؛ أبو داود، جهاد ٢.
٢ بخاري، الاذان ٦٥؛ مسلم، صلاة ١٩٢.
٣ بڕوانە: بخاري، تهجد ٩؛ مسلم، مسافرين ٢٠٣-٢٠٤.

جا ئیتر لە هەموو بابەتێکدا نموونەیەکی شەفەقەتی لەم جۆرە بوو. ئەوەتا گریانی منداڵێك بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو سەرورەرە خەمبار بکات و بیخاتە گریان. بەڵام گرنگ ئەوەیە لەگەڵ ئەو هەموو سۆز و میهرەبانییە فراوانەشیدا، کەسێکی هاوسەنگ بوو. بۆ نموونە، ئەم شەفەقەتە سەرسوڕهێنەرەی هیچ کات نەبووەتە ڕێگر لەبەردەم جێبەجێکردنی سنوورەکانی شەرعدا و، جۆری سزاکە هەرچۆنێك بووبێت، ئەو هەر جێبەجێی کردووە.

یەکێك لە کوڕەکانی هۆزی موقەررین لە خزمەتکارە ئافرەتەکەیانی دابوو. خزمەتکارەش بەگریانەوە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ). ئەویش خاوەنەکەی بانگکرد و پێی وت: "بەناحەق لێتان داوە، کەوابوو ئازادی بکەن." لە بەرامبەر ئەمەدا هاوەڵان وتیان: "ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام ئەو خانەوادەیە جگە لەم ئافرەتە خزمەتکاری تریان نییە." سەرورەریشمان لە وەڵامدا فەرمووی: "دەی مادام وایە، با بەکرێ ئیشی پێ بکەن. هەر کاتیش پێویستیان پێی نەما، با ئازادی بکەن."[1] بەڵێ، ئەگەر سزای ئەو زڵلە ناحەقە بۆ ڕۆژی دوایی بمایاتەوە، ئەوا زڵلەکانی ئەوێ زۆر سەختتر دەبوون. بۆیە دەبێت حەقی زڵلە ئازادی بێت، تاوەکو ببێتە فیدیەی سزای دۆزەخ لەدنیادا.

## منداڵان

بەتایبەت ئەو سۆز و بەزەییەی بۆ منداڵەکانی خۆی هەیبوو، شتێکی تەواو جیاواز بوو. زۆر جار دەچووە لای ئەو خێزانەی کە شیریان دەدا بە ئیبراهیمی کوڕی، لەوێ کوڕەکەی دەگرتە باوەش و بۆ ماوەیەکی زۆر دەینووساند بە سنگیەوە و دەستی بەسەریدا دەهێنا.[2]

---

١ مسلم، أيمان ٣١-٣٣؛ أبو داود، أدب ١٢٣.
٢ بخاري، أدب ١٨؛ مسلم، فضائل ٦٢-٦٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ١١٢/٣.

ئەقرەعی کوڕی حابیس کاتێك بینی پێغەمبەری خوا حەزرەتی حەسەنی لەباوەش گرتووە و خۆشەویستی بەڕوودا دەنوێنێت، باسی خۆی کرد و وتی: ''دە منداڵم هەیە و تا ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە.'' پێغەمبەری خواش تەماشایەکی کرد و فەرمووی: مَنْ لَا يَرْحَم، لَا يُرْحَم ''ئەوەی بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی بەڕوودا نانوێنرێ.''[1]

لە ڕیوایەتێکی تردا وەڵامەکە بەم شێوەیەیە: ''دەی من چیت لێ بکەم کە خوا هەستی بەزەیی لە دڵتدا دەرهێناوە.''[2]

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: اِرْحَمُوا مَنْ فِي الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ ''ئێوە بەزەییتان بەوانەی سەرزەویدا بێتەوە، تاوەکو ئەوانەی ئاسمانیش بەزەییان پێتاندا بێتەوە.''[3]

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەروەك چۆن لەگەڵ خزمەکانیدا بەبەزەیی بوو، بەرامبەر دۆستە دوور و نزیکەکانیشی هەروا دڵی پڕبوو لە بەزەیی و خۆشەویستی.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) بۆمان دەگێڕێتەوە:

سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش کەوتبوو. پێغەمبەری خواش بە یاوەری دەستەیەك لە هاوەڵان چوو بۆ سەردانی. حاڵی خەمناکی سەعد بەجۆرێك هەستی پێغەمبەری خوای بزواند، خۆی پێنەگیرا و هەر لەوێدا دەستی کرد بە گریان. گریەی بەکوڵی سەروەر هاوەڵانیشی هێنایە گریان. جا بۆ ئەوەی ئەم گریانە لێکدانەوەیەکی جیاوازی بۆ نەکرێت، فەرمووی: إِنَّ اللهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ وَلَا بِحُزْنِ الْقَلْبِ وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا ''هەرگیز خوای گەورە لەسەر فرمێسکی چاو و پەژارەی دڵ (کەس) سزا

---

١ بخاري، الأدب ١٨؛ مسلم، فضائل ٦٥.
٢ بخاري، الأدب ١٨؛ مسلم، فضائل ٦٤.
٣ ترمذي، البر ١٦؛ أبو داود، الأدب ٥٨.

نادات. بەڵکو لەسەر ئا ئەمە سزا دەدات.“ لەو کاتەشدا ئاماژەی بۆ زمانی کرد.[1]

بەڵێ، خودا بەهۆی فرمێسکی چاوەوە سزای کەس نادات، بگرە بە پێچەوانەوە، فرمێسکی وا هەیە دەبێتە هۆی هەڵگرتنی سزا. پێغەمبەری خوا (صَلَّیَ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکی تریدا دەفەرمووێت: عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللهِ ”دوو چاو هەن ئاگری دۆزەخیان بەرناکەوێ. چاوی (مرۆڤێك) لە ترسی خوا بگری، هەروەها چاوێك لە ڕێی خوادا شەوگاری بە ئێشکگرتن بەسەر ببات.“[2]

ئەم دوو چاوە یەکێکیان هی "رُهْبان" و ئەوی تریشیان هی "فُرْسان"ە. چاو مرۆڤانێك، بە شەو هەروەك ڕاهیب، چاکی پەرستشی لێدەکەن بەلادا و ئەشکی گەش هەڵدەڕژن. بە ڕۆژیش دەبنە شێری نەڕ و لەگەڵ کوفردا دەستەویەخە دەجەنگن. بە دەربڕینێکی تر، واتە چاوی ئیمانداری ڕاستەقینە. جا خۆ کاتێ باسی هاوەڵانیش دەکرێت، هەر بەم جۆرە باس دەکرێن: شەوان بەوێنەی ڕاهیب سەرگەرمی پەرستش بوون، بە ڕۆژیش دەبوونە شێر و دەنگی دلێرییان دنیای دەهێنایە لەرزە.[3]

ئەو دەمەی عوسمانی کوڕی مەظعون کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّیَ اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) بە هەڵەداوان بەرەو لای ئەویش چوو. حەزرەتی عوسمان ئەو هاوەڵە پایەبەرزە بوو کە پێغەمبەری خوا کردبووی بە برای خۆی. لەسەر تەرمەکەی ئەوەندە گریا و ئەوەندە ئەسرینی هەڵڕشت، دەتوت تەرمەکە بە فرمێسکی چاوی پێغەمبەر شۆراوە.[4] ئا لەو کاتەدا یەکێك کە مەبەستی عوسمانی کوڕی مەظعون

١ بخاري، جنائز ٤٥؛ مسلم، جنائز ١٢.
٢ ترمذي، فضائل الجهاد ١٢.
٣ طبري، جامع البيان ٢٦/١٥؛ طبراني، المجمع الكبير ١٠،٨٩؛ ديلمي، مسند ٢/٤٠٠.
٤ ذهبي، سير أعلام النبلاء ٤٨١/٥.

بوو، قسەیەکی وای بە دەمدا هات: "بۆ خۆی بوو بە باڵندە و بەرەو بەهەشت دای لە شەقەی باڵ." پێغەمبەری خوا بە بیستنی ئەمە یەکسەر نێو چاوانی گرژ کرد و فەرمووی: "لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خوام، کەچی هێشتا نازانم چۆن مامەڵەم لەگەڵدا دەکرێت. باشە تۆ لە کوێوە زانیت ئەو چووەتە بەهەشتەوە!"[1]

بەڵێ، ئەو مرۆڤی هاوسەنگی بوو. بەزەیی و چاو بەفرمێسکییەکەی هیچ کات نەدەبووە ڕێگر لە ڕاستکردنەوەی ئەو چەوتی و هەڵانەی دەیبینین. تەنانەت لەو ساتەوەختەشدا کە بە فرمێسکە کەوسەرییەکانی یەکێك لەو ئازیزانەی دڵی دەشوشت کە نابووی بە سنگیەوە و بە براکەم ناوی بردبوو و بە هەنسکەکانی دەپێچا، دەستبەرداری ئەوە نەبوو لە بەرامبەر وتەیەك کە زیادەڕۆیی تێدا بوو و بە نەشیاوی دەزانی، هەڵوێستی خۆی نیشان بدات و خاوەن وتەکە ئاگادار بکاتەوە. وەفا شتێکە و حەقیش شتێکی تر، ئەوەتا هەموو هەفتەیەك سەردانی شەهیدانی ئوحودی دەکرد، بەڵام پێی نەدەوتن: "داتان لە شەقەی باڵ و چوون بۆ بەهەشت" هەرچەندە ئێمە بشڵێین: "جا گەر ئەوان نەچنە بەهەشتەوە، ئەی ئیتر ..." ئەمە هەر وایە..

ئەی ئەو پایەیەی کە بەخشیویەتی بەو کەسانەی سەرپەرشتی هەتیوان دەکەن، ئایا بەس نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە چ لوتکەیەك بووە لە سۆز و میهرەبانیدا؟ بزانن چی دەفەرموێت: أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هكَذَا "من و سەرپەشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین." ئەمە دەفەرموێت و هەردوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستی دەنووسێنێت بە یەکەوە، ئیتر بەم شێوەیە ئاماژە بۆ نزیکی خۆی و ئەو کەسە دەکات کە چاودێری کردن و سەرپەرشتی کردنی هەتیوان دەگرێتە ئەستۆ.[2]

---

١ بخاري، جنائز ٣، أحمد بن حنبل، المسند ٢٣٧/١، ٤٣٦/٦؛ طبراني، المجمع الكبير ١٣٩/٥، ٣٧/٩.

٢ بخاري، طلاق ٢٥، الأدب ٢٤؛ مسلم، زهد ٤٢.

وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بفەرموێت: لە بەهەشتدا کەس ناتوانێت بێتە نێوان من و ئەو کەسەوە کەوا سەرپەرشتیی هەتیوان دەکات و لەژێر باڵی چاودێری خۆیدا دەیانپارێزێت.

## سۆز و بەزەیی بەرامبەر گیانداران

سۆز و بەزەیی ئەو سەروەرە، گیاندارانیشی گرتبووەوە. پێشتر عەرزم کردن کە چۆن ئافرەتێك لەسەر سزادانی پشیلەیەك دەچێتە دۆزەخەوە و، ئافرەتێکی بەدڕەوشتیش لەسەر تێراو کردنی سەگێك، "فەرمووی بەهەشتی لێدەکرێت.

جارێکیان لە غەزایەك دەگەڕانەوە.. لەکاتی پشوودا هەندێك لە هاوەڵان هێلانە باڵندەیەکیان بەرچاوکەوت، ئیتر چوون بێچووە باڵندەکانیان دەرهێنا و کەوتنە دەست پیا هێنانیان. ڕێك لەو کاتەدا دایکەکەیان گەڕایەوە، کاتێك بێچووەکانی بە دەستیانەوە بینی، بەستەزمانە شپرزە بوو و کەوتە باڵەفڕکێ بەسەریاندا. وەختێ پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەم حاڵەتە ئاگاداربووەوە، لە ڕادەبەدەر تووڕە بوو و فەرمانی دا دەستبەجێ بێچووەکان بخرێنەوە نێو هێلانەکەیان.[1]

بەڵێ، ڕەحمەتەکەی گیاندارانیشی لەخۆگرتبوو. ئەی ئەوە نییە خوای گەورە لەسەر شارە مێرووڵەیەك سەرزەنشتی یەکێك لە پێغەمبەرانی پێشوو دەکات؟ ئەو پێغەمبەرە، بە ئەنقەست بێت یان نا، شارە مێرووڵەیەکی سووتاندبوو.. بەدواشیدا لە لایەن پەروەردگارەوە تووشی سەرکۆنە کردن بووبووەوە.[2] ئێستا دەپرسین: ئایا دەکرێت هەرگیز ئەو پێغەمبەرە پێشەوایەی ئەم نموونەیە و هاوشێوەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە، خۆی بەجۆرێکی تر ڕەفتار بکات؟

---

١ أبو داود، الأدب ١٦٣، جهاد ١١٢؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤٠٤/١.

٢ بخاري، جهاد ١٥٣؛ مسلم، سلام ١٤٨-١٥٠.

پاشان لەنێو ئوممەتەکەیدا کەسانی وا پێدەگەن، بە "مامەی مێرووله نەشێل" ناوزەد دەکرێن. ئەو کەسانە دەچن زەنگۆڵە لە قاچیان دەبەستن بۆ ئەوەی لە کاتی ڕۆیشتندا مێروولەکان بە دەنگی زەنگۆڵەکە دووربکەونەوە و نەکەونە ژێر پێ و نەپلیشێنەوە...

ئامان خودایە! ئەمە چەندە نموونەیەکی قووڵ و جیهانگیری شەفەقەت و بەزەییە؟! بەڵێ، تەنانەت مێروولەکانیش خۆیان لە بازنەی بەزەیی ئەو کۆتەڵەی شەفەقەتەدا دەبیننەوە. داخۆ مرۆڤانێك کە تەنانەت ئازاری مێروولەش نادەن، دەستیان دەچێتە ئەوەی ستەم لە کەسانی دی بکەن؟ نەخێر، مەحاڵە بە ویستی خۆیان و بە ئەنقەست ناحەقی ئەنجام بدەن!

إبن عباس (رضيَ اللهُ عَنْهُما) بۆمان دەگێڕێتەوە: "لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەچووین بۆ شوێنێك. کابرایەك مەڕێکی بەستبووەوە و بەتەمابوو سەری ببڕێت، هەروا بە بەرچاوی مەڕەی بەسەزمانیشەوە چەقۆکەی دەمەزەرد دەکردەوە. پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بە بینینی ئەم دیمەنە، کابرای ئاگادار کردەوە و پێی فەرموو: أَتُرِيدُ أَنْ تُمِيتَهُ مَوْتَاتٍ "کابرا، مەگەر دەتەوێت چەند جارێك بیکوژیت؟"[1]" ئەمە لە ڕوویەکەوە سەرکۆنەی ئەو کابرایە بوو.

حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و یەعلای کوڕی موڕڕە (رضيَ اللهُ عَنْهُما) بۆمان دەگێڕنەوە: "پێغەمبەری خوا و چەند هاوەڵێکیش لە خزمەتیدا وشترێکی تا بڵێی لەڕ و لاوازیان بەرچاو کەوت. وشترە هەر ئەوەندەی پێغەمبەری خوای بینی، یەکسەر خوڕ خوڕ فرمێسك لە چاوانیەوە داباری. سەروەری هەردوو جیهان بە بینینی ئەو تابلۆیە بە پرتاو بەرەو لای وشترەکە هەنگاوی نا. پاش ئەوەی ماوەیەکی باش لای ئەو بەستەزمانە مایەوە، ئینجا خاوەنی وشترەکەی بانگکرد و

١ عبدالرزاق، المصنف ٤٩٣/٤؛ حاكم، المستدرك ٢٥٧/٤، ٢٦٠؛ بيهقي، السنن الكبرى ٢٨٠/٩.

زۆر بەتوندی هۆشیاریی دایە تا گرنگی بە وشترەکەی بدات و بەجوانی بەخێوی بکات.»[1]

ئەو پێغەمبەری خوایەی کە سەرتاپا بەزەیی و میهرەبانیی لێ دەباری و لەمێژە دابووی بەلای ئەو خۆشەویستی و بەزەییەدا کە مرۆڤدۆستانی ئەمڕۆکە لافی پێوە لێ دەدەن، ئەم ڕەحمەتە جیهانییەی لە هەموو چەشنە زیادەڕۆیی و کەمرەوییەك پاراست و، لە سایەی فەتانەتەکەیدا، کە شەختەی هەموو گرفتێکی دەتواندەوە، هەرگیز نەکەوتە زیادەڕۆیی و کەمرەوییەوە.

بەڵێ، هیچ کات لەژێر ناوی لێبووردەییدا بەچاوی لێبووردنەوە نەیڕوانیوەتە هەڵە و تاوان و، مۆڵگەی تاوان و خراپەکاری بنیات نەناوە. چونکە زۆر باش دەیزانی کە ئەو لێبووردەییەی بەناوی شەفەقەتەوە بەرووی تاوانبارێك یاخود خاوەن ڕۆحێکی دڕندەدا دەنوێنرێت، پێشێلکردنی مافی هەزارەها کەسی تری بێتاوانە. بەڵام دەبێت بەداخ و کەسەرەوە ئەوە بڵێم کە ئەو جۆرە ناحەقی و مافخواردنەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەنجام دەدرێت، لە ئاستێکدایە، داوێتی بەلای هەموو چەرخ و سەردەمەکانی پێشوودا. گەر خۆشەویستی و شەفەقەت هاوسەنگانە بەکارنەهێنران، ئەنجامگەلێکی وایان لێدەکەوێتەوە نە تاك و نە کۆمەڵگەش نەتوانن لەڕوویدا بوەستنەوە. ئینجا وەرە ئێستا سواری کەشتیی ئەندێشە ببە و بە دەریای ڕابردوودا بگەڕێرەوە بۆ ئەو دوورگەیەی کە بە چاخی بەختەوەری ناسراوە و بزانە تاکە ڕووداوێکی ئەرێنی لەم جۆرەت بەرچاوت دەکەوێت.!

بەڵێ، خۆشەویستی ئەو بۆ مرۆڤ لە ئاستێکدا بوو، دەگەیشتە ئەوەی لەو پێناوەدا گیانی خۆی بەخت بکات. هاوکێش کردنەوەی جارجارەی قورئانی پیرۆزیش بەڵگەیە لەسەر ئەمە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَّفْسَكَ

---

[1] أحمد بن حنبل، المسند ١٧٣/٤؛ طبراني، المجمع الأوسط ٨١/٩.

عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَـٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ (الكهف : ٦) "له داخ و خەفەتی ئەوەی باوەڕ بەم قورئانە ناهێنن، ئەوەندەی نەماوە خۆت لەناو ببەیت."

ئەی مەگەر ئەو دەمەی کەشی نبووەت دەستی کرد بە باڵکێشان بەسەر کەسایەتییەکەیدا، ئەو خۆی لە ئەشکەوتێکدا بەند نەکردبوو؟! سروەی وەحییش بۆ یەکەم جار هەر لەوێدا بەسەریدا هەڵی نەکرد؟! کەوابێ ڕێبازی ئەو ڕێبازی خۆشەویستی مرۆڤ بوو و ژیانی خۆیشی بۆ ئەو ڕێیە تەرخان کردبوو.

لە ڕاستیدا تێڕوانینی پێغەمبەرمان بۆ جیهادیش هەر لەم بەزەیی و میهرەبانییەوە سەرچاوەی گرتبوو. بەڵێ، ڕەنگە خەڵکی بەهۆی جیهادەوە هەندێك زیانی دنیاییان لێبکەوێت، بەڵام لە ڕوانگەی ژیانی ئەبەدییانەوە ئەوەندە شت زۆرە بەدەستی بێنن، کە ئەم زیانانە لەچاویاندا هیچن! پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە نووکی ئەو شمشێرەی هەڵیگرتبوو، ئەو ڕێگایانەی دەکردەوە کە بەرەو بەهەشت دەچوون. ئەمەش خۆی لە خۆیدا مەودایەکی تری بەرەحمەت نێرراوییەکەی بوو بۆ هەموو جیهانیان.

## ٢. ئارامگری

ئەو سەروەرە نازدارە، هاودەم لەگەڵ فەتانەتەکەیدا، ئارامگریشی لەشوێنی خۆیدا و ئاوێتە بەیەکتر بەکار دەهێنا. لە سایەی ئەمەشدا زۆرێك لەو لوتکە سەرکەشانەی وا گومان دەبرا بڕینیان ئەستەم بێت، کەوتنە ژێر پێ و زۆرێکیش لەو دڵە ڕەقانەی وەك شەختەسەهۆڵ وابوون و ئەو ڕۆحانەش کەوا لە بەستەڵەکیان دەکرد، لە بەرامبەر ئەو خۆری صەبر و ئارامییەدا توانەوە وشەربەتاوی هیدایەتیان نۆشی. ئەوە ئەبوسوفیان و عیکریمە و چەندین کەسی دیش... ئاخر ئەگەر ئەم

چەشنە صەبر و خۆڕاگرییەی سەروەری ئازیزمان نەبوایە، کێ چاوەڕێی دەکرد ئەم کەسانە بێنە ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە؟

بەڵێ، ئەو "رَحمَـةً لِلعالَمیـن"ە. هاوسـەنگیی ڕەحمەتەکەشـی بەڵگەیەکی تری فەتانەتەکەیەتـی.

## ٣. نەرمونیانی و هێمنییەکەی

لەو بەشەدا کە ڕابوورد، هەوڵماندا لەسەر ئەو خاڵە بوەستین کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) درەوشاوەترین و ڕوونترین ئاوێنەی دەرخەری ڕەحمانیەت و ڕەحیمیەتی[1] خوای باڵادەستە. ئەگەرچی دەستەوسان بووین لەوەی مافی

[1] "الرحمن": سیفەتە ناوێکی هاوشێوەی لەفزی "الله"یە کە زەحمەتە بتوانرێت بۆ زمانێکی تر وەربگێڕدرێت. لەگەڵ ئەوەدا کە سیفەتێکی پەروەردگارە و لەو ڕووەوە کە وەک "ناو" ناسراوە، بۆیە کاتێک دەوترێت "الرحمن"، ڕاستەوخۆ ناوی پیرۆزی "الله" دێت بەخەیاڵدا. لەبەر ئەم هۆیەشە کە ئەم ناوە لە غەیری خوای گەورە، بۆ کەسانی تر بەکار نایەت. ئەم وشە پیرۆزە بەواتای ئەو زاتە دێت کە: "خاوەن میهرەبانی ڕەها و بێ سنوورە و، بەبێ جیاوازی لەنێوان باوەڕدار و بێ باوەڕ، موسوڵمان و نا موسوڵمان، سەرانسەری گەردوونی بە: ژیان و مانەوە و ڕۆزی و لێهاتن و ڕێسا و هەماهەنگری و نیعمەتی نەبڕاوە ڕازاندووەتەوە."
جێی باسە کە ئەم ناوە پیرۆزە "الرحمن" دەڕوانێتە ئەزەل. خوای گەورە(جل جلالە) بەمیهرەبانی و تەجەککی ئەو میهرەبانییەی وا لە ڕۆحی ناوی "الرحمن" دایە، بوونەوەرانی بەدی هێناوە. لەم ڕووەشەوە، گەردوون یەکپارچە جێدەست و ئاسەواری "الرحمن"ەو، خوای باڵادەست بەو ڕەحمەتەی لەم ناوەوە پرشنگی داوە، هەموو شتێکی دەورەداوە.
لەڕاستیدا خوای گەورە (جل وعلا) دوو جۆر درەوشانەوەی هەیە لەگەردووند: یەکەمیان تەجەللی گشتی پەروەردگارە بەهەموو ئەو ناوانەیەوە کە پەیوەندییان بە بوونەوەرانەوە هەیە. چەشنی درەوشانەوی تیشکی خۆر بەگەرمی و ڕەنگەکانی ناویەوە لە تەواوی ڕووی زەمیندا. لەهەمان کاتدا پێشی دەوترێت "تەجەللی واحیدی" و "تەجەللی جەلالی" پەروەردگارە. جا ئیدی "الرحمن" سەرچاوەی تەجەللی هەموو ناوەکانی خوای گەورە(واحیدی) یە لەسەرجەمی بوونەوەراندا. ئەو ڕێسا ناوازە و هەماهەنگییە سەرسووڕهێنەرەش کە وا بەسەر گەردووندا زاڵە، لە هەموو ڕوویەکەوە دەرەنجامی تەجەللی "الرحمن"ە و، هەرچی شتی هەیە، بیەوێت یان نا، لەژێر یاساکانی ڕەحمانییەتدایە و، لە حاڵەتی ملکەچیدایە بۆ پەروەردگاری خاوەن توانست و ڕەها. بەتایبەتئەو کارایییەی لە ڕوخساری

بەهای باڵای ئەو نازدارە بدەین، بەڵام ئەوەندەی لەدەستمان هات، هەوڵماندا لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك و بە مەبەستی بەرچاوڕوونی، ئەوە بخەینە پێشچاو کە چۆن هاوسەنگیی ڕەحمانیەت و ڕەحیمیەتی پاراستووە و بە چ شێوەیەکیش ئەمەی ئاوێزانی فەتانەتەکەی کردووە. لەم بەشەشدا هەوڵی خۆمان دەخەینەوە گەڕ بۆ پیشاندان و خستنەڕووی هێمنی و نەرمونیانیی پێغەمبەری پێشەوامان کە بابەتێکە

---

ڕووی زەویدا بەدی دەکرێت، هەر لەبەدیهێنانی ڕووەک و گیانلەبەران و پۆشتەکردنیان بەسیستەم و توانا و لێهاتنی پێویست بۆ بەردەوامی ژیانیان، هەروەها وێکچوونی بەخێوکردن وگەورەکردن و بەڕێوەبردنیان، هاودەم لەگەڵ هەماهەنگی و ڕێسا و چاکە ومیهرەبانی، هەرهەمووی لە تیشکەکانی ئەم ڕەحمانیەتەن.
جۆری دووەمی تەجەللی، درەوشانەوەیەکی تایبەتە لە یەکە بەیەکەی بوونەوەراندا بەکۆمەڵە ناوێکی دیاریکراو و بە ئەندازەی توانا و لێهاتنی ئەو بونەوەرە، بەوێنەی درەوشانەوەی خۆر لەدانە بەدانەی بوونەوەران و، دەرکەوتنی لە هەموو تەنێکی ڕووندا. ئەم چەشنە لەدەرکەوتن، پێی دەوترێت "تەجەللی ئەحەدی" و "تەجەللی جەمالییە."
ئیتر بەم شێوەیە "الرحیم" ڕەحمەتی تایبەتی کردگارە. واتە: تەجەللی تایبەتی (ئەحەدی- جەمالی) پەروەردگارە لە هەریەک لە بوونەوەراندا.
لەبەرامبەر جیاوازی نەکردنی "الرحمن" لە نێوان ئیمان و کوفر، داد و ستەم، حەقیانەت و ناحەقی، جوانی و ناشرینی، چاک و خراپدا، "الرحیم" بەجۆرێکی تایبەت ڕووی لە خاوەن هەستە زەمینییەکانە. ئینجا لەلایەکەوە وەک چۆن تایبەتمەندییەکانی هاوشێوەی هاتنە دنیا، دایک و باوک، خێزان، نەژاد، ڕەنگ، کات و شوێنی مردن و بونیادی ماددی و شێوازی کارکردنی جەستە لەم جیهانەدا پەیڕەوی ڕێسا زۆرەملێیەکانی ئەو ڕەحمانییەتەیە کە لەگەردووندا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوا لەلایەکی ترەوە، بەخشینی ئیرادە بە دانیشتوانی ئەم جیهانەو، ئەو جیاوازییانەش کە لە دەرەنجامی بەکارهێنانی ئەم ئیرادەیە دێنە کایەوە، هەر لە ئیمان و کوفر، چاکە و خراپە، جوان و ناشرین، ڕاست و خواروخێچ هەموویان تەجەللی تایبەتن بە ڕەحیمییەت.
هەروەها بەهانەوە ناردنی کۆمەکی تایبەت لە دنیادا بۆ ئەوانەی ئیرادەیان بە ئاڕاستەیەکی دروستدا بەکار دەهێنن و باوەڕ دەهێنن بەخودا و تەسلیمییەت هەڵدەبژێرن.
پاداشتدانەوەشیان لە ئاخیرەتدا وەک بەری ئەوەی چاندوویانە، دیسانەوە لە تەجەللیاتی ڕەحیمییەتە. ئەگەر -بەفەرزی مەحاڵ- درەوشانەوەی ڕەحمانییەت نەبووایە، ئەوکات ئێمەش، تێکڕای بوونەوەرانی نێوگەردوون لەگەڵمان،لە تاریکستانی "نەبوون"دا دەماینەوە و نەدەهاتینە نێو بازنەی "بوون". خۆ ئەگەر تەجەللی ڕەحیمییەت نەبووایە، ئەوا ئەودەم خاوەنی شتێک نەدەبووین پێی بووترێت ئیرادە وە بەئاڕاستەی دروستی خۆی بەکارمان نەدەهێنا. هەروەها دەرکی ناوازەیی دروستکراوەکانی کردگاری کارزانمان نادەکرد و، دین، ئیمان، ئیسلام، پێغەمبەر چییە نەمانەزانی و بێ بەش دەبووین لە بەهەشت و ژیانی نەبڕاوەی هەتا هەتایی...

---

پەیوەندی بە ڕەحمانیەت و ڕەحیمیەتەکەیەوە هەیە و لە ڕوویەکیشەوە بە ڕەهەندێکی تری ئەو دوو تایبەتمەندییە دادەنرێت.

هێمنی یەکێکی ترە لەو کلیلە ئاڵتوونیانەی دراوە بە پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ). بەم کلیلە، دەروازەی زۆرێك لە دڵەکانی کردەوە و تەختی خۆی تێدا دانان. خۆ ئەگەر ئەم هێمنییەی نەبووایە، ئەوا زۆرێك لە دەروونە پڕ لەقینەکان ڕووبەڕووی هەندێك لە زبری دەبوونەوە و بە پێچەوانەی ئێستا، هەندێکیان سەنگەریان لە ئیسلام دەگرت و هەندێکی تریشیان ڕەنگە بەپاڵنەری هەستێك لە هەستەکان، دوورەپەرێزییان هەڵبژاردایە. ئەوە تەنها هێمنی و نەرمونیانی پێغەمبەری خوا بوو کە بەری بە هەموو ئەمانە گرت و خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو ئیسلامەوە.

بەڵێ، هێمنی و نەرمونیانی یەکێك بوو لەو سیفەتە نایابانەی کە خوای گەورە خەڵاتی خۆشەویستەکەیی کردبوو.. ئیتر ئەویش ڕەحمەت چۆن بوو، ئاوا وەك خۆی پەخشی دەکردەوە. خوای گەورە لە ئایەتێکدا باسی ئەم تایبەتمەندییەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ (آل عمران : ١٥٩)

"جا ئەودەم، بە ڕەحمەتێك لەلایەن پەروەردگارەوە بە هێمنی و نەرمونیانی مامەڵەت لەگەڵ کردن. خۆ ئەگەر زبر و دڵڕەق بوویتایە، گومانی تێدا نییە ئەوانیش لەدەورت نەدەمان و بڵاوەیان لێدەکرد. کەوایە، لێیان ببوورە و داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە. لەو کاروبارانەدا (کە ڕوویان لە گشتینەیە) ڕاوێژیان پێبکە. ئیتر هەر ئەوەندەی بڕیارت دا، پشت بە خوا ببەستە و متمانەت بەو بێ. چونکە خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێ دەبەستن."

هەروەك لە ئایەتەکەشەوە دەردەکەوێت، هێمنی و نەرمونیانی لە خودی ڕەحمەتەوە سەرچاوەی گرتووە. ئەگەر پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) زبر و توند بوایە -کە هەرگیز وا نەبووە- ئەوا کەسانی دەوری هەموو بڵاوەیان لێدەکرد و دەڕۆیشتن. ئەوە ڕەحمەتی فراوانی خوای گەورە و میهرەبانە کە نەرمونیانی بە ئازیزمان بەخشیوە. واتە، خوای گەورە هەوێنەکەی هێندە کامڵ و ماهییەتەکەشی ئەوەندە نەرمونیان ساز دابوو، تەنانەت ئەو دەستانەش کە درێژ دەکرانە سەری، هیچ کات ئازاریان پێ نەگەیشت و لەو ساتانەشدا کە چاوەڕێی دڕکیان دەکرد، خۆیان لەنێو گوڵ و گوڵزاردا دیتەوە. کەی بینراوە ئەو کەسانەی سەرووەرمان چووەتە دڵیانەوە و تەختی ئەوینی تێدا داناوە، لەوەوە ئازاریان پێگەیشتبێت؟!

ئەم ئایەتە بەبۆنەی جەنگی ئوحودەوە نازڵ بوو. سەرباری ئەوەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەموو جۆرە تاکتیك و ڕێوشوێنێکی جەنگی بە بچووکترین وردەکاریشەوە فێری هاوەڵە بەڕێزەکانی کرد، کەچی دەرك نەکردنی هەندێکیان بەو وردەکارییەی لە گوێڕایەڵی کردنی فەرماندایە، هەروەها بەجێهێشتنی سەنگەر بێ ئەوەی هیچ فەرمانێکیان پێ بگات، هەموو ئەمانە شکستێکی کاتییان بۆ موسوڵمانان وەپێش هێنا. ڕەنگە لەڕووی ئەنجامەوە نەتوانرێت پێی بوترێت شکستێکی تەواوەتی، بەڵام ئاشکرایە کە سەرکەوتنێکی ڕەهاش نەبوو...

دەنگۆی کوژرانی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ترس و سەغڵەتی خستە دڵی زۆرێك لە موسوڵمانانەوە. بەڵام هەر لەو ڕۆژەدا کەسانێکیش هەبوون کە وەك ئەنەسی کوڕی نەضر بیریان دەکردەوە. ئەوەبوو ئەم هاوەڵە بەڕێزە لێیان ڕاپەڕی و بە دەنگە دلێرەکەیەوە هاواری کرد: "مادام پێغەمبەری خوا کوژراوە، دەی ئیتر ئێوە چاوەڕوانی چی دەکەن."[١] ئیتر ئەوانیش بەمە ورەیان هاتەوە بەر و گیانی خۆیان لە پێناوی خوای گەورەدا بەخشی. لە ڕاستیدا ڕێش هەر ئەو ڕێیە بوو، بۆیە دەبوو

١ ابن هشام، السيرة النبوية ٣١/٤-٣٢.

ڕابکەن و ڕۆحی خۆیان لەو ڕێیەدا بەخت بکەن کە خۆشەویستەکەیان لەپێناویدا ڕۆحی خۆی بەخت کردبوو.

خۆ ئەگەر لە چوارچێوەی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوادا هەڵسوکەوت بکرایە، ئەوا لەوانەبوو بەرەو سەرکەوتنێکی تەواوەتی هەنگاویان بنایە و براوەی جەنگ بوونایە. کەچی تۆ وەرە بزانە، سەرپێچییەکی بچووك چەندە ئەنجامەکەی گۆڕی و چەندێکیش نەهامەتی بەدوای خۆیدا هێنا!

ئێستاش با بۆ ساتێك لەسەر ئەم خاڵە ڕابوەستین و ڕابمێنین: باشە ئەگەر سەرکردەی ئەم کۆمەڵە لەبری پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کەسێکی تر بوایە، داخۆ ڕەفتاری چۆن دەبوو بەرامبەر ئەوانەی گوێڕایەڵی فەرمانی نەبوون و سەرپێچییان کردووە؟ ئایا دەیتوانی بەجۆرێك مامەڵە بکات هەروەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت؟ ئینجا وەرە ئەو کەسە سەرکردەی ماددی و مەعنەویشیان بێت...

بەڵێ وابوو، هەرچی شتی ڕاست و دروست هەیە لەو ئازیزەوە فێربووبوون. بە سەدان جار بە چاوی خۆیان بینیبوویان کە چۆن لە هەموو مەسەلەیەکدا پێکاویەتی. دەی ئیتر ئەم زاتە هەر لە سەرەتاوە ئاگاداری کردبوونەوە و جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە کە کەس شوێنی خۆی چۆڵ نەکات. ئێستاش وا بەهەموو تاڵییەکیەوە سزای گوێ نەگرتنیان بۆ قسەی ئەو زاتە دەچەشت. دەتوت لەپاڵ ئەو هەموو شەهیدەشدا کەسێك نەمابووەوە زامدار نەبووبێت. تەنانەت خودی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) سەری موبارەکی بریندار بووبوو و ددانی پیرۆزیشی شکابوو و جەستەشی خەڵتانی خوێن بووبوو. باشە جگە لە پێغەمبەری خوا، ئەگەر هەر سەرکردەیەکی تر بووایە، ئایا بەلایەنی کەمەوە گرژی و تووڕەییەك لە ڕووخساریدا بەدەر نەدەکەوت، یان هەر هیچ نەبێت وتەیەك یاخود ڕەفتارێکی هاوشێوەی ئەوەی نەدەنواند کە ڕابردوویان بیربێنێتەوە و بڵێت: "ئەی مەگەر من پێم

نەوتن ئاوا و ئاوا بکەن؟!" جا ئیتر قورئانی پیرۆز لەم ساتە زۆر ناسکەدا دێت و بەربەستێك لەبەردەم ئەو بیرکردنەوانەدا دادەنێت کە لەوانەبوو بە ناخیدا گوزەریان بکردایە و لە ڕێگەی ئەو ئایەتەی سەرەوە لەگەڵی دەدوێت.

ئەمە، ساتەوەختێکی وەها هەستیار و حاڵەتێکی هێندە ناسك بوو، لەوانەبوو بچووکترین جووڵەی جەستەیی، بگرە ئاماژەی ڕووخساریش کە لەم کەشە دەروونییەدا لە سەرکردەوە دەربچوایە، کاریگەرییەکی زۆر جیاوازتری لە وەختانی ئاسایی جێبهێشتایە. لە وەها قۆناغێکدا کە تەنانەت پەرگیری و دوورەپەرێزی لە بچووکترین ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانەش دەخواست کە دەبوونە مایەی دڵشکان و ڕەنجاندنیان، قورئانی پیرۆز دێت و بەم شێوەیە لەگەڵ سەرورەرمان دەدوێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾ (آل عمران : ١٥٩) "ئەگەر زبر و توند بویتایە بەرامبەریان -کە هەرگیز وەها نیت- ئەوا لەدەورت نەدەمان و بڵاوەیان لێدەکرد." ئەمە لەحاڵێکدا هاوەڵە بەرێزەکان تاڵە موویەکیش چییە هەڵوێستی خۆیان نەگۆڕی بوو و هەروەك پەروانە بەدەوری پێغەمبەری خوادا دەسووڕانەوە.

ڕەوشتی ئەو سەروەرە قورئان بوو.[1] لە ڕاستیدا ئەو ڕەوشتەش کە قورئان بۆی باس کردبووین هەر ئەم ڕەوشتە ئیلاهییە بوو. مەگەر بەچاوی خۆمان نابینین کە چۆن سەرباری یاخی بوون و سەرپێچی بەردەوامی مرۆڤەکان لە خوای گەورە، کەچی ئەو هێشتا هەر نیعمەتی زۆر و زەبەندەی خۆی دەڕژێنێت بەسەریاندا. لەکاتێکدا ئەوان -حاشا- کوڕ و هاوسەر دەدەنە پاڵ پەروەردگار و چەندین شتی تری بۆ هەڵدەبەستن، کەچی ئەو بە ڕەحمانیەتی خۆی لوتف و چاکەی هەمە چەشن و بێ ئەندازەیان بەرامبەر دەنوێنێ. ئەوەتا خۆر هەموو ڕۆژێك بە گەرمی و ڕووناکییەکەی و، هەورەکان بە فرمێسکە بارانی چاویان بە هانای خەڵکییەوە

---

١ مسلم، مسافرین ١٣٩؛ أبو داود، تطوع ٢٦.

دێن و، زەویش لەلایەن خۆیەوە هەردەم بە ڕووەك و میوەجاتە هەمەچەشنەکانیەوە ئامێزی بۆ کردوونەتەوە، کەچی ئەوان لەبەرامبەر هەموو ئەم ناز و نیعمەتانەدا سپڵەیی وا دەنوێنن کە بە عەقڵ و خەیاڵی کەسدا نەهاتووە.

بەڵێ، ئادەمیزاد لە بەرامبەر ئەو ناز و نیعمەتانەدا کە پێی بەخشراوە، لە ملیۆنێکدا یەکیش چییە سوپاسگوزاری و منەتباری خۆی دەرنابڕێت. کەچی لەولاوە پەروەردگاری "الحلیم" یەکسەر سزایان نادات و بەهۆی گوناهـ و تاوانیانەوە عادەتی ئیلاهی خۆی ناگۆڕێت، بەڵکو هەر دەبەخشێت و هەر دەبەخشێت...

جا لەبەر ئەوەی حەزرەتی محمد المصطفی (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمَ)ش بەم ناوەی پەروەردگار ناودار و، بەم ڕەوشتەشی ڕەوشتدار بوو، بۆیە دەبینین لەم ڕووەوە بووبووە ئاوێنەیەکی تەواو کامڵی سیفەت و ناوە جوانەکانی پەروەردگاری باڵادەست. مەگەر قورئانی پیرۆزیش هەروا ناوی نابات: ﴿ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ (التوبة : ١٢٨) "زۆر میهرەبان و بە سۆزە بەرامبەر باوەڕداران."

نەك بەتەنها ئەو، بەڵکو کاتێك باس لە باپیریشی، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەکرێت، دیسانەوە باس لە ئارامی و هێمنییەکەی دەکرێت.. بەڵێ، قورئانی پیرۆز دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیمیش دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴾ (هود : ٧٥) "بە ڕاستی ئیبراهیم زۆر لەسەرخۆ و بە ئارام و خەمخۆر و گەڕاوەیە بۆ لای خوا."

حەزرەتی ئیبراهیم مرۆڤێك بوو لەوپەڕی پلەی نەرمونیانی و لەسەرخۆییدا. لە خەمی ئەوەی نەبادا بەڵایەك بەسەر ئەوانەدا بێت کە هەڵیاندابووە ناو ئاگرەوە، لەرز دایگرتبوو. کەسێك بوو شەو تا بەرەبەیان هەر لە ئاهـ و ناڵیندا بوو.. هەروەها "مونیب"یش بوو. هەموو ئان و ساتێك بە بوون و ژیانەوەیەکی نوێوە بەدووی دەلاقەی بەرەو خوا گەڕانەوەدا بوو و بێ وچان و بەدڵێکی تەڕ و تازەی پڕ لە

جۆش و خرۆشەوە لە دەرگانەی پەروەردگاردا نرکە و ناڵەی دەهات و وەك گۆچان چەمابووەوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەمیشە خۆی بە حەزرەتی ئیبراهیم دەچواند.[1] بەڵێ، ئەو سەروەرە نازدارە لە هێمنی و ئارامیەکەشیدا لە حەزرەتی ئیبراهیمی باپیری دەچوو.

لە ڕاستیدا هێمنی و لەسەرخۆیی بۆ سەرجەم دۆستانی خوداش بناغەیەکی گەلێك گرنگە. تەنانەت پێویستە مرۆڤ لەگەڵ ئەو ئادەمیانەشدا نەرمونیان بێت کە لە هەموو سەر سووچ و گۆشەیەکدا بە ڕق و کینەوە خۆیان بۆ مەڵاس داوە. ئەوەتا حەلاج لەنێو دەریایەك خوێندا گەردنی ئەو کەسانە ئازاد دەکات کە دەست و قۆڵی دەبڕن. ئەی زەحمەتکێشی سەدە بۆ ناڵێیت؟! ئەوەتا نەك هەر دوعای شەڕ ناکات لەوانەی بەوێنەی تاوانبار پەڕاگەندەی ئەم شار و ئەو شاریان کرد و، لەم زیندان بۆ ئەو زیندان ڕاپێچیان کرد، بەڵکو لەپێناو ڕزگاربوونی ئیمانیاندا بەردەوام دوعای خێری بۆ دەکردن. بەم شێوەیەش پیشانی دەدات کە هێمنی و ئارامی چەندە پایەیەکی مەزن و باڵایە. خۆزیا ئەوانەی دواتریش لەم ئەفسوونەی هێمنی تێ بگەیشتنایە!

دووبارە دەچینەوە سەر باسی حەزرەتی ئیبراهیم: دوژمنەکانی فڕێی دەدەنە ناو ئاگرەوە، خوای گەورەش فەرمان بە ئاگرەکە دەکات و دەفەرموێت: ﴿ يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴾ (الأنبياء : ٦٩) "ئەی ئاگر، ببە بە ساردی و سەلامەتی لەسەر ئیبراهیم. واتە نە سەهۆڵ و نە ئاگر، بەڵکو لەنێوان هەردووکیاندا ببە بە سەلام." ئاخر بیرمان نەچێت، سەرەتا حەزرەتی ئیبراهیم لە بەرامبەر هەموو جیهاندا ناخی خۆی بەو شێوەیە ڕێکخستبوو. نە تووڕە دەبوو،

[1] بخاري، الأنبياء ٢٤؛ مسلم، إيمان ٢٧٢.

نه له مامەڵەیدا لەگەڵ خەڵکیش ساردوسڕ بوو. بەڵکو یەکپارچە "سەلام" بوو. جا بۆیە له لایەن خوای گەورەشەوە بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵ کرا. دەی خۆ حەزرەتی ئیبراهیم خۆی بە ڕەوشتی خوایی پۆشتە کردبوو، ئیتر چۆن خوای گەورە بە جۆرێکی تر مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد. نا هەرگیز! "سەلام" ناوی خوای گەورە خۆی بوو.. بۆیە ئاگریش لەبەرامبەر حەزرەتی ئیبراهیمدا دەبوو بە "سەلام" و "سەلام"یشی لێ دەکرد.

ئەم ڕەوشتی هێمنی و لەسەرخۆییەی کە حەزرەتی ئیبراهیم دەستی پێکرد، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گەیاندیە لوتکە. تەناتەت ئەو وەختەش کە نەیارەکانی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد و تەواوی توانا و هۆکارەکان کەوتنە دەستی، ئەو هێشتا هێندەی تاڵە موویەك له جوامێری و مەردایەتی خۆی لای نەدا. بۆ ئەگەر تاوانبارانی سزا بدایە، کەس هەبوو بتوانێ بێتە ڕێی؟! نەخێر، بە سەدانی وەك حەزرەتی عومەر چاوەڕێی تەنها ئاماژەیەکی چاوی پێغەمبەری خوا بوون و لەبەرامبەر هەر ڕووداوێکدا کە ئەو ئازیزەی دڵتەنگ بکردایە، وەك شێری نەڕ ڕادەپەڕین و مۆڵەتیان دەخواست بۆ پەڕاندنی کەللەسەران. کەچی ئەو هەموو جارێك هاوەڵانی پەروەردە دەکرد و وانەی هێمنی و ئاشتیخوازی فێر دەکردن.

ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت، تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان بوختانیان بۆ خێزانە موبارەکەکەی خۆیشی هەڵبەست کە تا سەر ئێسقان بڕوای بە عیففەت و پاکیزەییەکەی هەبوو. خۆ گەر بەس بە چاو ئاماژەی بۆ هەر موسوڵمانێك بکردایە، ئەوا لەوانەبوو کەللەی چەندین دووڕوو بچوایە بە ئاسمانا.. هەر هەمووشیان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئەمەیان دەکرد.

ئەمە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَام) چەندین ڕۆژ وەك ئەوەی دڕك قووت بدات، ئاوەها ئەو قسە و قسەڵۆکانەی قووت دەدا و خۆی دەخواردەوە

و تاقەت پڕووکێنترین خەم و خەفەتی لە ویژدانیدا گل دەدایەوە، کەچی سەرباری هەموو ئەمانەش ببڕای ببڕای دەنگی نەکرد. هەتا ئەو کاتەی قورئانی پیرۆزیش پاکداوێنی و بەرائەتی بەڕێزترینی بەڕێزان، عائیشەی صددیقەی تۆمار دەکرد، ئەم حاڵەتە هەروا درێژەی دەکێشا. هاوەڵانیش هەموو لە چاوەڕوانی تاکە وشەیەکدا بوون کە لە لێوانی ئەو سەروەرە نازدارەوە دەربچێت.

جاری وا بوو کەسانی وای لێ قوت دەبووەوە کە چەندین ڕەفتاری نابەجێ و ناقۆڵایان لەڕوودا دەنواند. خۆ ئەگەر سەروەرمان بەئەسپایی پەنجەی موبارەکی ببزواندایە ئەوا سەد شمشێر بەجارێك دادەباریە سەر سەری ئەو کەسە. بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی بە نەرمونیانی و هێمنی وەڵامی ئەو ڕەفتارە ڕەق و چەوتانە بداتەوە. ئەو هێندە گرنگی دەدا بەوەی نەبێتە مایەی ترساندنی هیچ کەس، کار گەیشتبووە ئەوەی کاتێك شیرێك یان چەقۆیەکی دەدا بە یەکێك، دەسکەکەی ڕوو تێ دەکرد و بەو جۆرە دەیدایە. جا ئیتر چۆن ڕێی تێدەچێت مرۆڤێکی لەم جۆرە، بەناحەق دەستی بچێتە خوێنی کەسێکی ترەوە؟ ئەوەتا خۆی دەفەرموێت: لا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِماً "بۆ هیچ موسوڵمانێك ڕەوا نییە موسوڵمانێکی تر بترسێنێت."[1] هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: لَا يُشِيرَ أَحَدُكُم عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ "با کەس لە ئێوە بە چەکەکەی ئاماژە بۆ براکەی نەکات."[2]

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) هەتا بڵێی مرۆڤێکی هەست ناسك و دڵنەرم بوو. بە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی زبر و ناقۆڵای دەوروبەرەکەی زۆر ناڕەحەت دەبوو. بەڵام ئەو ئەم جۆرە ڕەفتارانەی دەهاویشتە دەریای هێمنی و نەرمونیانی خۆیەوە و لەوێدا دەیتواندنەوە و سەرباری هەموو شتێك، بەنەرمی مامەڵەی دەکرد. بەڵێ، جیهانی هەستەکانی بەو شێوەیە بەرین و بەرفراوان بوو. وێڕای ئەوەی کە ئازاری

---

1 أبو داود، الأدب ٨٥؛ الترمذي، الفتن ٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٦٢/٥.
2 البخاري، الفتن ٢٧؛ مسلم، البر ١٢٦.

نەخۆشی و ناڕەحەتییەکانی چەند قاتی ئەو ئێش و ئازارە بوو کە ئێمە هەستمان پێ دەکرد. بەو ڕادەیەی، ڕۆژێکیان کە نەخۆش دەبێت، عەبدوڵای کوڕی مەسعود (رضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەچێتە خزمەتی و پێی دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا، تایەکی بەرزت هەیە، هەروەك کوورە تاوت سەندووە!"[1] بەڵێ، کۆئەندامە دەماری پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تا ئەو ڕادەیە گەشەکردوو بوو، هەر بۆیە تا ئەو ڕادەیەش هەستیار بوو. ڕەنگە ئەگەر دەرزییەك بچوایە بە پەنجەیدا، دە ئەوەندەی ئەو کەسە ئازاری هەبوایە کە ڕمێك چەقیوە بە جەستەیدا. دەشێ ئەم هەستیارییەشی لەبەر ئەرکەکەی سەرشانی پێ بەخشرابێت کە هەستیارییەکی دەراسای دەخواست.

هەرچۆنێك بێت، پێم وایە کەسێکی تا ئەو ڕادەیە هەستیار، ناڕەحەت بوونیشی بە ڕەفتاری زبر و بریندارکەری دەوروبەرەکەی، هەر بەو ڕادەیە لە ئاستێکی بەرزدایە. خۆ ئەگەر کەسێکی دیکە بەو ڕێژەیە هەستیار بوایە، ئەوا ڕۆژی چەند جارێك دەوروبەرەکەیی هەڵدەگێڕایەوە و دەیکردە فەرتەنە. بەڵام وەرە ببینە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هیچ کات وای نەکردووە و نەیشی دەکرد، ئاخر ئەو نموونەی هێمنی و لەسەرخۆیی بوو. بەڵام بیرمان نەچێت کە هێمنی و ئارامییەکەشی لەوپەڕی هاوسەنگیدا بوو. کوفری کافرێك پشتی دەشکاند و دەیخستە گریان. بەس بۆ ئەوەی کەسێك بگات بە هیدایەت، هەرچی لەدەست بهاتایە دەیکرد. بەڵام کاتێکیش جێبەجێ کردنی سزایەك یان سنوورێکی شەرعی دەهاتە ئاراوە، هەرگیز سازشی نەدەکرد و خاوەن سزا هەرکێ بوایە، بێ هیچ دوودڵییەك سزاکەی بەسەردا جێبەجێ دەکرد. بەڵام ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەو تاوانانەی سزای بەسەردا جێبەجێ دەکردن، هیچکامیان لەو تاوانانە نەبوون کە بەرامبەر خۆی ئەنجام درابوون. بەڵکو بەپێچەوانەوە، نەبینراوە تاوانێکی بەرامبەر کرابێت و ئەو لێی خۆش نەبووبێت.

---

١ بخاري، مرضى ٣، ١٣؛ مسلم، البر ٤٥.

له دینداریشدا به هه‌مان شێوه مامه‌ڵه‌ی ده‌کرد: ئه‌وه‌ی قورس و گران بوایه، هه‌میشه بۆخۆی هه‌ڵده‌بژارد، کامه‌ش سووك و ئاسان بوایه، ده‌یخسته سه‌ر شانی ده‌وروبه‌ره‌که‌ی. ته‌نانه‌ت نوێژه سوننه‌ته‌کانی ده‌برده ماڵه‌وه و به ته‌نها ده‌یکرد، نه‌بادا ببێته بارگرانی به‌سه‌ر ئوممه‌ته‌که‌یه‌وه و وه‌ك فه‌رز ته‌ماشا بکرێت. ئه‌مه جگه له‌وه‌ی که‌س نه‌بوو بتوانێت به‌رگه‌ی دوور و درێژیی نوێژه سوونه‌ته‌کانی بگرێت. جاری وا هه‌بوو ڕۆژووه‌کانیشی به‌سه‌ر یه‌که‌وه ده‌گرت -به‌مه ده‌وترێت "صوم الوصال"-[1] له‌م ئه‌رك و کاروباره زۆر گرانانه‌شدا که به‌س خۆی به‌رگه‌ی، ده‌گرت تاقانه بوو و به‌ته‌نها ڕێی ده‌کرد. ئه‌مانه‌ش هه‌موو له کاتێکدا که خوای گه‌وره له سه‌رجه‌می گوناهه‌کانی ڕابردووشی و داهاتووشی خۆشبووبوو.[2]

پێده‌چێت یه‌ك له واتاکانی ئه‌مه بێت: خوای گه‌وره هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه توانا و لێهاتنی چوونه نێو گوناهی له‌ودا نه‌هێشتووه. ئه‌وه‌تا هه‌ر خۆیشی هه‌واڵی ئه‌وه‌مان ده‌داتێ که دوو جار، جارێکیان له منداڵیدا و جارێکیشیان له پێش میعراجدا به نه‌شته‌رگه‌ری مه‌عنه‌ویدا تێپه‌ڕیوه. هه‌روه‌ها باس له‌وه‌ش ده‌کات که له نه‌شته‌رگه‌ریه‌که‌ی منداڵیدا فریشته‌کان پارچه‌یه‌کیان له سنگی لێکردووه‌ته‌وه و فڕێیان داوه.[3] ئه‌گه‌ری زۆره ئه‌و پارچه‌یه شتێك بووبێت تایبه‌ت به به‌شه نه‌فسانییه‌کانی ده‌روون.

پێغه‌مبه‌ری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هه‌رگیز کارێکی وای لێ نه‌بینراوه به گوناه له قه‌ڵه‌م بدرێت. که‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا له ڕۆژێکدا زیاد له حه‌فتا جار

---

١ بخاري، صوم ٢٠؛ مسلم، صيام ٥٥-٦١.

٢ بڕوانه: سوره‌تی الفتح، ئایه‌تی ٢.

٣ سه‌باره‌ت به ڕووداوی شوشتنی دڵی پێغه‌مبه‌ری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) له منداڵیدا، بڕوانه: مسلم، إيمان ٢٦١؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣،١٤٩؛ إبن حبان، صحيح ٢٤٢/١٤. سه‌باره‌ت به شوشتنی دڵی له‌پێش میعراجدا بڕوانه: بخاري، توحيد ٣٧؛ مسلم، إيمان ٢٦٣.

تەوبە و ئیستیغفاری دەکرد.[1] سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە ئەو نموونەی خۆبەکەم گرتن و چاودێری و لێپرسینەوەی نەفس بوو. جا لەبەر ئەوەی لە هەر هەنگاوێکیدا، بەراورد بە هەنگاوی پێشووی، لە خوای باڵادەست نزیکتر دەبووەوە، بۆیە کاتێك لە ڕوانگەی ئەو حاڵەتە تازەیەی بەدەستی هێنابوو تەماشای حاڵی پێشوو -بەم هۆیەشەوە مەرجووح-ی خۆی دەکرد و داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە دەکرد. واتە هەموو ڕۆژێك، بەدەم داوای لێخۆشبوونەوە یادی ڕۆژی پێشتری دەکردەوە. پێم وایە بەتەنها دان بەخۆداگرتن و نارامگرتنی وەها مرۆڤێکی بێ گوناه لەسەر مانەوەی لەناو خەڵك و کۆمەڵگەدا، بەس بێت بۆ خستنەڕووی فراوانیی هێمنی و ئارامیەکەی. لە کاتێکدا ئەو هەر بەمەوە نەوەستاوە، بەڵکو لە بەرامبەر ئەو ڕەفتارە بێ ئەرزش و نابەجێیانەی ڕووبەڕووی دەبووەوە، هەمیشە زوبانی گفت شیرینی هێمنی و نەرمونیانیی خستووەتە گۆ.

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە (رضيَ اللهُ عَنْهُم) بۆمان دەگێڕنەوە کە: کەسێك بەناوی "ذو الخويصرة" دێتە لای پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام). سەرچاوەکانی سیرە و کتێبەکانی فەرموودە ئەدگاری ئەم کابرایەمان بەم جۆرەی خوارەوە بۆ وێنا دەکەن: کەسێکی چاو بەقووڵا چووی.. کوڵم دەرپەڕیوی.. لووت پەستراوی دەموچاو ئەبڵەق و خڕ بوو، هەر دەتوت قەڵغانی کوتراوە. لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا سەرقاڵی دابەشکردنی هەندێ شتومەك بوو، کابرا زۆر بێ شەرمانە ڕووی کردە پێغەمبەر و وتی: إعْدِلْ يَا مُحَمَّد "ئەی محمد دادپەروەر بە!" ئەگەر ئەم قسەیە بە یەکێك لە ئێمە بوترایە، وا دەزانم کیانمانی دەهێنایە لەرزە. لە کاتێکدا لەوانەیە هەر بەڕاستیش نادادپەروەریمان کردبێت. بەڵام ئەو زاتەی ئەم قسەیەی ئاراستە کراوە، پێغەمبەرێك بوو -ڕۆحمان قوربانی ئەو پێغەمبەرە بێت- فەرمانپێکراو بە هێنانی دادپەروەری بۆ هەموو دنیا.

---

[1] بخاري، دعوات ۳؛ مسلم، ذکر ٤١-٤٢.

حەزرەتی عومەر کە لەو کاتەدا لەوێ دەبێت، لەبەرامبەر ئەم بێ ڕێزییەدا ڕادەپەڕێ و دەڵێت: دَعْنِي فَأَقْتُلَ هَذَا المُنَافِقَ "ئەی پێغەمبەری خوا، لێم بگەڕێ، با ئەم مونافیقە بکوژم!."

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا هەڵدەستێت بە ئارامکردنەوەی حەزرەتی عومەر و ئەوانەش کە وەك ئەو بیریان دەکردەوە، ڕوو دەکاتە کابرا و پێی دەفەرموێت: وَيْلَكَ! وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلُ؟ "خاکەسەر خۆت! ئەگەر من دادپەروەر نەبم دەی ئیتر کێ دادپەروەر دەبێت؟"

لە چەند ڕیوایەتێکی تری فەرموودەکەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەم چەند وشەیەش دەخاتە سەر قسەکانی: لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ "ئەگەر من دادپەروەر نەبم، کەواتە ڕەنجەڕۆ بووم و تیاچووم." لە ڕیوایەتێکی تردا ئەم گوفتارە ڕووی لە دوێنراوە: لَقَدْ خِبْتَ وَخَسِرْتَ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ "ئەگەر من دادپەروەر نەبم، ئەوا تۆ ڕەنجەڕۆ بوویت و تیاچوویت."[1]

واتە، منێك کە پێغەمبەرم.. تۆیەکیش کە لە هەموو کاروبارێکتدا ناچاری پەیڕەوی کردنی منی. ئەگەر من کەسێکی خاوەن ئیستیقامەت نەبم -حاشا- ئەوا ئەوکات تۆ تیاچوویت. چونکە ئەوکات تۆش ناتوانیت لەسەر ئیستیقامەت بیت...

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەك نەریتی هەمیشەیی خۆی، ڕێی بەوانە نەدا کە دەیانویست کابرا بکوژن. چونکە ئەو سەروەرە سەرتاپا هێمنی و نەرمونیانی دەنەخشاند.

بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەوەشی فەرامۆش نەکرد کە لە کەسایەتی ذو الخويصرەدا ڕواڵەتی ئەو لەدین دەرچووانە وێنا بکات کە لە داهاتوودا دەستیان لە فیتنە و ئاشووبێکی گەورەدا دەبوو. بەڵێ پێغەمبەری خوا لە

---

١ بخاري، مناقب ٢٥، الأدب ٩٥، إستتابة المرتدين ٤؛ مسلم، زكاة ١٤٨.

ڕێگەی هەواڵ پێدانی پەروەردگاریەوە دەیزانی کە ئەم نەژادە لە داهاتوودا پشێوی و ئاژاوە دەنێنەوە و دەردەسەری و مەینەتی بەسەر ئوممەتەکەیدا دێنن. لەڕاستیشدا هەر وابوو، هەر لە سەردەمی حەزرەتی عەلیدا، ئەو ڕووداوانەی پێغەمبەری خوا هەواڵی دابوون، ڕێك وەك خۆیان هاتنە دی. ئەوەبوو لە جەنگی نەهرەواندا ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا وەسفی کردبوو، لە بەرەی خەواریجدا دژی حەزرەتی عەلی دەجەنگا.[1]

بەڵێ، سەرداری هەردوو جیهان هیچ شتێکی بەم کابرایەش نەوت. خۆ ئەگەر تەنها ئاماژەیەکی بکردایە، یاخود لە ئاست داواکەی حەزرەتی عومەردا بۆ ساتێك بێدەنگ بوایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە چارەنووسی کابرا مەرگ دەبوو. بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەو جۆرە هەڵسوکەوتی کرد کە خوای گەورە فێری کردبوو، بۆیە خۆی بەم چەشنە نەفامانەوە سەرقاڵ نەدەکرد. ئەوەتا قورئانی پیرۆزیش پێی دەفەرموو: ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ (الأعراف : ١٩٩) "ڕوو لە نەفامان وەرگێڕە." خۆتیان پێوە خەریك مەکە، واتە، نارەحەت مەبە لەو کارەی دەیکەن. چونکە نەفام بە نەفامیی خۆی ڕەفتار دەکات. دەی خۆ تۆ هەرگیز نەفام نیت. کەوابوو، ناکرێت ئەوان چییان بەرامبەر کردیت، تۆش هەمان شتیان بەرامبەر بکەیتەوە. تۆ خاوەن حەوسەڵەیت، نەرمونیان و لەسەرخۆیت، دەستنیشانکراوی ئەوەیت بە هێمنی و نەرمونیانییەکەت تەخت لە دڵاندا دابنێیت. لە ڕاستیشدا هەر وابوو، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) لە سایەی هێمنی و ئارامییەکەیدا تەختی ئەوینی خۆی لە دەروونی کەسانێکدا دانا کە هەرگیز چاوەڕێی خێریان لێ نەدەکرا.

زۆربەی هاوەڵان بەکۆی دەنگ ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگێڕنەوە: پاش فەتحی خەیبەر، ئافرەتێك مەڕێك دەبرژێنێت و دوای ژەهراوی کردنیشی، بانگهێشتی

---

١ إبن كثير، البداية والنهاية ٧/٢٩٠-٢٩٧.

پێغەمبەری خوا و هاوەڵان دەکات بۆ خواردن. یەکێك لە هاوەڵان کە ناوی بیشری کوڕی بەڕاء بوو، پێش ئەوەی لەسەر سفرەکە هەستێت، ڕەنگی گۆڕا و ئەوەندەی نەبرد گیانی سپارد. وا دیار بوو ئافرەتەکە ویستبووی بە ژەهرێکی کوشندە پێغەمبەری خوا شەهید بکات... ڕووی موعجیزەی ڕووداوەکە بابەتی ئێستامان نییە.. لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا دەیەوێت تیکەیەك ببات بۆ دەمی، پارچەیەکی مەڕەکە هەواڵی ئەوەی پێدەدا کە ژەهراوییە. ئیتر خواردنەکە هەڵدەگیرێت و ئافرەتەش دەستبەسەر دەکرێت و دەهێنرێتە حوزووری سەروەرمان.. ئافرەتەکە دان بە تاوانەکەیدا دەنێت و بێ پێچ و پەنا دەڵێت کە بە مەبەستی کوشتنی پێغەمبەری خوا کارێکی وای کردووە. تەنانەت لە ڕیواتەکاندا وتەیەکی لەم جۆرەش دەدرێتە پاڵ ئافرەتەکە:

کاتێ ئافرەتەکە دەهێننە حوزووری پێغەمبەری خوا و پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن کە بۆچی بەم کارە هەستاوە، ئافرەتەکە لە وەڵامدا دەڵێت: "ئەگەر تۆ بەڕاستی پێغەمبەرێکی نێرراو بیت لە لایەن پەروەردگارەوە، ئەوا ئەم ژەهرە کارت تێ ناکات. خۆ ئەگەر پێغەمبەریش نەبیت، ئەوا خەڵکی لە دەستت ڕزگاریان دەبێ."

هاوەڵان دەستبەجێ داوای کوشتنەوەی ئەم ئافرەتە دەکەن. بەڵام پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لای خۆیەوە لە ئافرەتەکە خۆشدەبێت. بەڵام سەبارەت حەزرەتی بیشر (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، کە بە هۆی ژەهرەکەوە گیانی لەدەست دابوو، هیچ نافەرموێت.

لەبارەی چارەنووسی ئەم ئافرەتەوە دوو ڕیوایەت هەیە: بە گوێرەی ڕیوایەتی یەکەمیان، میراتگرانی بیشر لەسەر بنەمای "قیصاص" کوشتوویانەتەوە. ڕیوایەتی دووەمیش دەڵێت: ئافرەتەکە موسوڵمان بووە. بەم هۆیەشەوە کەسوکاری کوژراوەکە

لێی خۆشبوون و بەم شێوەیە موسوڵمان بوونەکەی بووەتە هۆکاری ڕزگاربوونی.[1]

ئەو لایەنەی لێرەدا ویستمان هەڵوێستەی لەسەر بکەین، پەیوەندی بە هێمنی و نەرمونیانی پێغەمبەری خواوە هەیە کە چۆن تەنانەت لەو ئافرەتە یەهوودیەش خۆشبووە کە ویستوویەتی شەهیدی بکات. ئای ئەمە چەندە نموونەیەکی جوانی دوندنشینییە لە هێمنی و نەرمونیانیدا! بەڵێ، ئەو سەردەمی هێمنی و نەرمونیانییەی کە حەزرەتی ئیبراهیم بە واتا کامڵەکەی دەستی پێکرد، سوڵتانی ئەنبیا، حەزرەتی محمد المصطفى (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) گەیاندیە ترۆپك و لوتکەی خۆی.

ئەبوداود و نەسائی لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خوا لەگەڵ هاوەڵانیدا لە مزگەوت دانیشتبوو، ڕێك لەوکاتەدا کە دەیویست بەرەو خانەی بەختەوەری بگەڕێتەوە، دەشتەکییەك هات و لە پشتەوە جوببەکەی پێغەمبەری خوای ڕاکێشا و ئەم چەند وتە زبرەی لێ بیسترا:

يَا مُحَمَّدُ، اِحْمِلْ لِي عَلَى بَعِيرَيَّ هَذَيْنِ فَإِنَّكَ لَا تَحْمِلُ مِنْ مَالِكَ
وَلَا مِنْ مَالِ أَبِيكَ

"ئەی محمد! ئادەی ئەو دوو وشترەمم بۆ بار بکە. خۆ تۆ نە لە ماڵی خۆت و نە لە ماڵی باوکت نامدەیتێ."[2]

ئەمە چ بێ شەرمی و بێ ئەدەبییەك بوو! ئەو بێ ڕێزییەی کە هەر لە بانگکردنی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بەناوی خۆیەوە دەستی پێکرد، لە پاشماوەی قسەکانیشیدا هەر بەردەوام بوو. هاوەڵان دیسانەوە لەگەڵ ئەم قسانەدا

---

1 بۆ بینینی ڕیوایەتی جیاوازی ڕووداوەکە لە سەرچاوە جیاوازەکاندا، بڕوانە: بخاري، الهبة ٢٨؛ مسلم، سلام ٤٥؛ أبو داود، الديات ٦؛ معمر بن راشد، جامع ٢٢/٢٨-٢٩؛ بيهقي، السنن الكبرى ٤٦/٨-٤٧؛ قاضي عياض، الشفاء ٣١٦/١-٣١٨؛ هيثمي، مجمع الزوائد ٤٦/٨-٤٧؛ إبن كثير، البداية والنهاية ٢٠٨/٤-٢١٢.

2 أبو داود، الأدب ١؛ نسائي، قسامة ٢٣.

ڕاپەڕین. لەناویاندا دەنگی حەزرەتی عومەر لە هەموویان بەگوڕ و تینتر بوو. دەیویست سنوورێك بۆ ئەو بێ ئەدەبییە دانێت، بۆیە وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێم بدە با سەری بپەڕێنم." بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕووی کردە هاوەڵان و فەرمووی: "ئەم پیاوە چی دەوێت بیدەنێ." ئیتر بەم شێوەیە هاوەڵانی هێورکردەوە.

کەسێك بهێننە پێش چاوی خۆتان کە لە کۆڕی پێغەمبەری خوادا دانیشتووە و گوێبیستی فەرمایشتە شیرینەکانی سەرووەرە کە دڵیان دەکرد بە ئاو. پاشان ئەم کەسە دێت و ڕەفتارێکی لەو جۆرە دەنوێنێت. ئایا وا نازانن ئەم ڕەفتارە بەس بێت بۆ خستنەڕووی دڵڕەقیی و شێواویی کەسایەتیی ئەو کەسە؟! ئەمە لەگەڵ زانینی ئەوەی کە مەجلیس و وتارەکانی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، هەرگیز لە مەجلیس و وتاری وەلییان و مورشیدان ناچێت. ڕاستییەکەی، مەحاڵە توانیبێتمان لەڕێی ئەم پەیڤە خام و دەربڕینە شڕوپڕانەوە کەش و هەوای ئاسمان ئەندازی نێو ئەو مەجلیسانە لە ڕووبەڕی دەروونتاندا بنەخشێنین. بەڵام ڕاستییەك هەیە کە هەریەکەمان لە لای خۆیەوە دەتوانێت دەرکی بکات؛ ئەویش بریتییە لەوەی کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا لەسەروو بەرگە هەوای بوونی خۆیەوە دەلاقەیەکی دەکردەوە و، لە ڕێی دڵ و ویژدانیەوە، کە کردبوونیە ناوێنەی ئەو تەجەللییاتانەی لە حەق تەعالاوە دەهاتن، لە پرتە و هەناسەیەکدا نامادەبووانی مەجلیسەکەی بەو ڕەنگگرتەییە بگۆڕەی خۆی، بەرەو لوتکەکان بەرز دەکردەوە. بەڵێ، با بۆ ماوەیەکی زۆر کەمیش بێت، ئەوانەی توانیان ئەو حوزوورەیان بۆ ڕەخسا، بازیاندایە هەڵبژاردەترین ئەو جێیانەی مرۆڤ بتوانێت پێیان بگات.

حوزووری ئەو نازدارە دارای ڕەنگگرتەییەك بوو، لەسەروو هەموو خەملاندنێکەوە. ئەوەی تەنها جارێك دەچووە ناوی، وەك بڵێی فریشتاوی دەبوو و بەو شێوەیە دەهاتە دەرەوە. دڵ و دەروونیشیان هیچ خراپەیەکی تێدا نەدەما.

## نموونەیەك لە ڕەنگگرتەیی (الإنصباغ)

یەکێکیش لە هەرە گرنگترین ڕازەکانی نەگەیشتنەوەی هیچ وەلییەك بە هاوەڵە بەڕێزەکان، حەقیقەتی ئا ئەم ڕەنگگرتەییەیە.

زانایەکی گەورەی هاوچەرخیش سەبارەت بەم ڕەنگگرتنە دەدوێت و دەڵێت: "ڕۆژێکیان ئەم پرسیارەم بە دڵدا هات؛ بۆچی کەسانی پایەبەرزی وەك محێدینی عەرەبی ناگەنە پلەی هاوەڵە بەڕێزەکان؟ ئەوەبوو لە کاتی بە ئەنجام گەیاندنی نوێژدا، خوای گەورە "سوجدە"یەکی هاوشێوەی سوجدەی هاوەڵانی بە نسیب کردم. ئیتر ئەو کات تێگەیشتم کە بەرزبوونەوە بۆ پلەی هاوەڵان مەحاڵە."[1]

پێدەچێت پەنجەرە لەسەر ئەم زاتە گەورەیە کرابێتەوە و پێی ڕاگەیەنرابێت کە سوجدەکەی هاوشێوەی سوجدەی هاوەڵان بووە. گرنگ لێرەدا ناوەڕۆکی باسەکەیە. ئەویش ئەوەیە کە: ئەم زاتە دەڵێت ئامادە بووە عیبادەتی ساڵێکی تەواوی خۆی لەپێناو یەك ڕکاتی ئەو جۆرە نوێژەدا ببەخشێت. ئەمە لە کاتێکدا بە بینینی نوێژی یەکێك لە قوتابییەکانی ئەو زاتە کە وەك مامۆستاکەی نوێژی دەکرد، وام لێهات شەرم لە نوێژەکانی خۆم بکەم. جا ئیتر صەحابی ناوی لوتکەیەکی ئاوایە لە هاوەڵێتی پێغەمبەردا. ئەو نوێژەی کەوا ئێمە بە ڕکاتێکیشی ناگەین، ئەوان بە بەردەوامی بەو قووڵی و ڕۆچوونە تیایدا ئەنجامیان دەدا.

چونکە ئەوان وانەکانیان ڕاستەوخۆ لە خودی رسول اللہ ﷺ خۆیەوە وەردەگرت. ئەمە جگە لەوەی کە سەرجەم بابەتەکانی دین لەو سەردەمەدا تەڕ و تازە و نایاب بوون. ئەوەتا ڕۆژێك گوێیان بە زایەڵەی بانگ دەزرنگایەوە کە ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی تا ماوەیەك جۆش و خرۆشیان زیندە ڕابگرێت... ڕۆژێکی تریش بە دەم خوانێکی ئیلاهی جیاوازەوە، حوکمێکی تازەی تری دین وەك نۆبەرە میوە دەخرایە

١ ، وتەکان، پاشکۆی وتەی بیست و حەوتەم.

پێشیان، ئەم جارەشیان ئەم خوانە ئاسمانییە گیانێکی نوێی تری تێدا دەبوژاندنەوە...

کەچی سەرباری هەموو شتێك، هێشتا کۆمەڵە دڵانێك هەر مابوون کە تەنانەت لەو کەش و هەوایەشدا نەتوابوونەوە. خاوەن ئەو جۆرە دڵانە لایان ئاسایی بوو بێ ڕێزی و زبری لە بەرامبەر ئەو پێغەمبەرە نازدارەدا بنوێنن... کەچی، ئەو زاتە کە یەکپارچە ناسکی بوو، بەچاوی لێبوردەییەوە بۆ ئەم جۆرە ڕەفتارانەی دەڕوانی و، ڕەقی و زبرییەك نەمابوو لە زەریای نەرموونیانیی خۆیدا نەیتوێنێتەوە.

بەڵێ، لە هەر هەنگاوێکیدا ئەمڕۆ و سبەینێ و داهاتووی لەبەرچاو دەگرت و بە گوێرەی ئەمە مامەڵەی دەکرد. خۆ ئەگەر پەنای ببردایە بۆ مامەڵەی ڕەق، ئەوا -بە دەربڕینە قورئانییەکە-[1] هەموان لە دەوری بڵاوەیان دەکرد. کەواتە بڵاوە نەکردنی خەرمانەکەی دەوری، لە ڕوویەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ نەرمونیانی و هێمنی ئەو سەروەرە. ئەو بۆ ئەوە نەهاتبوو خەڵکی بشکێنێت و کۆمەڵگەش پەرتەوازە و بێ شیرازە بکات، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوو دەستی گشت مرۆڤایەتی بگرێت و بیانگەیەنێتە بەختەوەری دنیا و ئاخیرەت. جا ئیتر مرۆڤایەتیش ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەی لەو ڕێگەیەدا دەست کەوت کە ئەو پیشانی دابوون. کەوابێ نیگاکانی هەردەم ڕووەو ئەبەدیەت ڕوانیویانە و هەڵسوکەوتەکانیشی بەپێی تێڕوانینێکی سەروو کاتیی لەم جۆرە پلانڕێژ کردووە.

حەزرەتی خالید یەکێك بوو لەوانەی لە جەنگی ئوحوددا زیانێکی زۆری بە موسوڵمانان گەیاندبوو. کەچی ئەو کاتەی هاتە حزووری پێغەمبەری خوا و تەسلیم بوونی خۆی نیشاندا، بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵدا کرا، بۆ ڕۆژی دواتر خۆی بە پارچەیەك لە سەروەرمان دەزانی. تەنانەت ئەوەندە دڵگران بوو لە بەشداری پێ نەکردنی لەو جەنگەی لەو ماوەیەدا ڕوویدا، تا بەرەبەیان فرمێسکی هەڵڕشت.

---

١ بڕوانە سورەتی آل عمران، ئایەتی ١٥٩.

گرنگی ئەم بەسەرهاتە لەوەدایە کە تێمان دەگەیەنێت چۆن ئەو هاوەڵە بەڕێزە توانی بەو ماوە کەمە و لەو ئاستەدا لە پێغەمبەری خوادا بتوێتەوە و ڕەنگی بگرێت.

هەردوو هاوەڵی پایەبەرز؛ عەمری کوڕی عاص و عیکریمە، هەردووکیان بەر لە موسوڵمانبوونیان خراپەی زۆریان بەرامبەر پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەنجام دابوو. بەڵام نەرمونیانی و هێمنی پێغەمبەری خوا بە چەشنێك ئەوانیشی تواندەوە، لە دواییدا دەتوت هەردووکیان بوونەتە شمشێری ئیسلام بەسەر سەری کوفرەوە. خۆ ئەگەر هەر لە سەرەتاوە ئەو پایەیە لەبەرچاو نەگیرایە کە ئەم جۆرە کەسانە لە داهاتوودا بەدەستیان دەهێنا، ئەوا بە هیچ شێوەیەك ڕێی تێ نەدەچوو ئەو کەسانە بێنە ڕیزی هاوەڵانەوە.

نموونەیەکی تریش "ئیبن هیشام"ە کە لای هەموان ناسراوە. ئەم هاوەڵە بەڕێزە، کە برای ئەبوجەهل و مام و خەزووری عیکریمەش بوو، بە ماوەیەکی کەم پێش وەفاتی سەروەرمان موسوڵمان بووبوو. ئەو ئیبن هیشامەی کەوا تا کاتی موسوڵمانبوونی، بەردەوام لە بەرە و ڕیزەکانی پێشەوەی کوفردا دژ بە ئیسلام دەجەنگا، لەپاش موسوڵمان بوونیشی هەروا لە ڕیزەکانی پێشەوە، بگرە لە پێشی پێشەوە دەبینرا. تا دواجار لە یەرمووکدا هەنجن هەنجن کرا و بە شەهیدی بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە.

لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا ئاوی بۆ دێنن. لەو کاتەدا کە مەتارەکە دەبات بۆ لێوی، کەمێك لەولای خۆیەوە گوێی لە نووزەیەك دەبێت. وا دیارە ئەم دەنگە شەکەتەش داوای ئاو دەکات. حاریس یەکسەر مەتارەکە لە لێوەکانی دەکاتەوە و ئاماژە دەکات؛ ئاوەکە ببرێت بۆ خاوەنی ئەو دەنگە.. درێژەی بەسەرهاتەکە لای هەموان زانراوە... لەو ساتە وەختەدا کە ئەم دووەم کەسەش خەریکە دەم بەرێت بۆ مەتارەکە، دەنگێکی تر دەبیسترێت کە ئەویشناڵەیەتی بۆ "ئاو". جا ئیتر کەسی

دووەمیش ئاماژە بۆ کەسی سێیەم دەکات. تا ئاوەکەشی دەگاتێ، گیانی ئەسپەردە دەکات.. کاتێکیش بەرەو لای ئەوانی تر دەگەڕێنەوە، دەبینن هەرسێکیان بێ ئەوەی قومێك ئاو بچێتە سەر لێوی وشك هەڵهاتوویان، چاویان لێکناوە و بەرەو ئاسۆی ڕۆحیان لە شەقەی باڵیان داوە.

خەمخۆری... ئەمیش یەکێکی ترە لە خەسڵەتە نایابەکانی ئەو پێغەمبەرە نازدارە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ). هاوەڵانیش بەهۆی ڕەنگگرتەییان بە پێغەمبەری خواوە، لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەم خەسڵەتەدا بوون. بەڵێ، ئەو لەپێناو ژیاندنەوەی کەسانی تردا دەژیا و قوربانیی وای دەدا، ژیری لە ئاستیدا دۆش دادەما. وەك چۆن خۆی وا بوو، هاوەڵانیشی هەر بەو شێوەیە بوون. ئەو نموونەیەی سەرەوەش، تەنها دانەیەکی نێو ئەو خەرمانە سەرسامکەرەیە...[1]

زەیدی کوڕی سەعنە دەگێڕێتەوە:

بەر لە موسوڵمان بوونم، پێغەمبەری خوا بڕێك پارەی لێ قەرزکردبووم. منیش پێش وادەی خۆی ڕۆیشتم بۆ لای و داوای قەرزەکەم لێ کردەوە. هەر ئەوەندە نەبوو داوای قەرزەکەم بکەم و بەس، بەڵکو پێشم وت: "ئێوەی ڕۆڵەکانی عبدالمطلب هەروا قەرز کوێرن!" عومەر بەم قسەیەم هەڵچوو و هاتە قسە: "ئەی دوژمنی خوا، گەر لە نێوان ئێمە و جولەکەدا ڕێککەوتن نەبوایە، ئەوا هەر ئێستا کەللەم دەپەڕاندیت! بەرامبەر پێغەمبەری خوا بە ئەدەبەوە قسە بکە." پێغەمبەر تەماشایەکی کردم و بزەیەکی بەڕوومدا نواند. ئەوجا بە حەزرەتی عومەری فەرموو: "ئەی عومەر، مافی ئەم پیاوە بدەوە. ئینجا لەبەر ئەوەش کە ترساندت، بیست صاع زیاتری بدەرێ."

حەزرەتی عومەر لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا هەستا و لەگەڵ زەیدی

---

[1] حاكم، المستدرك ٢٧٠/٣؛ إبن عبدالبر، الإستيعاب ١٠٨٤/٣.

کوڕی سەعنەدا کەوتنەڕێ. پاش ئەوەی شتەکانی پێدا، زەید ڕووی کردە حەزرەتی عومەر و چەند قسەیەکی پێ وت کە هەرگیز چاوەڕێی نەدەکرد:

"ئەی عومەر! دەزانم بە هەڵسوکەوتەکەم تووڕە بوویت. بەڵام ئەوە بزانە هەرچی شتێك لە تەوراتدا لە پەسنی دوایین پێغەمبەردا هاتووە، هەموویم لەودا بینیوە. تەنها ئایەتێك نەبێت کە دەیوت: يَسْبِقُ حِلْمُهُ جَهْلَهُ وَلَا تَزِيدُهُ شِدَّةُ الْجَهْلِ عَلَيْهِ إِلَّا حِلْماً "هێمنی و ئارامییەکەی پێش جەهلەکەی دەکەوێت. توندی و سەختی ئەو جەهلەی لە بەرامبەریدا دەنوێنرێت، جگە لە هێمنی و ئارامی هیچی تری زیاد ناکات." بۆیە منیش دەموت تۆ بڵێی حیلمەکەشی بەو شێوەیە بێت کە لە تەوراتدا هاتووە! دەمویست ئەوە بزانم، ئەو قسانەشی کە کردم، هەر لەبەر ئەم مەبەستە بوو. جا ئێستا کە دڵنیا بووم، ئەوا باوەڕ دەهێنم کە ئەو خودی ئەو پێغەمبەرەیە کە تەورات هەواڵ و مژدەی هاتنی داوە. لەم ساتە بەدواوە باوەڕ دەهێنم و شایەتی دەدەم کە ئەو دوایەمین پێغەمبەرە."[1]

پێغەمبەری خوا (عَلَيهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيم) دڵی زانای جولەکە، زەیدی کوڕی سەعنەشی هەر لە ڕێی هێمنی و ئارامییەکەیەوە نەرم کرد و بوو بە هۆکاری ئەوەی بێتە ناو ئیسلامەوە.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) بە ڕادەیەك نەرمونیان و لەسەرخۆ بوو، لە توانای کەسدا نەبوو بەرگەی ئەو شتانە بگرێت کە ئەو بەرگەی دەگرت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هاوسەنگی و ئیستیقامەت دوو دیوی تری لێك جیانەبووەوەی ئەم هێمنی و لەسەرخۆییەی بوون. ئەو پێغەمبەری خوایەی کە هەمیشە بە هێمنی و ئارامی وەڵامی ئەو سووکایەتی و بێ ڕێزیانەی دەدایەوە کە ڕووبەڕووی کەسایەتی خۆی دەبوونەوە، کەچی لە ئاست ئەو ستەمەی دەرهەق بە یەکێکی تر ئەنجام

---

١ إبن حبان، صحيح ٥٢١/١-٥٢٤؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٢٢/٥-٢٢٣؛ حاكم، المستدرك ٧٠٠/٣؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣٦١/١.

دەدرا، وەك شێری نەڕ تووڕە دەبوو و، تا ئەو کاتەشی حەق دەگەڕێنرایەوە بۆ خاوەنەکەی، بە هیچ جۆرێك توڕەییەکەی دانەدەمرکایەوە. ستەم بەرامبەر بە کێ و لە لایەن کێوە بکرایە، ڕەفتاری پێغەمبەر (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هەر هەمان شت بوو. بەتایبەت پشتگوێ خستنی فەرمانە دینییەکان بێ ئەندازە تووڕەیان دەکرد و ئۆقرەیان لێدەبڕی. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕوونترین ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو سەروەرە تا چەندە مرۆڤێکی هاوسەنگ بووە. ئەم دوو چەشنە لە هەڵسوکەوت، کە وەك دوو ڕەفتاری دژ بەیەك دێنە بەرچاو، دیوێکن لە دیوە ئاسمانییەکانی کەسایەتییە ناوازەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ).

ئێستاش بە مەبەستی بەرچاوڕوونی زیاتر، یەك دوو نموونە دەهێنینەوە سەبارەت بەو بابەتانەی لە سەرەوە باسکران:

ئیمامی بوخاری و موسلیم لە ئەبو مەسعودی ئەنصارییەوە دەگێڕنەوە کە: ”ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا. ئەم هاوەڵە بەڕێزە سکاڵای لەو کەسە دەکرد کە پێغەمبەری خوا ناردبووی تا پێشنوێژی بۆ ئەو کەسانە بکات کە ناتوانن بێن بۆ مزگەوت. هۆکاری سکاڵاکەش ئەوەبوو کە ئەم ئیمامە نوێژی بەیانیانی زۆر درێژ دەکردەوە.

بۆیە ڕێك بە پێغەمبەری (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وت: ”ئەی پێغەمبەری خوا! بە هۆی فلانە کەسەوە خەریکە چی دی نەچم بۆ جەماعەت. چونکە نوێژەکانی زۆر درێژ دەکاتەوە.“

بە بیستنی ئەم قسەیە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) برۆکانی گرژکرد و تووڕەیی لە ڕووخساریدا دەرکەوت. پاشان چووە سەر مینبەر و ڕووی کردە ئامادەبووان: ”ئەی خەڵکینە! ئێوە مرۆڤەکان دەتۆرێنن. کێ لە ئێوە پێشنوێژی کرد، ئەوا با درێژە بە نوێژەکەی نەدات. چونکە لە ناوتاندا کەسانی نەخۆش و پیر

و خاوەن پێداویستی هەن...''[1]

خودی خۆیشی هەروای دەکرد. جاری وابوو نوێژەکەی درێژ دەکردەوە و هەندێ جاریش بە گوێرەی بارودۆخی خەڵکەکە، هەتا بکرایە بەکورتی ئەنجامی دەدا.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) موعازی کوڕی جەبەلی زۆر خۆشدەویست. بەڵام وەختێ سکاڵای ئەوەیان لاکرد کە نوێژی خەوتنان زۆر درێژ دەکاتەوە، دیسان تووڕەبوو و سەرزەنشتی ئەم هاوەڵە لەدڵا ئازیزەی کرد و فەرمووی: أَفَتَّانٌ أَنْتَ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ، أَفَتَّانٌ أَنْتَ ''ئایا تۆ فیتنە هەڵگیرسێنیت، ئایا تۆ فیتنە هەڵگیرسێنیت، ئایا تۆ فیتنە هەڵگیرسێنیت؟''[2]

ئوسامەی کوڕی زەید لە یەکێك لەو جەنگانەدا کە سەرکردایەتی مەفرەزەیەکی دەکرد، ڕووبەڕووی کابرایەك دەبێتەوە. بەهەر پاڵنەرێك بێت کابرا دەیەوێت موسوڵمان بوونی خۆی ڕابگەیەنێت، بۆیە دەڵێت: ''باشە قبووڵمە.'' بەڵام حەزرەتی ئوسامە پێی وایە کابرا لەترسا ئەمەی وتوە و لە دڵەوە نییە، بۆیە دەستی لێ هەڵدێنێتەوە و دەیکوژێت. بەگوێرەی ڕیوایەتێکی تر کابرا شایەتمانیشی هێناوە. جا ئەگەر وتەکەی سەرەوەشی وتبێت، هێشتا هەر نەبووە بە موسوڵمان. خۆ ئەگەر شایەتمانیشی هێنابێت، ئەوا لە ترسا بووە. حەزرەتی ئوسامە وا بیری دەکردەوە، بەڵام لە گەڕانەوەدا کاتێك هەواڵەکە بە پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) گەیەنرا، سەروەری هەردوو جیهان دەستبەجێ ئوسامەی بانگکردە حوزووری خۆی؛ لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرد و ئوسامەش بەبێ شاردنەوەی هیچ شتێك، ڕووداوەکە چۆن بوو ئاوا گێڕایەوە. لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری خوا ئەوەندە تووڕەبوو، بێ وەستان دەیووت: أَشَقَقْتَ قَلْبَهُ ''سنگیت شەق کرد و تەماشای دڵی بکەی؟'' ئیتر بەم شێوەیە بێزاری خۆی دەردەبڕی. تەنانەت پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

١ بخاري، علم ٢٨، أذان ٦١؛ مسلم، صلاة ١٨٢.
٢ بخاري، الأذان ٦٠، ٦٣؛ مسلم، صلاة ١٧٨-١٧٩.

ئەوەندە ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، گەیشتە ئەو ڕادەیەی حەزرەتی ئوسامە بڵێت: "بریا تا ئەمڕۆ موسوڵمان نەبوومایە و گوێم لەم قسانە نەبوایە."[1] ئەمە لە کاتێکدا حەزرەتی ئوسامە کەسێك بوو لە ئامێزی پێغەمبەری خوادا گەورە بووبوو و بە ئەندازەی حەزرەتی حەسەن و حەزرەتی حوسەین لە دڵی ئەو نازدارەدا خۆشەویستبوو.

جارێکیان ئەبوذەر بە بیلال دەڵێت: "ئەی کوڕی ژنە ڕەشەکە!" حەزرەتی بیلالیش دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و سکاڵای خۆی لا دەکات. پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) حەزرەتی ئەبوذەر بانگ دەکات و لەسەر ئەم ڕەفتارەی لێی تووڕە دەبێت و بەم شێوەیە سەرزەنشتی دەکات: "تا ئێستاش نیشانەی نەفامیت تێدا ماوە."[2]

ئەوەتا لە دەمەقاڵێیەکی بچووکی نێوان حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەردا، بانگی حەزرەتی عومەر دەکات کە بووبووە مایەی ڕەنجاندنی حەزرەتی ئەبوبەکر و مافی حەزرەتی ئەبوبەکری لا ناهێڵێتەوە.[3] لە کاتێکدا ئێمە دەزانین حەزرەتی عومەری چەندە خۆشویستووە.

لەم نموونانە و سەدانی تری وەك ئەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هێمنی و ئارامییەکەشی هەر وەك خەسڵەتەکانی تری دارای هاوسەنگی بووە. بەڵێ، هاوشێوەی سەرجەم بابەتەکانی تر، لەم بابەتەشدا کتومت بەرجەستەکاری ڕاستەڕێ بووە. ئەو پێغەمبەرە پێشەوایەی لەئاست نابەجێترین و ناقۆڵاترینی ئەو هەڵسوکەوتانەی کەسی خۆیان دەکردە ئامانج، بووبووە دەریایەك لە

1 بخاري، مغازي ٤٥؛ مسلم، إيمان ١٥٨-١٦٠.
2 بخاري، إيمان ٢٢، الأدب ٤٤؛ مسلم، أيمان ٣٨-٣٩؛ بيهقي، شعب الإيمان ٢٨٨/٤؛ إبن حجر، فتح الباري ٨٦/١.
3 بخاري، تفسير (٧) ٣.

هێمنی و لێبوردەیی، کەچی بەرامبەر پێشێلکردنی مافی کەسانی تر، وەك زریان دەهاتە گۆ و پێشێلکار هەرکێیەك بوایە، بەهەر جۆرێك بێت نەیدەهێشت بەسەریدا بڕوات و هەرچۆنێك بێت مافی دەگێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی.

## ٤. کەرەم و تەوازوعەکەی

بەرلەوەی بچینە ناو باسەکەوە، پێم خۆشە شتێکی بچووکتان وەبیر بهێنمەوە؛ ئەوەبوو پێشتر هەڵوێستەیەکمان لەسەر بابەتی "فەتانەتی ناوازەی پێغەمبەری خوا" کرد. جا مادەم باسەکە گەیشتووەتە ئێرە، جێی خۆیەتی دیسانەوە ئەو ڕاستییە دووپات بکەینەوە کە: فەتانەت، ئەو مەنتیقە پێغەمبەرانە وەحی ڕەهەندەیە کە زمانی ژیری لە ئاستیدا تەتەڵە دەکات و مایەپووچی خۆی ڕادەگەیەنێت.

بۆی هەیە هەموو ژیرییەکان لە شوێنێکدا هێزیان لەبەر ببڕێ و پەکیان بکەوێت... زانستەکانیش تا خاڵێکی دیاریکراو بڕبکەن و لەدوای ئەوەوە دەسەپاچە ببن.. بەڵام ئەوە فەتانەت و مەنتیقی پێغەمبەرانە -بەو واتایەی لەسەرەوە ڕابوورد- کە هەروەك قومری باڵدەگرێت و دەدات بەلای لوتکە سەرکەشەکاندا و بەجێیان دێڵێت. ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیەکی ترە لەسەر پێغەمبەرایەتیی ئەو پێغەمبەرە نازدارە.

لە ڕاستیدا ئامانجی سەرەکیمان لە کردنەوەی دەرگای ئەو هەموو باسە، خستنەڕووی پێغەمبەرایەتیی ئەو سەروەرەیە. بۆ نموونە؛ مەحاڵە ئارامگری و هێمنییەکەی ببینیت و تەصدیقی پێغەمبەرایەتیەکەی نەکەیت.. وەك ئەوەی حەقیقەتی "محمد رسول الله" لە سیمای درەخشانی هێمنی و ئارامییەکی نوسرابێت وایە.. سەرجەم ویژدانە زیندووەکانی دنیاش سەرگەرمی خوێندنەوەی ئەو نووسینەن. خۆ ئەگەر کەسێ هەبێ، بەم جۆرە بەڕووی مەترسیەکاندا وەستابێتەوە و بەم

تێڕوانینەوە سنگی لە کارەساتەکان دەرپەڕاندبێت، ئەوا هەبێ و نەبێ ئەو کەسە پێغەمبەری خوایە (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ).

کاتێکیش لە ئاوێنەی سۆز و ڕەحمەتەکەیەوە بۆی دەڕوانین، سیمای نووربەخشانی هەمان حەقیقەت سەرلەنوێ بەوێنەی خۆر بەڕووماندا دەدرەوشێتەوە. ئاخر چونکە ئەو، دەریایەکی بێ بن بوو لە سۆز و میهرەبانی. لەم ڕووەشەوە زۆر لە پەڵەهەورە بارانبارەکان چڕتر و بەخشبارتر بوو. کاکڵەی قسە ئەمەیە: ئەو شتێکی تر نیە جگە لەوەی کە "رحمة للعالمين"ە.

دەبێ ئەوەش بزانین کە ڕەحمەتەکەی تەنها لەبازنەی مرۆڤایەتیدا قەتیس نەمابوو، بەڵکو تەواوی بوونەوەران سوودیان لێوەرگرتووە و سوودیشی لێوەردەگرن و هەتا ڕۆژی پەسڵانیش هەروا سوودمەند دەبن. ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە جار لەدوای جار بۆ ئەو خاوەن بەزەییە بێ سنوورەمان ڕووانی کەوا لە ویژدانیدا هەستی بە پەرۆشییەك دەکرد، دەتوت پەرۆشیی ئەو باڵندەیە یە کە بێچووەکانی ون کردووە.

لە کۆتاییشدا هەوڵماندا ئاوڕێك بە لای هێمنی و نەرمونیانییەکەیدا بدەینەوە و ئەوە بخەینەوە یاد کە ئەمەش مەودایەکە لە مەوداکانی ڕەحمەتەکەی. هەرچۆنێك بێت سەرەنجام هەریەك لەمانە دیوێك لە دیوەکانی فەتانەتەکەی پێك دەهێنن. تێگەیشتنی فەتانەتیش کاتێك مەیسەر دەبێت کە خوێندنەوەیەکی هەمەکییانەی بۆ بکرێت و بە هەموو لق و بەروبوومەکانیەوە بۆی بڕوانرێت.

## بڕگەیەك لە بەخشندەیی و سەخاوەتمەندییەکەی

ڕوویەکی تری ڕەحمەتەکەی، کە ئەویش خۆی لە خۆیدا ڕوویەکی تری فەتانەتەکەی پێك دەهێنێت، بریتیە لە سەخاوەتمەندییەکەی. ئێستاش با زیاتر بابەتەکە ڕوون بکەینەوە:

کەرەم؛ بەواتای چاکەخوازی و خەسڵەتی سەخاوەتمەندی دێت. ئەم خەسڵەتە لەناو عەرەبەکاندا خەسڵەتێکی زۆر بەربڵاو و خوازراو بووە. کاتێك دەچیتە بنج و بناوانی شیعری سەردەمی جاهیلییەوە، دەبینیت کە عەرەبی ئەو ڕۆژگارە شانازییان بەم بابەتانەوە کردووە؛ ئەوەندە مەڕ و ئەوەند چێڵ و ئەوەندە وشترمان بۆ میوانەکانمان داوە بە زەویدا و ئاوا و ئاوامان کردووە. خوان ڕازاندنەوە و خزمەتکردنی سەخاوەتمەندانەی میوان، هۆکاری خۆهەڵکێشانیان بووە و لەم ڕووەوە تیرە و هۆزەکان پێشبڕکێیان کردووە. بەڵام هەموو ئەمانە لە خۆپەرستی و خودبینیانەوە سەرچاوەی گرتبوو.

جا ئیتر لەوەها سەردەمێکدا کە بەخشندەیی و سەخاوەتمەندی تا ئەو ڕادەیە بەبرەو بوو، کەسێك لەناویاندا هەڵدەکەوێت کە بە دەست و دڵ جوانی ناسراوە و بەخشندەترینی بەخشندەکانە. هەر کە بەخشندەیی و سەخاوەتمەندی ئەویان دی، زمانی هەموویان لەگۆ کەوت. ئەم زاتە بەخشەندەیە، هەرچییەکی بکردایە تەنها لەبەر خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) دەیکرد. گەر هەموو دنیاشی ببەخشیایە بە کەسێك، بە تاکە وشەیەکیش چییە باسی نەدەکرد. بگرە شیعری ئەو شاعیرانەی قبووڵ نەدەکرد کە لە دووتوێی دەربڕینەکانیاندا بە سەخاوەتمەندی و جوامێرییەکەیدا هەڵیان دەدا. لەبری ئەوە، وەسف و پەسنەکانی دەگەڕاندەوە بۆ ئەو زاتەی کە "أكرم الأكرمين"ە و هەر خۆی بەخشندەی ڕاستەقینەیە.

پێغەمبەری پێشەوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئاوێنەیەکی درەخشانی ئەوتۆ بوو ناوی پیرۆزی "الکریم"ی خوای گەورەی تێدا دەردەوشایەوە. وەك هەموو بوارێکی تر، لەم بوارەشدا جێنشینی هەرەباڵای پەروەردگار بوو.. ئەستەمیشە لەسەر زەویدا لەو بەخشندەترت بەرچاو بکەوێت.

حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامْ) ڕێگەی بەخشندەییە و بەخشندەییش ڕێگەی

چوونە بەهەشتە. هەرچی چرووکی و ڕژدیشە کە قورئان بە(شح)[1] ناوی دەبات، ڕێگەیەکە ئادەمیزاد بەرەو دۆزەخ دەبات. تەنانەت ئەو کەسانەش کە لە دوورەوە سەرورەریان دەبینی، دەستبەجێ بە سیفاتەکانیدا دەیانناسیەوە و دەیانوت: "ئەمە خۆیەتی." ئەوەتا بیرمەندی گەورەی سەردەم بە "یاوەری ئەکرەم" ناوی دەبات. ئەو تاکە ڕابەری مرۆڤایەتی و بەم هۆیەشەوە تەنها ڕێی گەیشتنە بەهەشتە. بێ ئەوەی پرسیار لەو بکرێت، چوونە بەهەشت نییە. هەر هاوکێشەیەکیش ئەوی تێدا بەهەند وەرنەگیرابێت، هاوکێشەیەکی پارسەنگ و سەراوژێرە. حەزرەتی محمد (عَلَيهِ السَّلَام) حساب شکێنێکی ئەوتۆیە کە هەموو حساباتە مرۆییەکان دەدات بەسەر یەکدا و، حساب کەرەوەیەکی واشە کە هەموو حساباتەکان دەکاتەوە. ئێمەش دێین و یەکێك لە ناونیشانەکانی بەدیهێنەری شکۆمەندی لێ دەنێین کە "أکرم الأکرمین"ە. چونکە مرۆڤێکە بە بەخشندەییەکەی سنووری هەرچی چوارچێوەی مرۆیی هەیە تێی پەڕاندووە.. لەم بابەتەشدا ئەو تاقانە شاگردی پەروەردگاریەتی.

لە ڕێی بەخشندەییەکەیەوە چووە دڵانێکەوە کە بە ئاکارە بڵندەکانی پێشووی نەیتوانیبوو ئاوەدانیان بکاتەوە. وەك بڵێی میهرەبانیەکەی بەوێنەی پەڵەهەورێك سەرەتا هەڵماوە و بەرزبووەتەوە و، پاشانیش خەستبووەتەوە و لەشێوەی بەخشندەییدا داباریوە بەسەر بوونەوەراندا و، ڕەق و تەقییەکانی نەرم کردووە و لە هەموو جێیەکدا زەمینەی بۆ بالآکردنی نەونەمام و چرۆکان سازاندووە. واتە، بە هێمنی و شێنەییەکەی ڕۆحەکانی فەتح کردووە و بە بەخشندییەکەشی تەختی تێدا داناون. جا بۆیە ئەگەر خوێندنەوەیەکی پێکەوەیی نەبێت بۆ ئەم دوو لایەنە، ئەوا لە تێگەیشتنی ڕوویەکی گرنگی کەسایەتیی ئەو سەروەرە بێ بەش دەبین.

خۆ ئەگەر بیویستایە، دەبووە دەوڵەمەندترین کەسی دنیا. مەگەر سەرانی قوڕەیش هەر لە سەرەتاکانی ئاشکراکردنی پێغەمبەرایەتیەکەیدا بە مەرجی دەست

---

[1] بڕوانە: سورەتی النساء، ئایەتی ١٢٨؛ سورەتی التغابن، ئایەتی ٩؛ سورەتی الحشر، ئایەتی ١٦.

هەڵگرتن لە بانگەوازەکەی، پێشنیازێکی لەم جۆرەیان نەخستبووە بەردەمی؟[1] لە قۆناغەکانی دواتریشدا هەموو ئەو شتانەی موسڵمانان لە پێناوی خوادا دەیانبەخشی، بەژێر دەستی ئەودا تێدەپەڕی. ئەو دیارییانەش کە لە فەرمانڕەوا و کاربەدەستانەوە بۆی دەهاتن، لەوەدا نەبوو لە مەزەندە کردن بێن. بەڵام ئەو هەرگیز بیری لەوە نەدەکردەوە ببێت بە خاوەنی هیچ کام لەو شتانە.. نەك هەر بیری نەدەکردەوە، بگرە شتی وا هەر بە کەناری خەیاڵیشیدا تێ نەپەڕیوە.

ئەو هەردەم خۆی وەك ڕێبوارێك دەهاتە پێشچاو و بەو هەستەوە دەژیا کە لە داهاتوویەکی نزیکدا کۆچ دەکات. بە لای ئەوەوە دنیا ئەو درەختە بوو کە لە دەمی ڕێبوارییەکی دوور و درێژدا، بۆ ماوەیەکی کاتی لەژێر سێبەرەکەیدا وچان دەدرێت.[2]

کەوابوو، دەبوو لەم گەشتە دوور و درێژەدا، دڵی خۆی وابەستەی شتانێك بکات کە هەر بەڕاستی شایانی ئەوە بوون گرنگییان پێ بدرێت. هەروەها دەشبوو مرۆڤەکان شارەزای ئەو ڕێگایانە بکات کە بەرەو مرۆڤایەتی ڕاستەقینە دەیبردن. ئەوەندەی لەژێر ئەم درەختەدا دەمایەوە، دەمایەوە و دواتریش لەسەر ڕێی خۆی بەردەوام دەبوو. ئامانج و مەبەستەکە زۆر بەرز و باڵا بوو. گەیشتن بە خوای گەورە ئامانجی سەرەتا و کۆتایی بوو.. ئەرکی سەر شانیشی گەیاندنی مرۆڤەکان بوو بە هەمان ئامانج.. شەونخوونی و سووتانی ئەویش هەر بۆ ئەمە بوو. جا ئیتر دەبێ ماڵ و سامانی دنیا چ قەدر و قیمەتێکی هەبێت بۆ کەسێکی وا؟ بەدڵنیاییەوە هیچ.. "هیچ"یش ئەوە ناهێنێت دڵی پێوە وابەستە بکرێت.

ئەو لە ژیانی تایبەتی خۆیدا هەژاری هەڵبژاردبوو. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ویستبێتی هەرچی کەس هەیە بە هەژاری بژی. بەڵام ئەوەشی بەلاوە پەسەند نەبوو

١ إبن هشام، السيرة النبوية ١/١٣١، ١٣٣، جامع البيان ١٥/ ١٦٤.
٢ بخاري، رقاق ٣؛ ترمذي، زهد ٤٤؛ إبن ماجة، زهد ٣.

مرۆڤ لە ژێر باری گەدەیدا بپلیشێتەوە. ئەوەتا لە سایەی ئەو مرۆڤە مەزنەدا، موسوڵمانان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بوون بە دەوڵەمەندترین ئوممەت لە جیهاندا، تا وای لێهات لەناو خۆیاندا کەسێکیان نەدەدۆزیەوە خێری پێ بکەن یاخود زەکاتی بدەنێ. بەڵێ، داهاتی تاکە کەسی تا ئەو ئاستە بەرز بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، زاهید و دنیا نەویستی وایان تێدابوو، ئەگەر قووتی ڕۆژێکی هەبوایە، بێخەم دەیگوزەراند و هیچ شتێکی لە کەس قبووڵ نەدەکرد، ئەگەرچی سەرنج ڕاکێشیش بوایە. مەسەلەکە مەسەلەی خەمخۆری کەسانی دی و بڵندیی ڕۆحە.. مەسەلەی عەشقی ژیانە لەپێناو ژیانەوەدا.. مەسەلەی خەیاڵی وازهێنانە لە حەزەکانی ژیان. چەشتنی ئەم بەهایانەش لە لایەن کەسانێکەوە کە لێوان لێو نەبووبن لەم هەست و درکانە، بە تەنها وشەیەك: مەحاڵە.

جارێکیان لەسەر خوانی بەربانگ پەرداخێك ئاوی سارد دەخرێتە بەردەم حەزرەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه)، وەختێك پەرداخەکە دەبات بۆ دەمی، هەنسکەکانی لە گەروویدا قەتیس دەمێنن. هاوەڵانی دەوروبەری دەپرسن چی ڕوویداوە، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەفەرمووێت:

”ڕۆژێکیان لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم، وەك ئەوەی بە دەستی پاڵ بە شتێکەوە بنێت، ئاوا دەستی دەجوولاند. منیش هۆکارەکەیم پرسی. فەرمووی: ”دنیا بە هەموو جوانی و زرق و برقیەوە خۆی بۆ نمایش کردم. ویستی خۆیم لاپەسەند بکات، منیش پێم وت: ’لێم بەدوور بە!‘ ئەویش وتی: ’خۆ گەر تۆش لەدەستم دەرچیت، ئەوانەی دوای تۆ لەدەستم دەرناچن.‘ جا منیش لە ترسی ئەوە گریام بەم پەرداخە ئاوە، دنیا خۆی لا پەسەند کردبێتم.“[1]

لە کاتێکدا حەزرەتی ئەبوبەکر تا بڵێی ژیانێکی سادە و هەژارانە دەژیا. بۆیە

---

١ البزار، المسند ١/١٠٦، ١٩٦؛ حاكم، المستدرك ٣٤٤/٤؛ بيهقي، شعب الإيمان ٣٤٣/٧-٣٤٥.

لێپرسینەوەکەشی تا بڵێی سادە و ئاسان بوو. کاتێك وەك خەلیفەی موسوڵمانان دیاریکرا، تا ماوەیەکی زۆر لە ڕێی دۆشینی مەڕی خەڵکیەوە بژێوی خێزانەکەی دابین دەکرد. هەرچۆنێك بێت لەدواییدا موچەیەکیان بۆ بڕییەوە. کەچی ئەم جارە موچەکەی بەلاوە زۆر بوو. ئاستی بژێوی هەژارترین کەسی مەدینەی کردبووە پێوەر بۆ خۆی. بۆیە ئەو پارەیەی بە زیادەی دەزانی دەیخستە ناو گۆزەیەکەوە و لەوێدا کۆیدەکردەوە. بەدرێژایی دوو ساڵ و نیوی خەلافەتەکەی هەر لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو. لە دەمی گیان سپاردنیشیدا وەسیەتی کرد گۆزەکە ڕادەستی خەلیفەی دوای خۆی بکرێت. وەختێ حەزرەتی عومەر بوو بە خەلیفەی موسوڵمانان، گۆزەکەی شکاند و بینی وا پارەی تێدایە لەگەڵ نامەیەکدا. نامەکە ئاڕاستەی خەلیفەی نوێ کرابوو: "ئەم پارانە، زیادەی ئەو موچەیەیە کە بۆم بڕابووەوە. هەژارترین کەسی مەدینەم بۆخۆم کردبووە پێوەر. ئەو بڕەشی زیاد دەبوو، دەمخستە ناو ئەم گۆزەیەوە. بۆیە ئەم پارانە تایبەتە بە خەزێنەی دەوڵەت و دەبێت بخرێتەوە ئەوێ."

حەزرەتی عومەر بە خوێندنەوەی نامەکە دەستی کرد بە گریان و وتی: "ئەی ئەبابەکر، بارێکی قورست بۆ ئەوانەی دوای خۆت بەجێهێشت!"

لە ڕاستیدا حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم ژیانە زاهیدانەیە لە حەزرەتی محمدەوە (عَلَيْهِ السَّلَام) فێربووبوو. چونکە پێغەمبەری خوا لە ڕێگەی شێواز و ئەزموونی ژیانی خۆیەوە ئەوەی فێری حەزرەتی ئەبوبەکر و تێکڕای هاوەڵانی دیکەش کردبوو کە هەر بەڕاستی دەکرێ مرۆڤ بەو جۆرە بژی.

تۆ بیر بکەرەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە ڕای هەندێك لە زانایان، خاوەنی یەك لە بیست و پێنج، بە ڕای هەندێکی تریشیان یەك لە پێنجی هەموو

غەنیمەت و دەستکەوتەکان بووە، ئەمەش بە فەرمانێك لە لایەن پەروەردگارەوە.[1] واتە یەك لە پێنجی دەستکەوتەکان لەژێر دەستی خودی پێغەمبەری خوا خۆیدا بوون. خوای گەورەش دەسەڵاتی ئەوەی پێ بەخشیبوو هەرچۆنێك بیەوێت وا مامەڵەی پێوە بکات. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا دەبینین ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر دەچێتە خانەی بەختەوەرییەکەیەوە و بە بینینی حاڵی پێغەمبەری خوا هۆن هۆن فرمێسك لە چاوی دەبارێت، وەختێکیش پێغەمبەری سەروەرمان هۆکاری گریانەکەی لێ دەپرسێت، کەڵە عومەر بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:

"ئەی پێغەمبەری خوا، پاشاکانی دنیا و کیسراکان لەناو سەروەت و ساماندا مەلە دەکەن. کەچی تۆ تەنانەت ڕایەخێکیشت نییە لەژێر خۆتدا ڕایبخەیت. پێخەفەکەت حەسیرە و ئەوەش شوێنەواری حەسیرەکەیە بە لاشەتەوە.. لە کاتێکدا گەردوون لەبەر تۆ ئافرێنراوە."

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئەم وەڵامەی دەداتەوە: "ئەی عومەر، مەگەر ناتەوێ دنیا بۆ ئەوان و ئاخیرەتیش بۆ ئێمە بێت."[2]

ئەم قسانەی سەروەرمان، هەرگیز چەشنی قسەی ئەو هەزارە کەساسە کلۆڵە نییە کە توانای بنیاتنانی تەرزە ژیانێکی تری نییە بۆ خۆی و لە ناچاریدا وا دەڵێت. وەك لە سەریشەوە ئاماژەمان پێدا، ئەو ئەگەر بیویستایە، دەیتوانی ببێتە دەوڵەمەندترین کەسی دنیا. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی وێنەکە، پێم خۆشە ئەو دەستکەوتانەتان بخەمەوە یاد کە تەنها لە حونەیندا بەدەست هاتن:

٤٠٠٠٠ سەرمەڕ، ٢٤٠٠٠سە حوشتر، ٦٠٠٠ دیل و، ٤٠٠٠ هۆقە زیو.[3]

---

١ بڕوانە: سورەتی الأنفال، ئایەتی ٤١؛ طبري، جامع البيان ٩/ ١٧٥-١٧٦؛ مرغيناني، الهداية ١٤٨/٢.

٢ بخاري، تفسير (٦٦) ٢؛ مسلم، طلاق ٣٠-٣١.

٣ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٥٢/٢.

خۆ گەر دەستکەوتی جەنگەکانی دیکە و ئەو دیارییانەشی بخەینە پاڵ کە پاشایان دەیاننارد، دەردەکەوێت کە هیچ رێگرێك نەبووە لەوەی سەروەرمان بە ئاسوودەترین و خۆشگوزەرانترین شێوە بژی. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، هەژارترین و نەدارترین کەس چۆن بژیایە، ئەویش ئاوا دەژیا. ئەو شتانەشی دەهاتنە دەستی، هەر هەمووی بەسەر خەڵکیدا دەبەخشیەوە. ئاخر چونکە ئەو بەخشندەییەك بوو بەرجەستە بووبوو.. مرۆڤێکی هێندە خاوەن بەخشندەیی و سەخاوەتیش، هەر دەکرا رسول الله بێت (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)...

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نموونەی هاوسەنگترین مرۆڤی دەنواند لە روانگەی پەیوەندی نێوان ناخ و رواڵەتەوە. وەك چۆن رواڵەتی دەرەوەی رێز و شکۆی لێ دەباری و جوانییەکەی بینەرانی سەرمەست کردبوو، لە رووی جیهانی ناخیشیەوە بەو ئەندازەیە مرۆڤەکانی کەمەندکێشی خۆی کردبوو.

حەزرەتی ئەنەس دەفەرموێت: "بەراستی پێغەمبەری خوا جوانترینی مرۆڤەکان بوو."[1] بەڵێ هەروا بوو، لەرووی "سیرة"یش و "صورة"یشەوە جوانترین ئادەمیزاد بوو.

حەزرەتی جابری کوڕی سەمورە یادەوەریەکانی خۆی لەمەڕ ئەم بابەتە بەم جۆرە یاداشت دەکات: "رۆژێکیان لە مزگەوت دانیشتبووین. مانگ، چواردەشەوەی تابان بوو بەسەر سەرمانەوە پرشنگی دەدا. لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا تەشریفی هێنایە مزگەوتەوە. منیش سەیرێکی مانگم کرد و سەیرێکی رووخساری پیرۆزی پێغەمبەر، سوێند دەخۆم رووخساری پێغەمبەری خوا لە مانگ گەشتر و درەوشاوەتر بوو."[2]

---

١ بخاري، جهاد ٢٤؛ مسلم، فضائل ٤٨.
٢ دارمي، مقدمة ١٠؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٠٦/٢؛ حاكم، المستدرك ٢٠٧/٤.

دایکی ئیمانداران، حەزرەتی عائیشەی صددیقەش (رضيَ اللهُ عَنْها) یەکێك لە هەستەکانی خۆی بەم جۆرە دەردەبڕێت: "ژنگەلی میسری بە دیتنی یوسف دەست و پەنجەی خۆیان بڕی.. خۆ گەر گەورەی منیان دیتبا، بە چەقۆی دەستیان سینەی خۆیان دەدڕی."

نەدیمی شاعیر لە وەسفی ئەستەمبووڵدا دەڵێت: "یەکپارچە موڵکی عەجەم فیدای سەنگێکی ئەستەمبووڵ بێت." خۆ ئەگەر بەباشی پێغەمبەری خوای بناسیایە، ئەو کات دەیوت: "هەموو دنیا فیدای تاڵە موویەکی رسول الله بێت."

ئەو جوانترینی مرۆڤەکان بوو.. حەزرەتی ئەنەس بەردەوام دەبێت لە قسەکانی: "بەخشندەترینی مرۆڤەکان بوو."[1] رسول الله کە لە ڕووی ڕواڵەت و جەماڵەوە "أحسن الناس" (جوانترین مرۆڤ) بوو، لە ڕووی دڵ و ئیرادەیشەوە "أجود الناس" (بەخشندەترین مرۆڤ)بوو.

وەك ئیبن عەباس دەڵێت، بە تایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا، وەك ئەو بایەی لێ دەهات کە هەرچی شتی سەر ڕێی هەیە پێش خۆی دەدا و دەیبا.[2] واتە ئەوەی لە دەستیدا بمایاتەوە دەیبەخشی. لە ڕاستیدا ئەمە بابەتێك بوو پەیوەندی بە ڕۆح و ئیرادەوە هەبوو. ئەو هەرگیز بۆ خۆی نەدەژیا، بەڵکو هەردەم لە پێناو غەیری خۆیدا دەژیا. لەتاو بەردەوام بیرکردنەوە و بەتەنگەوە بوونی بەختەوەری کەسانی تر، بەدرێژایی ژیانی دەرفەتی ئەوەی نەبووە بیر لە خۆی بکاتەوە. هیچ چێژ و خۆشییەکیش نەبوو هێندەی ئەوە دڵخۆش و کامەرانی بکات کە خەڵکی بەکامەرانی ببینێت. لە خەمخۆرییەکەشیدا خانەوادە و نزیکەکانی خۆی لە دوای دواوە بوون. واتە سەرەتا لەو کەسانەوە دەستی پێ دەکرد کە لێیەوە دوور بوون، بەدەمیانەوە دەچوو و گرنگی پێدەدان، لە کۆتاییشدا نۆرە دەهاتە سەر نزیکەکانی خۆی.

١ بخاري، جهاد ٢٤؛ مسلم، فضائل ٤٨.
٢ بخاري، صوم ٧؛ مسلم، فضائل ٥٠.

گریمان گەر دەستکەوت دابەش بکرایە، ئەوا دەچوو خێزانی شەهیدانی بەدر و ئوحودی پێشدەخست و لەوانەوە دەستی پێ دەکرد. زوو زوو بە ئەندامانی خێزانەکەی دەفەرموو: "تا بەشی ئەوان نەدەم، هیچ شتێك نادەم بە ئێوە."[1]

دیسانەوە هێمنی و سینە فراوانییەکەی.. بەڵێ، زۆرێك لەو دڵە داخراوانەی بە کلیلی هێمنی و سینەفراوانی و هەستە باڵاکانی دیکەی نەکرانەوە، بە کلیلی بەخشندەیی و سەخاوەتمەندی کرانەوە بۆی. صەفوانی کوڕی ئومەیە یەکێکە لەوانە:

کاتێك پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) چوو بۆ غەزای حونەین، بە قەرز چەکی لای ئەم پیاوە بردبوو. پاش کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی جەنگ، صەفوان بەوپەڕی تامەزرۆییەوە چاوی بڕیبووە دەستکەوتەکان. ئەم حاڵەتەی صەفوان بەسەر چاوی وردبینی پێغەمبەری خوادا تێ نەپەڕی، بۆیە پێی فەرموو: "بڕوانە، ئەو وشترانەی وا تەماشایان دەکەیت،گەر دڵت پێیانەوەیە، بیانبە بۆخۆت." پاشان چەندین شتی تریشی پێدا. صەفوان لە هەمبەر ئەم بەخشندەییەدا حەپەسابوو. ئەو پیاوەی کەوا دوژمنی دڵ پڕلەقینی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بوو، بەجارێ گۆڕا و بوو بە کەسێکی تر. بەڵێ، بەخشندەیی پێغەمبەری خوا صەفوانی لە ڕق و کینەکەی دوورخستەوە و وای کرد سەروەری هەردوو جیهان ببێت بە خۆشەویسترین کەس لە لای. بە دڵنیاییەوە بەدەستهێنانی صەفوان لە هەزاران وشتر و ڕەشەوڵاخ گرنگتر بوو. پێغەمبەری خواش بەوەیان هەستا کە گرنگترین بوو. جێی باسە ئەم کەرەم و بەخشندەییە، بە بادی هەوا نەچوو. ئەوەبوو صەفوان شەربەتی شایەتمانی نۆشی و موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند و ئەم وشانەی بە زاردا هات: "بەخشندەیی بەم ئەندازەیە، هەر لە پێغەمبەر دەوەشێتەوە."[2]

---

١ أبو داود، خراج ١٩، الأدب ٩٩.
٢ واقدي، مغازي ٢/٨٥٤-٨٥٥؛ إبن عساكر، تأريخ دمشق ١١٤/٢٤. بەدەر لەمەش، بڕوانە:

ئەگەر داوای شتێکی لێ بکرایە، هەیبووایە دەیبەخشی، نەشیبووایە بەڵێنی دەدا بە بەخشینی. هەندێ جار کەسی وا هەڵدەکەوت داوای کراسەکەی بەریشی دەکرد، ئەویش بێ دوودڵی دەیدایێ.

جارێکیان پیاوێك هات و داوای شتێکی لێکرد، پێغەمبەری خواش پێی بەخشی، پاشان کەسێکی تر هات و ئەویش داوای شتێکی کرد، دەستی نەنا بەڕوویەوە و داواکەی ئەویشی هێنایەجێ، بەڵام کاتێك کەسێکی تر هات و داوای شتی کرد، ئەمجارەیان پێغەمبەری خوا بەڵێنی دا، چونکە لە دەستیدا شتێك نەمابوو تا بیبەخشێ. بەڵێنیش بەو واتایە دەهات کە ئەگەر شتێکی هاتە دەست، ئەوا لە یەکەم دەرفەتدا دەیدا بەو کەسە. ئەم بارودۆخە حەزرەتی عومەری لەڕادەبەدەر نیگەران کردبوو، پێی خۆش نەبوو پێغەمبەری خوا بەو شێوەیە بێزار بکرێت. بۆیە لەسەرچۆك وەستا و وتی: سُئِلْتَ فَأَعْطَيْتَ ثُمَّ سُئِلْتَ فَأَعْطَيْتَ ثُمَّ سُئِلْتَ فوَعَدْتَ "داوات لێکرا، تۆش بەخشیت، جارێکی تر داوات لێکرا، دیسانەوە تۆش بەخشیت. جارێکی تریش داوات لێکرا، ئەمجارەیان بەڵێنت دا." واتە؛ ئەوەندە خۆت مەخەرە نارەحەتییەوە ئەی پێغەمبەری خوا! بەڵام وا دیار بوو ئەم قسانە مایەی خۆشحاڵیی پێغەمبەری خوا نەبوون. بۆیە کە عبداللهی کوڕی حوذافەتوسسەهمی زانی پێغەمبەری خوا (صَلَّىَاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) کەمێك ناوچاوی داوە بەیەکدا، هەستایە سەرپێ و دڵنەوایی کرد و وتی: أَنْفِقْ يَا رَسُولَ اللهِ! وَلَا تَخْشَ مِنْ ذِيْ الْعَرْشِ إِقْلَالاً "ببەخشە ئەی پێغەمبەری خوا، نەکەی گومان بەریت کەوا پەروەردگار هەژارت دەخات و نیعمەتەکانیت لێ دەگرێتەوە!" سەرووەری هەردوو جیهان بۆماوەیەك بێدەنگ مایەوە، پاشان فەرمووی: بِذَلِكَ أُمِرْتُ "دەی منیش هەر بەوە فەرمانم پێکراوە."[١٤٤]

---

مسلم، فضائل ٥٩؛ ترمذي، زكاة ٣٠.
١ ترمذي، شمائل ٢٩٤؛ طبري، تهزيب الآثار ١/٥٤.

فەرەزدەق چەند خۆش وتوویەتی:

مَا قَالَ لَا قَطُّ إِلَّا فِي تَشَهُّدِهِ    لَوْلَا التَّشَهُّدُ كَانَتْ لَاؤُهُ نَعَمُ

"بەدەر لە شایەتمان وشەی "نەخێر"ی بە دەمدا نەهاتووە.

گەر شایەتمان نەبوایە، "نەخێر"ەکەشی بەڵێ دەبوو."

جا ئیتر ئەو نازدارە تا ئەو ئاستە لەگەڵ "بەڵێ"کاندا یەکانگیر بووبوو. لە سنووری بازنەی شەرعدا هەرشتێکی لێ داوا بکرایە، دەستبەجێ بەدەمیەوە دەهات و داوای داواکاری دەهێنایە جێ.

بەڵێ، سوڵتانی پێغەمبەران (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە بەخشندەیی و سەخاوەتیشدا وێنەی نەبوو، دانسقە و بێ هاوتا بوو.. بەخشندەییش بەو ڕادەیە، پێغەمبەرایەتی نەبێت، هیچ شتێکی دیکە ڕوونی ناکاتەوە.

ئینجا ئەگەر بەخشندەیی ئاکارێك بێت بەندە لە پەروەردگاری نزیك بخاتەوە، ئیتر چۆن پێغەمبەری خوا بەخشندە نابێت، لە کاتێکدا لە مەسەلەی نزیکی لە پەروەردگارەوە، تەنانەت جوبرەئیلیشی لەدواوە جێهێشتووە...

لە ڕاستیدا خۆیشی هەروای دەفەرموو:

اَلسَّخِيُّ قَرِيبٌ مِنَ اللهِ قَرِيبٌ مِنَ الجَنَّةِ قَرِيبٌ مِنَ النَّاسِ بَعِيدٌ مِنَ النَّار

وَالْبَخِيلُ بَعِيدٌ مِنَ اللهِ بَعِيدٌ مِنَ الجَنَّةِ بَعِيدٌ مِنَ النَّاسِ قَرِيبٌ مِنَ النَّار

"مرۆڤی بەخشندە و دەست و دڵ کراوە، لە خوا و بەهەشت و مرۆڤەکانەوە نزیکە و لە دۆزەخیشەوە دوور. هەرچی مرۆڤی ڕژد و دەست نووقاویشە، لە خوا و بەهەشت و مرۆڤەکانەوە دوورە و لە دۆزەخیشەوە نزیك."[١]

١ ترمذي، البر ٤٠؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٧/٣.

سەرچاوەکان بە جۆرێکی وا وێنای درەختی طوبا دەکەن کە گوایە ڕەگەکەی لەسەرەوەیە و لق و پەلەکانیشی لە خوارەوە. جا ئایا هەر بەڕاستی درەختی طوبا بەو جۆرەیە؟! نازانم. بەڵام ئەوەندە دەزانم کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) درەختێکی بەخشندەیی و سەخاوەتی لەو جۆرەیە، لە بەهەشتەوە شۆڕبووەتەوە و پەلی کێشاوە بەسەرماندا، بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش گومانمان لەمە نییە. ئەوەی پەنای بۆ دەبات و دەستی خۆی دەگەیەنێتە لقەکانی، وەك قومری لێدێت و بەرەو بەهەشت لەشەقەی باڵ دەدات.

هەر سەبارەت بەمە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّ اللهَ قَدِ اخْتَارَ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِيناً

فَأَحْسِنُوا صُحْبَةَ الْإِسْلَامِ بِالسَّخَاءِ وَحُسْنِ الْخُلُقِ

"ئەی خەڵکینە! خوای گەورە ئیسلامی وەك دین بۆ هەڵبژاردوون. کەوابوو، ئێوەش بە سەخاوەتمەندی و ڕەوشت جوانی هاوەڵێتان لەگەڵ ئیسلام بڕازێننەوە."[1]

ئیسلام لەسەر خولگەی ڕەوشت جوانی و بەخشندەیی ڕێ دەکات. با بڵێین ئەگەر هیچ تایبەتمەندییەکیشتان نەبێت لەو تایبەتمەندییانەی تەوەرەی کەماڵاتن، ئێوە دیسانەوە دەتوانن بە ڕەوشت جوانی لوتکەکان ئاوەدان بکەنەوە. بەخشندەیی و سەخاوەتمەندیش یەکێکە لە ڕێساکانی ئەو ڕەوشتە. "بە ڕەوشتی جوان و بەخشندەیی دینەکەتان بڕازێننەوە! چونکە بەخشندەیی وەك درەختێك وایە ڕەگەکەی لەبەهەشتە و پەلەکانیشی بە دنیادا شۆڕبوونەتەوە. هەرکەسێ لەژێر ئەو درەختەدا بژی و بەخشندانە هەڵسوکەوت بکات، زوو بێت یان درەنگ، دەستی لە یەکێك لە

١ ابن عساكر، تاريخ دمشق ٥٠/٢٨٩.

لقەکانی گیر دەبێت و بەرەو ئەو بەهەشتە بەرز دەبێتەوە کە ڕەگی ئەم درەختەی لێیە."[1]

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر ڕژدی و دەست نووقاوی جۆرێك بێت لە جۆرەکانی ناهاوسەنگی و کورتبڕی، ئەوا دەست بڵاویش جۆرێکە لە زیادەڕەوی... هەردووکیشیان جۆرێکن لە ناهاوسەنگی. لەملاشەوە فەتانەتی پێغەمبەرانە دێت و سەخاوەتمەندی و بەخشندەیی لەپێناو بڵند کردنەوەی ئاییندا بەکاردەهێنێت. وەك چۆن لە ڕێی میهرەبانی و نەرمونیانییەکەیەوە چووە ناو دڵانەوە، هەر بەو جۆرە، لەڕێی بەکارهێنانی ئەو نیعمەتانەی خوای گەورە پێی بەخشیبوو، چووە ناو دڵانەوە و ژەنگاویترینی ئەو دڵانەی کردەوە کە هەرگیز گومانی کرانەوەیان نەکراوە.

دایکمان حەزرەتی خەدیجە (رَضِيَ اللهُ عَنْها)، ئەو کەڵە ئافرەتەی چاوی بە گزنگی ئیسلام هەڵهێنا! خەدیجە لە ڕووی زمانەوانییەوە بە واتای "زوو لەدایك بوو" دێت. پازدە ساڵ پێش سەروەرمان لەدایك بووە و پێش هەموو کەسیش هاتووەتە ناو ئیسلامەوە. جا وەك دەبینن، تەوافوقێکی سەیری نێوان (ناو و ناولێنراو)ی لەم جۆرە لە ژیانی دایکە خەدیجەدا هەیە. ئەم ئافرەتەی کە لە هەرە دەوڵەمەندەکانی مەککە بوو، هەموو سەروەت و سامانەکەی لەپێناو خوا و پێغەمبەرەکەیدا خەرج کرد.. بە جۆرێك کاتێ گیانی سپارد ڕەنگە ئەوەندەی نەبووبێت تەنانەت پارچەیەك خامیشی پێ بکرێت. پێدەچێت پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە قەرز کفنی بۆ کڕیبێت. پێشم وایە گونجاوترین شێوەی مردن، هەروەها حاڵەتی دوای مردن، بۆ ئەو ئافرەتە مەزنە هەر دەبووایە وا بووایە. لە کاتێکدا پێش موسوڵمان بوونی، لە دەوڵەمەندیدا بە ئەنگوست ئاماژەی بۆ دەکرا. ئەو سەروەتە زەبەلاحە، تا دوا قڕووشی لەپێناو شەکاندنەوەی بەیداخی ئیسلامدا سەرفکرا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نموونەیەکی تری "صِراطَ المُستَقيم" بوو. پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەخشندەییەکەی بە

١ إبن عساكر، تاريخ دمشق ٢٨٩/٥٠.

فەتانەتێکی وەهاوە بەکارهێنا، گەردیلەیەك چییە لە بەخشندەییەکەی بەخۆڕایی نەرۆشت و دەرەنجام وەك هێز گەڕایەوە بۆ ئیسلام..

## خاکی بوونەکەی

خۆبەکەم گرتن و خاکی بوونەکەشی وەك ڕەهەندێکی تری فەتانەتەکەی، بەوێنەی ئەستێرە دەدرەوشێتەوە. هەتا ناوبانگی دەربکردایە و خەڵکی زیاتر ڕوویان تێ بکردایە، ئەو لە دەریای مەحوییەت و خاکی بوونیدا قووڵتر دەبووەوە. دەتوت مەحوییەت و خاکی بوون لەگەڵیدا لەدایك بوون و پێکەوە چاویان بەدنیا هەڵهێناوە... تا کۆتایی تەمەنیشی ئەم خەسڵەتەی هەر لە گەشە و بەردەوامیدا بوو. ئەو کەسەی فەرموویەتی: مَنْ تَوَاضَعَ لِلهِ رَفَعَهُ اللهُ "کێ لە بەرامبەر خوای گەورەدا تەوازوع بنوێنێت، خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە."[1] و ناوەڕۆکی فەرمایشتەکەشی بەجوانترین شێوە پەیکەڵ کردووە حەزرەتی محمد المصطفى یە (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

هەمیشە خۆی بە یەکێك لە خەڵکی زانیوە و هیچ کاتیش خۆی لەوان جیا نەکردووەتەوە. وتەیەکی بەپێز هەیە کە دەدرێتە پاڵ حەزرەتی عەلی و تیایدا دەڵێت: كُنْ عِنْدَ النَّاسِ فَرْداً مِنَ النَّاسِ "لەنێو خەڵکیدا یەکێك بە لەو خەڵکە." بۆیە دەبینین پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەموو کات پەیڕەوی ئەم بنەمایەی کردووە و لەڕادەبەدەر بایەخی داوە بەوەی وەك هەر تاکێکی ئاسایی ناو کۆمەڵ بێت.

بەڵێ، نابێت پلەوپایە دنیاییەکان مرۆڤ لەخۆی بایی بکەن و خۆیی لەبیر بەرنەوە. جاری وایە مرۆڤ پاشایە، جاری واشە پاسەوانی هەرد. خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم دوو جیاوازییەش بریتییە لە مرۆڤ بوون. کەوابوو چۆنیەتی ئەو

---

[1] مسلم، البر ٦٩؛ ترمذي، البر ٨٢؛ بزار، المسند ١٦١/٣؛ طبراني، المجمع الأوسط ١٤٠/٥.
(دەقی فەرموودەکە لە "مجمع الأوسط"ەوە وەرگیراوە.)

بەرپرسیارێتییەی مرۆڤ لە ئەستۆی دەگرێت، نابێتە هۆکاری ئەوەی ئەو مرۆڤە بگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی تر. هەر بۆیە دەبێت مرۆڤ لە هەموو زەمینە و زەمەنێکدا خۆی بە تاکێکی ئاسایی ناو کۆمەڵ بزانێت.

ئەگەر بێتو ئەو سیستەمەی بە دیموکراسی ناودەبرێت، لوتکەی ئەو سیستەمانە بێت کە وان لەسەر زەوی -وەك چۆن هەندێك وای دەبینن- ئەوا ئیسلام، بگرە بە چەندین سەدە پێشتر، بەیداخی خۆی لەو لوتکەیەدا هەڵداوە. لەگەڵ ئەمەشدا ناتوانین بڵێین ئیسلام بەتەواوەتی سیستەمێکی دیموکراسییە.

ئێستاش چەند بڕگەیەك دەخەینە پێش چاو کە کامڵیی ئەم سیستەمە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پیشان دەدات:

جارێکیان حەزرەتی عەلی (رضي الله عنه) لەگەڵ یەکێك لەئەهلی "ذمة" کێشەیەك دەکەوێتە نێوانیانەوە و بە مەبەستی یەکلایی کردنەوەی دەچنە دادگا. "شورەیح"ی دادوەر ئاماژە دەکات حەزرەتی عەلی دابنیشێت. بەڵام حەزرەتی عەلی ناخۆشحاڵی خۆی بەرامبەر ئەم گرنگی پێدانە دەردەبڕێت. چونکە دەبوو لەگەڵ لایەنی دووەمی کێشەکەدا لە هەمان هەلومەرج و بارودۆخدا بێت. جا ئێستا بیهێننە پێشچاوی خۆتان: ئەو ڕۆژەی حەزرەتی عەلی ئەم هەڵوێستە دەنوێنێت، خەلیفەی دەوڵەتێکی مەزن، واتە سەرۆکی وڵاتێك بووە.[1]

پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) ئاوێتەی ژیان بووبوو و بووبووە مرۆڤێکی فیترەتناس. زۆرجار ئەوانەی یەکەم جاریان بوو بێنە ناو کۆڕەکەیەوە، نەیاندەزانی کامەیان پێغەمبەرە؛ مەگەر ئەوەی لەڕێی ڕەفتاری هاوەڵە بەڕێزەکانەوە، یاخود کاتێك دەستی دەکرد بە قسە بیانزانیایە کە ئەو پێغەمبەری خوایە (عليه أفضل الصلاة وأتم التسليم).

---

١ إبن عساكر، تأريخ دمشق ٢٣/٢٣-٢٤، ٤٨٧/٤٢.

لە کاتی هیجرەتدا، زۆرێك لەو خەڵکەی مەدینە کە تا ئەو کاتە بە دیداری پێغەمبەری خوا نەگەیشتبوون، بەرەو حەزرەتی ئەبوبەکر دابوویانە پرتاو تاکو دەستی ماچ بکەن. واتە وایان دەزانی ئەو پێغەمبەری خوایە. بەڵام کاتێك حەزرەتی ئەبوبەکر هەستا و بە عەباکەی سێبەری بۆ سەروەرمان کرد، ئیتر ئەو کات زانرا پێغەمبەری خوا کێیە.[1] بەڵێ بەم شێوەیە بوو، چونکە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕەفتارێکی وای نەدەنواند کە لە ئەبوبەکر جیای بکاتەوە.

ئەو خاکی بوون و خۆ بەکەم گرتنەشی کە لە کاتی فەتحی مەککەدا نواندی، تابلۆیەکە لەوپەڕی بێ وێنەییدا.. ئەوەبوو بەسەر وشترەکەیەوە ئەوەندە چەمابووەوە، وەخت بوو سەری بدات لە پشتی ئاژەڵەکەی. جا ئیتر ئەو پێغەمبەرە شکۆمەندە، بەو ڕۆحیەتە پڕتەوازوعەوە چووە ناو ئەو شارە پڕ شان و شکۆیەوە.[2]

لە فەرموودەیەکدا کە لە لایەن زۆرێك لە هاوەڵانەوە، لە پێشەکیشیاندا دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشەوە ڕیوایەت کراوە، دەگێڕنەوە کە: "پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەماڵەوە وەك هەر ئەندامێکی تری خێزان مامەڵەی دەکرد؛ خۆی جلەکانی پینە دەکرد و خۆیشی خەریکی پێڵاوەکانی دەبوو. لە کاروباری ناو ماڵیشدا یارمەتی خێزانەکانی دەدا."[3] لەو کاتەدا کە بەم کارانە هەڵدەستا، لە هەموو لایەکی دنیادا یادی دەکرا و باس بووبووە باسی خۆی و دینەکەی. ئەوەندە کارزانانە کاتی خۆی ڕێکخستبوو، لە نێوەندی ئەو هەموو بەرپرسیارێتییە گرنگەی سەرشانیدا، دەرفەتی ڕاپەڕاندنی ئەو جۆرە کارانەشی دەڕەخساند. بەڕاستی شایانی ئەوە بوو لەسەر لوتکەی هەموو خەسڵەتێکی جوان دابنیشێت. هەر واش بوو...

---

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٢٠/٣، تاريخ الأمم والملوك ١٢٠/٦.
٢ بڕوانە: إبن هشام، السيرة النبوية ٦٣/٥؛ أبو يعلاء، المسند ١٢٠/٦.
٣ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/٦؛ ترمذي، شمائل ٢٨٣٧.

## لەناو خەڵکدا بوو

نیشانەی گەورەیی لە گەورەکاندا خاکێتییە. نیشانەی بچووکیش خۆ بەگەورەزانینە. پێغەمبەری خواش (صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) گەورەترین کەسی نێو گرۆی ئادەمییە. کەوابێت دەبوو خاکێتییەکەشی هەر وا بوایە.

ئەو پێغەمبەری خوایەی کە؛ لە بنیاتنانی مزگەوتی مەدینەدا وەك هەموان خشتی هەڵدەگرت و،[1] لە هەڵکەندنی خەندەقیشدا کاتێك هەرکەسەو بەردێکی لە سکی پێچابوو، ئەم دوو بەردی بە سکیەوە پێچابوو و،[2] بەو پیاوەی کە لەتاو هەیبەتیدا دەلەرزی، فەرمووی: "براکەم مەترسە، منیش هەروەك تۆ مرۆڤێکم کە دایکی نانە وشکەی خواردووە."[3] بێ هیچ گومانێك خاکیترینی مرۆڤەکان بوو.

ئەو کەسانەی لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا وەك هێمایەك بۆ گەورەییان قاچ دەخەنە سەر قاچ و بەو شێوەیە دادەنیشن، لە ڕاستیدا دڵنیا نیم لەوەی ئەم حاڵەتەیان لە چ لقێکی دەروونزانی ڕۆحیدا لەگەڵ شێتییدا یەکدەگرێتەوە، بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام ئەوەیە کە لە ڕووی لایەنی ڕۆحییانەوە ناتەواوییەکی گەورەیان هەیە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِأَفْضَلُصَلَاةٍوَسَلَامٍ) وەك کەسێکی ئاسایی دادەنیشت و وەك کەسێکی ئاساییش هەڵسوکەوتی دەکرد. بەڵێ، هەموو جموجووڵێکی لە بازنەی ئەدەبێکی دیاریکراودا بوو. مەزنی خۆیشی بەوە پیشان دەدا کە سەری لە سەر زەوی بێت و ناوچەوانی لە بەرماڵەکەی بسووێت.

مَنْ تَوَاضَعَ لِلّٰهِ رَفَعَهُ اللّٰهُ وَمَنْ تَكَبَّرَ وَضَعَهُ اللّٰهُ "کێ لەبەر خوای گەورە بێ فیزی بنوێنێ، خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە. هەر کەسیش خۆی بەگەورە بزانێت، خوای

1 أحمد بن حنبل، المسند ٣٨١/٢.
2 ترمذي، زهد ٣٩؛ طبري، تهذيب الآثار ٢٧٤/١.
3 إبن ماجة، أطعمة ٣٠.

گەورە پۆزی دەشکێنێت."[1]

خاکێتی و خۆبەکەم گرتن وەك دوو باڵن بۆ مرۆڤ، کە بەرەو کەشکەشان دەیخەنە پەرواز. پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە سایەی تەوازوعەکەیدا ئاستەنگە سەرکەشەکانی بڕی و بۆ هەتا هەتایە بوو بە پێشەوای مرۆڤایەتی. خەڵکی زۆر بە ئاسانی دەچوونە دیدەنی ئەو پێشەوا نایابەی کە ڕەهەندە تەسکەکانی کات و شوێنی تەی کردبوو و، هەر بەو ئاسانییەش ئەوەی دەیان ویست عەرزیان دەکرد. چونکە خۆیشی هەروا کەسێکی مامەڵە ئاسایی بوو.

ئیمامی موسلیم و ئەبوداود بۆمان دەگێڕنەوە: "ڕۆژێکیان ئافرەتێك کە ژیریی تەواو نەبوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و پێی وت: 'ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم پێتە.' پێغەمبەری خواش لەگەڵیدا چووە کەنارێکی ڕێگەکەوە و گوێی بۆ گرفتەکەی گرت و بۆشی چارەسەرکرد."[2]

بەگوێرەی ئەو ڕیوایەتەش کە ئیمامی بوخاری لە حەزرەتی ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە، جارییەیەك دێت و قۆڵی پێغەمبەری خوا دەگرێت و ڕای دەکێشێت، دەیەوێت کارێکی بۆ ڕاپەڕێنێت. سەروەریشمان بەوپەڕی سادەییەوە و بێ ئەوەی ئەم ڕەفتارەی بەلاوە گران بێت، لەگەڵیدا دەڕوات و یارمەتی دەدات و دەگەڕێتەوە.[3]

لەوانەیە ئەو کارە، گسك دانی ناومالٚ یان گوشینی جلێکی شۆرراو بوو بێت، کارەکە هەر چییەك بووایە، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) جێبەجێی دەکرد. چونکە ئەو مرۆڤێکی فیترەتناس بوو و ئەم کارەشی هەرگیز زەلیلی نەبوو. تەنانەت زەلیلی نەیتوانیوە بچێتە خەویشیەوە. ئاخر چۆن دەچێت، لە کاتێکدا بەرامبەر کوفر

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٧٦/٣؛ طبراني، المجمع الأوسط. ١٤٠/٥. (دەقی فەرموودەکە لە "مجمع الأوسط"ەوە وەرگیراوە.)
٢ مسلم، فضائل ٧٦؛ أبو داود، الأدب ١٢.
٣ بخاري، الأدب ٦١؛ إبن ماجة، زهد ١٦.

و گومڕایی هەروەك شێری هەڵمەتبەر وابوو. وەك لە سەریشەوە وتمان، دلێرترین و ئازاترینی مرۆڤەکان بوو. ئەوەتا حەزرەتی عەلی دەفەرموێت: "کاتێك لە مەیدانی جەنگدا ترسمان لێ دەنیشت، خۆمان دەدایە پەنا پێغەمبەری خوا و خۆمان بەو دەپاراست."[1] کاریگەری دڵنیایی و ئارامبەخشییەکەی تەنها بۆ خۆی نەبوو، بەڵکو دەوروبەرەکەشی گرتبووەوە. کەوابێ، گەر مرۆڤێکی ئاوا خاکی بوونێکی لەم جۆرە بنوێنێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەمە لە خاکیبوونەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە.

## سادەییەکەی

وەك چۆن خاکێتی زەلیلی نییە، خۆبەزلزانیش ویقار و شکۆمەندی نییە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) خاکێتییەکەشی بە ئەندازە و هاوسەنگییەکی ڕەها بووە. بەڵێ، ئەم سیفەتەشی وامان لێ دەکات پڕبەدەم بڵێین "مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ".

بۆ نموونە؛ دادوەر دەبێت لە دادگادا کەسێکی جددی بێت، ئەم جددی بوونەش ویقار و سەنگینییە. بەڵام ئەگەر لەماڵەوە هەمان مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیدا بکات، ئەوکات دەبێتە فیز و خۆ بەزل زانی. چونکە دەبێت مرۆڤ لە ماڵی خۆیدا وەك هەر ئەندامێکی تری خێزانەکەی هەڵسوکەوت بکات. هەریەکە لەمانە دەستووری قورئانین و باشترین جێبەجێکاریشیان پێغەمبەری خوایە (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). ئەوانەش کە لەدوای خۆی پەیڕەویی لە هەمان دەستوور دەکەن، ئەوە جگە لە گوێڕایەڵی و جێ پێ هەڵگرتنی ئەو، هیچی نوێیان ئەنجام نەداوە.

هەریەك لە ئێمە دەتوانێت ئەو لە هەموو کەس بەگەورەتر بزانێت، کەچی ئەو خۆی دەفەرموێت: "هیچ کەس ناتوانێت بە کرداری خۆی بچێتە بەهەشت."

---

1 إبن الجعد، مسند ٣٧٢٧؛ أبو يعلاء، مسند ٢٥٨/١؛ حاكم، المستدرك ١٥٥/٢.

هاوەڵان دەپرسن: "تەنانەت تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟" ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت: "بەڵێ، تەنانەت منیش... مەگەر خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی بمگرێتەوە."[1]

بەڵێ، ئەوەندە مرۆڤێکی سروشتی بوو کە ئەم قسەیە بکات. خۆی بە تاکێکی ناو کۆمەڵ و بەشێك لە خەڵك دەزانی، هەڵسوکەوتەکانیشی لە ژێر ڕۆشنایی ئەم تێڕوانینەدا دارِشتبوو.

ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر هات بۆ خزمەتی و داوای مۆڵەتی لێ کرد تا بڕوات بۆ عەمرە. بەڵێ، تەنانەت بۆ عەمرەش مۆڵەتی لێ وەردەگیرا. ئاخر چونکە هاوەڵان کەسانێکی ڕێسا پارێز بوون. لە هەموو کاروبار و کێشەیەکیاندا، خێرا خۆیان دەگەیاندە خزمەتی و عەرزی حاڵی خۆیان دەبردە لای. ئەو کەسەی کیژەکەی وادەی هاوسەرگیری بهاتایە، دەهاتە خزمەتی و دەیوت : "ئەی پێغەمبەری خوا، کچێکم هەیە. گەر کەسێك هەیە و دەتانەوێت کچەکەم هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، ئەوا ئەمر بفەرموون." یەکێکی تر گەر بیویستایە باخ و بێستانەکەی وەقف بکات، لەپێشدا دەهاتە حوزووری و عەرزی حاڵی خۆی لای پێغەمبەری خوا دەکرد. ئەوانەش دەیانویست بچنە ئیعتیکافەوە، یاخود بەنیازی گەشت بوون، هەمیشە دەهاتنە خزمەتی و مۆڵەتیان لێ دەخواست. دەی وا ئێستا حەزرەتی عومەریش هاتووە و داوای مۆڵەت دەکات بۆ عەمرە. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نەك داواکەی نەگێڕایەوە، بەڵکو شتێکی واشی لێ داواکرد کە حەزرەتی عومەری خستە ژێر کاریگەرییەکەوە تا کۆتایی ژیانیشی هەر جۆش و خرۆشی پێ دەبەخشی. ئەوەبوو پێی فەرموو: يَا أُخَيَّ أَشْرِكْنَا فِي دُعَائِكَ وَلَا تَنْسَنَا "برالە، لە دوعاکانتدا ئێمەش بەشدار بکە و لەبیرمان مەکە."[2] لە ساڵانی دواتردا حەزرەتی عومەر

١ بخاري، رقاق ١٨، مسلم، صفات المنافقين ٧١-٧٨.
٢ ترمذي، دعوات ١٠٩؛ أبو داود، وتر ٢٣.

سەبارەت بەو ڕۆژە دەیوت: "گەر ئەو ڕۆژە هەموو دنیا هی من بوایە، ئەوەندە دڵخۆش نەدەبووم."[1]

## خاکێتییەکەی و ڕەهەندی بەندایەتییەکەی

ئەو خاکی بوون و خۆ بەکەم گرتنەی لەودا هەبوو، جارێکی تر ئەو دڵ و دەروونانەی فەتح دەکردەوە کە پێشتر فەتحی کردبوون. ئیتر ئەویش لە سایەی ئەم فەتحانەدا، دەستی ئوممەتەکەیی دەگرت و لەڕێی چەندین حەلەزۆنی نوورانییەوە بەرەو لوتکەکانی جیهانی ڕۆح بەرزی دەکردنەوە. ئەوەتا حەزرەتی عومەر، هەر بە یەکەم هەنگاوی، ئەو مەودایەی بڕی کە دەبوایە بیبڕیایە. بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەیویست بەرەو سەروتر و سەروتر بەرزیان بکاتەوە، هەر واشی کرد. ئەوەبوو لە کۆمەڵگەیەکی دەشتەکییەوە، کۆمەڵێکی مامۆستا و ڕابەری هێنایە کایەوە. هاودەم لەگەڵ بەرز کردنەوەیان بەرەو لوتکەکان، خۆیشی بەستوونی لە بەرز بوونەوەدا بوو. کەچی تاکە شتێك ڕاستەوانە لەگەڵ ئەم قۆناغ بڕییەیدا زیادی کردبێت، خاکێتی و بێ فیزییەکەی بوو. هەرچی ئەو ڕووەشە کە بەسەر نەفسیدا دەیڕوانی، تەژی بوو بەو هەستەی کە خۆی بە بەندەیەك لە بەندەکانی خوا ببینێت.

سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی فەرمووده دەگێڕنەوە کە:

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامْ) لەگەڵ جوبرەئیل دانیشتبوو گفتوگۆی دەکرد. دەبێ چەند ڕۆژ تێپەڕیبێت و پاروویەکی بۆ دەمی نەبردبێت. جوبرەئیل ڕاستگۆترین دۆستی بوو. لە ڕیوایەتێکی لاوازدا هاتووە کە بە پێغەمبەری خوای وتووە: "لەدوای تۆ، تەنها چەند جارێك دادەبەزمە سەر زەوی." چونکە دنیایەك

---

١ أحمد بن حنبل، المسند ٢٩/١.

حەزرەتی موحەممەدی تیا نەبێت، بۆ جوبرەئیلیش پرپەتی لە ئازاری جودایی. (بۆ ئێمەش هەر وایە، ئەوەتا ساڵەهایە بە ئازاری جوداییەوە دەتلێینەوە.) ئەوجا حاڵی خۆی بۆ حەزرەتی جوبرەئیل باسکرد: "چەندین ڕۆژە دەمم بۆ هیچ نەبردووە." لەناکاو دەنگێك بیسترا کە لە دەنگی هەورەگرمە دەچوو. فریشتەیەك بوو دادەبەزی. (لە ڕیوایەتەکەی طەبەرانیدا، دەڵێت کە ئەو فریشتەیە ئیسرافیل (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بووە.) جوبرەئیل بە سەروەرمان ڕادەگەیەنێت کە ئەو فریشتەیە یەکەمین جاریەتی دادەبەزێتە سەر زەوی. فریشتەکە سەلامی خوای گەورەی هێنابوو. خوای بالادەست (جَلَّ وَعَلَا) دەیپرسی: "دەتەوێت ببیت بە پێغەمبەرێکی پاشا، یاخود پێغەمبەرێکی بەندە؟" پێغەمبەری خواش (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە ئاست ئەم داوایەدا کە لە خوای گەورەوە پێی گەیشتبوو بەسەرسووڕمانەوە تەماشای جوبرەئیل دەکات. (پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تا ئاستێکی دیاریکراو وانەی مەعریفەتی لە جوبرەئیلەوە وەردەگرت، تەنانەت لە میعراجدا سەرسامی ئەو پایەی نزیکییە بوو کە جوبرەئیل لە بەرامبەر خوای گەورەدا هەیبوو. بە بۆنەیەکیشەوە باس لەمە دەکات.[1] بەڵێ، ناسینی خوای گەورە بەو ئەندازەیەی کە فریشتەیەکی وەك حەزرەتی جوبرەئیل دەیناسی، کارێکی مەحاڵە.) جوبرەئیل ئاماژە بۆ سەروەرمان دەکات و دەفەرموێت: تَوَاضَعْ لِرَبِّكَ يَا مُحَمَّدُ "ئەی پێغەمبەری خوا! بەرامبەر خوای خۆت خاکیتی بنوێنە."

ئەی مەگەر خوای گەورە لەسەر زمانی قورئانەوە، فەرمانی خاکی بوون بە پێغەمبەرەکەی نادات و نافەرموێت: ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (الشعراء : ٢١٥) "هەتا دەتوانیت باڵی خاکی بوونت نەوی بکە بۆ ئەو باوەڕدارانەی شوێنت کەوتوون." جگە لە چەندین ئایەتی تر کە ئاماژە

---

١ إبن أبي عاصم، السنة ٢٧٦/١؛ حكيم الترمذي، نوادر الأصول ١٢٧/٢؛ طبراني، المجمع الأوسط ٦٤/٥.

بۆ هەمان ناوەرۆك دەكەن.

پێغەمبەری خواش داوای هەمان شتی کرد: بَلْ عَبْداً رَسُولاً "بەڵکو دەمەوێت ببمە پێغەمبەرێکی بەندە."[1]

جا کاتێك ئەو بەندایەتی هەڵبژارد، خوای گەورەش (عَزَّوَجَلَّ) بەندایەتییەکەی بۆ کردە تاجی سەر. ئەوەتا لە زۆر شوێندا قورئان هەر بە بەندایەتییەکەی باسی لێوە دەکات. وەختێکیش موسوڵمانان شایەتمان دەهێنن، شایەتی دەدەن کە ئەو بەندە و پێغەمبەری خوایە. بەڵێ وایە، ئەو لەپێشدا بەندەی خوایە، پاشان پێغەمبەریەتی. بەندایەتی لەپێش پێغەمبەرایەتییەوەیە.

لەوانەیە هەرکەسە و بەندەی یەکێك بێت و کۆتی بەندایەتی ئەو کەسە لەگەردنیدا بێت. حەزرەتی محمدیش (عَلَيۡهِ أَلۡفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە سەرەتا و کۆتاییدا هەر بەندە و کۆیلەی خوای باڵادەست بووە. لە هیچ سەردەم و لە هیچ قۆناغێکی ژیانیدا ملی بۆ کەس نەوی نەکردووە و لە حوزووری کەسیشدا نەچەماوەتەوە. بەندایەتی لە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی ئەوە.

ئەو بەندەیە. خوای باڵادەست لە قورئانی پیرۆزدا بەندایەتییەکەی پێشچاو دەخات و دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴾ (الجن : ١٩) "جا کاتێك بەندەی خوا هەستا بۆ ئەنجامدانی پەرستش (یان بانگەوازی بەرنامەی خوا) (جنۆکەکان لە پێناو بینینی پەرستشەکەیدا) وا لە دەوری کۆبووبوونەوە، ئەوەندەی نەمابوو بچن بە ناو یەکدا."

جا ئەو گەلەکۆمەیەی دەوری پێغەمبەری خوا، چ بدرێتە پاڵ جنۆکەکان چ بدرێتە پاڵ بێباوەڕانی مەککە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، چونکە ئەوەی لێرەدا بۆ

---

[1] أحمد بن حنبل، المسند ٢٣١/٢؛ عبدالرزاق، المصنف ١٨٣/٣-١٨٤؛ طبراني، المجمع الأوسط ٨٨/٧؛ بيهقي، شعب الإيمان ١٧٧/١.

نێمه گرنگه ئەوەیه که سەروەرمان له قورئانی پیرۆزدا به ناونیشانه بنەڕەتییەکەی ناوبراوه که ئەویش "عَبدُالله"یه.

هەروەها لەو ئایەتەشدا که باس لەوه دەکات قورئان گوفتاری خودایه و بانگهێشتی ئەو کەسانه دەکات بۆ بەرهەڵستی کردن که لەم بابەتەدا گومانیان هەیه، دیسانەوه پێغەمبەری سەروەرمان به "بەندە" ناوی هێنراوه.

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ۞ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴾ (البقرة : ٢٣-٢٤)

"جا ئەگەر ئێوه له دوودڵیدان و گومانتان لەم (قورئانه پیرۆزه) هەیه که دامانبەزاندووه بۆ بەندەی خۆمان حەزرەتی محمد، ئەوا ئێوەش سورەتێکی هاوشێوەی ئەوه بهێنن. خۆ ئەگەر ڕاستدەکەن، ئەوانەش بانگ بکەن بۆ یارمەتیتان که جگه له خوا متمانەتان پێیانه. خۆ ئەگەر پێشتان نەکرا -که هەرگیز پێتان ناکرێت- ئەوا (باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی که سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەرده و بۆ بێباوەڕان و نکۆڵیکاران ئامادەکراوه."

له جێیەکی تردا کاتێك قورئانی پیرۆز له ڕوانگەی ئەو خاڵەوه باسی دەکات که زۆرترین بەرزبوونەوەی تێدا تۆمارکردووه، ئاماژه بۆ بەندایەتیەکەی دەکات و دەفەرموێت:

﴿ سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾

(الإسراء : ١)

"پاك و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی که شەوڕەوی کرد به بەندەی

خۆی (حەزرەتی محمد) لە (بەشێکی کەمی) شەودا لە مزگەوتی حرام ەوە (لە مەککەی پیرۆز) بۆ مزگەوتی أقصی (لە بیت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆز و پڕبەرەکەت کردووە. تا هەندێك نیشانە و بەڵگەی دەسەلات و توانای خۆمانی پیشان بدەین. بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە."

ڕووداوی گەمارۆ، بەدواشیدا وەفاتی حەزرەتی خەدیجە و ئەبو تاڵیب، وەك بڵێی سەروەرمانی لەناو خەڵکیدا بێ پشت و پەنا و پارێزەر هێشتەوە. کاتێك هۆکارەکان هەموو بەجارێك لەکارکەوتن و گشت ستوونەکانی پشتگیری یەکە بە یەکە داڕمان و چڵێك نەمایەوە بۆ خۆ ڕاگیرکردن، خوای مسبب الأسباب (سازێنەری هۆکارەکان کە هەموو هۆکارەکان لە دەستی ئەودان) لە بورجی ئەحەدیەتدا بە کەماڵی ڕەحمەتەوە تەجەللای کرد. هەروەك گەورە بیرمەندی چاخەکەمان دەڵێت: لەنێو نووری تەوحیددا نهێنی ئەحەدییەتی پیشاندرا..[1] ئینجا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ڕاستەوخۆ پەروەرێن و خاوەن و بەدیهێنەرەکەی ببینێت، بانگهێشتی ئەودیوی ئاسمانەکان کرا.. لەوێش وەك شەرەفمەندترین میوان پێشوازی لێکرا.

لێرەدا ئامانجی سەرەکیمان باسکردنی میعراج نییە. بۆیە ناچمە ناو ئەو باسەوە. ئەوەندە هەیە کە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەنابتان بەلای خاڵێکدا ناچاربووم لە دەرگای ئەم باسە بدەم، ئەو خاڵەش ئەمەیە: خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) بە مەبەستی باسکردنی موعجیزەیەکی ئاوا گرنگ، سەروەرمان بە هیچکام لەو ناوانەی کە لە قورئان و ئینجیل و تەوراتدا هاتوون، باس ناکات. واتە بە "محمد و أحمد و أحید" ناوی ناهێنێت، بەڵکو باس لە بەندایەتیەکەی دەکات و پێی دەفەرموێت "عبده". وەك بڵێی کاتێك سەروەرمان دەڵێت: "من بووم بە بەندە." خوای باڵادەستیش پێی دەفەرموێت: "مادەم تۆ بوویتە بەندە، ئەوە منیش

---

[1] ، بریسکەکان، بریسکەی یەکەم.

بەندایەتیم کردە بەرزترین بەها و پایە.. و لەسەر زەویدا بەندایەتی بە گەورەترین بەها و پایە قبووڵ دەکەم، لەبەر ئەوە، لە هەر شوێنێکدا بمەوێت باس لە نرخ و بەهات بکەم، ئەوا لەو شوێنەدا باس لە بەندایەتییەکەت دەکەم. هەم بەجۆرێکی وا باسی دەکەم هەموو موسوڵمانێك لە شایەتمانەکەیدا بەرلەوەی شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتیەکەت بدات، شایەتی لەسەر بەندایەتیەکەت بدات و هەموو لایەکی دنیا بە سەدای ئەم شایەتییەیان بێتە لەرزە...“ بەڵێ، سەرانسەری دنیا پڕ بەدەم بەندایەتیەکەت دووپات دەکاتەوە.

### پوختەیەك

ئەو کتێبانەی تایبەتن بە ئاکار و خەسڵەتەکانی پێغەمبەری خواوە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئەو سەروەرەیان بە گشت لایەنەکانیەوە باس کردووە. ئەو وەك چۆن لە ڕووی جەستەییەوە مرۆڤێکی کامڵە، بەهەمان شێوە لە ڕووی ڕۆح و ئاکارەکانیشیەوە هەروا کامڵە. لە وتەیەکدا کە دەدرێتە پاڵ حەزرەتی عەلی، پێغەمبەری خوا بەم شێوەیە باسکراوە:

كَانَ رَسُولُ اللهِ أَجْوَدَ النَّاسِ كَفًّا، وَأَشْرَحَهُمْ صَدْراً، وَأَصْدَقَ النَّاسِ لَهْجَةً، وَأَلْيَنَهُمْ عَرِيكَةً وَأَكْرَمَهُمْ عِشْرَةً. مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ

”پێغەمبەری خوا بەخشندەترینی مرۆڤەکان بوو. سنگ فراوانترین و لێبووردەترین کەس بوو. (بە ئەندازەی هەموو دنیا ئەرك و قورسایی لەسەرشان بوو، کەچی بێ ئەوەی ئۆفێکیشی لە زار بێتە دەر، شانی دایە بەری و هەمووی بەجێ گەیاند. شتانێکی تاقەت پڕووکێنی وای لە سینە دەگرت، هەر بە خەیاڵی کەسیشدا نەهاتووە، لەبەرامبەر هەموو جۆرە ئەزیەت و ئەشکەنجە و ڕەفتارێکی

---

(فەتانەت - عیصمەت)

نامەردانەدا هەمیشە جوامێرانە مەمەڵەی دەکرد.)

لە ڕووی شێوە زاریشەوە ڕاستبێژترینی مەردومان بوو. (واتە کەسێك بوو لە هەموان قسەی ڕاستتر بوو. خۆ ئەگەر گاڵتەشی بکردایە، وشەیەکی پێچەوانەی ڕاستیت لێ نەدەبیست. تەنانەت لە خەونیشیدا درۆی بەدەمدا نەهاتووە. ڕاست دانیشتووە، ڕاست هەستاوە، ڕاست دوواوە، ڕاست بیری کردووەتەوە، ڕاستی ووتووە و بانگهێشتی بۆ لای ڕاستی کردووە.)

کەسێکی تا بڵێی سروشتی بوو. (گەر لە تەنیشتیدا دانیشتبای، هەرگیز ناڕەحەت نەدەبوویت. لەپاڵیدا ئەوەندە هەستت بە ئاسوودەیی دەکرد، دەتوت لەگەڵ هاوڕێیەکی گیانی بەگیانیتدا دانیشتوویت. خاوەن سروشتێکی وەها و ڕۆحێکی هێندە بڵند بوو، لە توانای هیچ کەسدا نەبوو بگاتە ئاستی و هەڵسوکەوتی وەك ئەو بێت و وەك ئەو بیربکاتەوە و هاوشێوەی ئەو بێت. بە گەورەیی خۆی دادەبەزییە ئاستی سەرمەستانی نێو کۆڕی و، هیچ کاتیش ئەو جیاوازییەی لە نێوان خۆی و دوێنراوەکانیدا هەبوو، نەدەکرد بە خاڵێك بەسەریانەوە و ناڕەحەتی نەدەکردن. گەر لە شوێنێکدا کەسێکی ببینیایە نەتوانێت وەك ئەم ڕێ بکات، ڕاستەوخۆ ڕۆیشتنی خۆی بەگوێرەی لاوازترین کەس ڕێکدەخست. هەر خۆیشی فەرمانی ئاوەها ڕەفتارێکی پێ کردبووین.[1] ئەم بنەما گشتگیرەی کە هەموو یەکەکانی ژیانی گرتووەتەوە، لە هەموو کات و زەمینەیەکدا لە ڕەفتارەکانی پێغەمبەری خوادا (عَلَيهِ أَفضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) ڕەنگی دەدایەوە.) هەست بەرزترین و ڕێزنوێنترین کەس بوو.

ئەوەی بۆ یەکەم جار چاوی پێ دەکەوت، لەتاو سام و شکۆی دەسڵەمییەوە؛ ئەوەیش کە دەرفەتی بۆ دەڕەخسا کەمێك لەگەڵیدا بمێنێتەوە و بیناسێ، هۆگر و شەیدای دەبوو."[2]

---

١ بڕوانە: أبو داود، صلاة ٣٩؛ نسائي، الأذان ٣٢.
٢ ترمذي، مناقب ٨، شمائل ٢٣٣/١.

چ جای ئەوانەی لە نزیکیدا بوون! ئەوانە لە هەموو کەس زیاتر خۆشیان دەویست. حەزرەتی ئەبوبەکر لە هەموو کەس نزیکتر بوو لێی، لە هەموو کەسێکیش زیاتر خۆشی دەویست.

نە لەپێش ئەو و نە لەپاش ئەو، ئەستەمە کەسێکی تر هەبێت هێندەی ئەو خۆشەویست بێت. ئەوەتا هەموو باوەڕداران یەکێك بە زمانی و یەکێکی تر بە زمانی حاڵی، بە هەموو دڵسۆزی و لەناخ هەڵقووڵاوییەکیانەوە بەردەوام ئەمەیان وتووە و دەشیڵێنەوە:

"ئەی گیانی گیانان دڵە حەیران و سەرمەستی تۆیە لەبەرچی؟

جەماڵت هەروەك ڕۆژی ڕەخشانە لەبەرچی؟"

بەڵێ وایە. چونکە ئەو، خۆشەویستی پەروەردگاری جیهانیانە.

## هەرێمی دوعای سەروەرمان لە ڕوانگەی شێواز و دەربڕینەوە

لەم نێوەندەشدا پێم خۆشە سەرنجتان بۆ لای یەك دوو دوعای پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕابکێشم. ئەو وشانەی سەروەرمان لە نزاکانیدا بەکاری هێناون و، ئەو قووڵییەی پێیانەوە دەبینرێ، تەواو جیاوازە و زۆر لەوە بڵندتر و دەوڵەمەندترە کە کەسانی دی بتوانن پێی بگەنەوە. بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێم کە هەر دوعایەکی ئەو سەروەرە -لە ڕوانگەی ئەو واتایانەوە کە لەخۆی گرتووە- خۆی لە قەبارەی کتێبێك دەدات. وەك چۆن وتە و فەرمایشتەکانی لەسەرروو هەموو وتە بەشەرییەکانەوەن، بە هەمان شێوە دوعاکانیشی، زۆر زۆر قووڵتر و ناوەڕۆکدارترن لە سەرجەمی ئەو دوعایانەی کە تا ئێستا کراون و دەکرێن. ئاخر چۆن وا نەبێت لە کاتێکدا ئەو لە هەموو کەس زیاتر خوای ناسیوە و لە هەموو کەس زیاتریش

هەر ئەو لێی ترساوە. کەوابێ، قووڵترین و بەرزترین دوعاش هەر ئەو دەیکات. واتە، لە دوعاشدا هەر خۆی دوا ئاسۆ دەنەخشێنێت. پێغەمبەری پێشەوامان (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دوعایەکی لەم جۆرەمان فێر دەکات: "کاتێك دەچنە ناو جێگاوە، دەستنوێژ بگرن و بڵێن:

اَللّٰهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، اٰمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ

"خودایە، وا خۆمم دایە دەست تۆ و ڕووم کردە تۆ و هەموو کاروبارێکی خۆمم سپاردە تۆ. ئومێد بە ڕەحمەتت و ترس لە سزات پشتم بە تۆ بەست. هیچ پەنا و دالْدەیەك نییە لە خۆت مەگەر هەر بۆ لای خۆت. باوەڕی تەواوم هێناوە بەو کتێبەت کە نازڵت کردووە و، بەو پێغەمبەرەیشت کە ڕەوانەت کردووە."[١]

ئەو وشانەی لەم نزایەدا بەکارهێنراون، هێندە جێی سەرسامی و ئەوەندەش بێ وێنەن، ئەستەمە لەدوای ئەوان شتێکی تر بوترێت.

ئێمە لێرەدا خۆمان دەبوێرین لە ڕۆچوونە نێو وردەکاریی دوعاکان و تەنها سەرنجتان بۆ لای ئەو کورتبڕییە ڕادەکێشین کە لە دەربڕینەکاندا هەیە.

لە دوعایەکی تریشیدا بەم جۆرە دەپاڕێتەوە:

اَللّٰهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. اَللّٰهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ

"خودایە! نێوانی من و گوناهەکانم دوور بخەرەوە وەك چۆن نێوانی خۆرهەڵات

---

١ بخاري، وضوء ٧٥، دعوات ٧، ٩، توحيد ٣٤؛ مسلم، ذكر ٥٦-٥٨.

و خۆرئاوات دوورخستووەتەوە. خودایە! پاکم بکەرەوە لە گوناھ وەك چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك و پەڵە خاوێن دەکرێتەوە."[1]

دەستەواژەکانی ناو ئەم دوعایە، مەگەر بە چەندین پەرتووك ئینجا بتوانرێت ڕوون بکرێتەوە... لەمەش زیاتر شتێکی تر شك نابەم بیڵێم. بەڵێ ھەروایە، سوڵتانی دوعاش ھەر خۆیەتی.

ئەمەش دوعایەکی تری:

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ...، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ. وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَاٰجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ.

"خودایە! داوای "چاکە"ت لێدەکەم بە ھەموو جۆرەکانیەوە، ئەوەی لەم ساتەدا (لەم دنیایەدا) بەخشیوتە و ئەوەیشی کە لە داھاتوودا (لە دواڕۆژدا) دەیبەخشیت، ئەوەی کە دەیزانم و ئەوەیشی کە نایزانم. ھەروەھا پەنات پێدەگرم لە "خراپە" بە ھەموو جۆرەکانیەوە، لەوەی لە ئێستادا (لە دنیادا) دێتە پێش، لەوەیشی کە لە داھاتوودا (لە دواڕۆژدا) دێتە پێش، لەوەی کە دەیزانم و لەوەیشی کە نایزانم."[2]

ئێستاش با پێکەوە بچینە خزمەت کۆمەڵە گەوھەر و مرواریيەکی تری دوعا "جوامع الکلم"ييەکانی ئەو سەروەرە:

اَللّٰهُمَّ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ

"خودایە! ھیچ ڕێگرێك نییە لەوەی کە تۆ بەخشیوتە. کەسیش نییە ئەوەی تۆ نەتبەخشیوە، بیبەخشێت. سەروەت و سامانی ھیچ خاوەن سەروەتێکیش لە حوزووری تۆدا سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت."[3]

١ بخاري، أذان ٨٩؛ مسلم، مساجد ١٤٧.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ١٤٧/٦.
٣ بخاري، الأذان ١٥٥؛ مسلم، صلاة ٢٠٥؛ أبو داود، صلاة ١٣٩.

اَللّٰهُمَّ مَا قُلْتُ مِنْ قَوْلٍ أَوْ حَلَفْتُ مِنْ حَلِفٍ أَوْ نَذَرْتُ مِنْ نَذْرٍ أَوْ عَمِلْتُ مِنْ عَمَلٍ فَمَشِيئَتُكَ بَيْنَ يَدَيْ ذٰلِكَ كُلِّهِ. مَا شِئْتَ كَانَ وَمَا لَمْ تَشَأْ لَمْ يَكُنْ. وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِكَ. إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. اَللّٰهُمَّ مَا صَلَّيْتُ مِنْ صَلَاةٍ فَعَلَى مَنْ صَلَّيْتَ، وَمَا لَعَنْتُ مِنْ لَعْنٍ فَعَلَى مَنْ لَعَنْتَ، إِنَّكَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْاٰخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِماً وَالْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ

"خودایە! هەر قسەیەك كە كردوومە، یان هەر سوێندێك كە خواردوومە، یان هەر نەزرێك كە بڕیارم داوە، یان هەر كارێك كە بەجێم هێناوە، ویستی لەپێش هەموو ئەمانەوەیە. ویستت لەسەر هەر شتێك بووبێت، بووە. ئەوەیشی ویستت لەسەری نەبووبێت، نەبووە. بە تۆوە نەبێت، دارای هیچ هێز و توانایەك نیم. بەڕاستی بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانا و باڵادەستی. خودایە، هەر دوعایەكم كردبێ، با بۆ ئەوانە بێت كە خۆت ڕەحمت پێكردوون، هەر نەفرەتێكیشم كردبێ، با لەسەر ئەوانە بێت كە خۆت نەفرەتت لێكردوون. لە دنیا و لە ئاخیرەتیشدا دۆست و پشت و پەنام هەر تۆیت، بە موسڵمانی بمرێنە و بمگەیەنەرە كاروانی پیاوچاكان."[١]

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْئَلُكَ الرِّضَا بَعْدَ الْقَضَاءِ وَبَرْدَ الْعَيْشِ بَعْدَ الْمَوْتِ وَلَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ وَشَوْقاً إِلَى لِقَائِكَ مِنْ غَيْرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ وَلَا فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَعْتَدِيَ أَوْ يُعْتَدَى عَلَيَّ أَوْ أَكْسِبَ خَطِيئَةً أَوْ ذَنْباً لَا يُغْفَرُ

"خودایە! داوای ڕازیبوون بە قەزا و، ژیانێكی ئاسوودە لە پاش مردن و، چێژی ڕوانینە جەماڵی خۆت و، تاسەمەندیی دیدارت لێ دەكەم، بێ ئەوەی تووشی شتێكی زیانبەخش و فیتنەیەكی گومڕاكەر ببم. هەروەها پەنات پێ دەگرم لەوەی

١ أحمد بن حنبل، المسند ١٩١/٥؛ طبراني، المجمع الكبير ١١٩/٥، ١٥٧؛ حاكم، المستدرك ٦٩٧/١.

که ستەم بکەم یان ستەمم لێبکرێت، دەستدرێژی بکەم یان دەستدرێژیم بکرێتە سەر، یان گوناهێکی وا گەورە بکەم لێخۆشبوونی تۆ نەیگرێتەوە.''[1]

وَأَشْهَدُ إِنْ تَكِلْنِي إِلَى نَفسِي تَكِلْنِي إِلَى ضَعْفٍ وَعَوْرَةٍ وَذَنْبٍ وَخَطِيئَةٍ. وَإِنِّي لَا أَثِقُ إِلَّا بِرَحْمَتِكَ فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي كُلَّهَا إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ

''هەروەها شایەتی دەدەم کە ئەگەر بمسپێری بە خۆم، (ئەوا لە وەها بارێکدا) دەمسپێری بە لاوازی و کلۆڵی و گوناهـ و هەڵە. منیش تەنها متمانەم بە ڕەحمەت و بەزەیی تۆ هەیە، دەسا خۆت لە گشت گوناهەکانم خۆش بە، چونکە جگە لە تۆ، کەسی تر ناتوانێت لە گوناهەکان خۆش ببێت. تەوبەشم لێ وەرگرە، چونکە بەڕاستی تۆ وەرگری تەوبە و خاوەن میهرەبانیی فراوانیت.''

اَللَّهُمَّ أَنتَ أَحَقُّ مَنْ ذُكِرَ وَأَحَقُّ مَنْ عُبِدَ وَأَنْصَرُ مَنِ ابْتُغِيَ وَأَرْأَفُ مَنْ مَلَكَ وَأَجْوَدُ مَنْ سُئِلَ وَأَوْسَعُ مَنْ أَعْطَى أَنتَ الْمَلِكُ لَا شَرِيكَ لَكَ وَالْفَرْدُ لَا نِدَّ لَكَ، كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَكَ، لَنْ تُطَاعَ إِلَّا بِإِذْنِكَ وَلَنْ تُعْصَى إِلَّا بِعِلْمِكَ. تُطَاعُ فَتَشْكُرُ وَتُعْصَى فَتَغْفِرُ، أَقْرَبُ شَهِيدٍ وَأَدْنَى حَفِيظٍ. حُلْتَ دُونَ النُّفُوسِ وَأَخَذْتَ بِالنَّوَاصِي وَكَتَبْتَ الْآثَارَ وَنَسَخْتَ الْآجَالَ، الْقُلُوبُ لَكَ مُفْضِيَةٌ، وَالسِّرُّ عِنْدَكَ عَلَانِيَةٌ، اَلْحَلَالُ مَا أَحْلَلْتَ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمْتَ وَالدِّينُ مَا شَرَعْتَ، وَالْأَمْرُ مَا قَضَيْتَ، وَالْخَلْقُ خَلْقُكَ وَالْعَبْدُ عَبْدُكَ وَأَنْتَ اللهُ الرَّؤُوفُ الرَّحِيمُ. أَسْأَلُكَ بِنُورِ وَجْهِكَ الَّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ بِكُلِّ حَقٍّ هُوَ لَكَ وَبِحَقِّ السَّائِلِينَ عَلَيْكَ أَنْ تُقِيلَنِي فِي هذِهِ الْغَدَاةِ وَفِي هذِهِ الْعَشِيَّةِ وَأَنْ تُجِيرَنِي مِنَ النَّارِ بِقُدْرَتِكَ

[1] أحمد بن حنبل، المسند ١٩١/٥، طبراني، المجمع الكبير ١١٩/٥، ١٥٧، حاكم، المستدرك ٦٩٧/١.

"خودایه! تۆ له هەموو کەس شایانتری بەوەی یاد بکرێیت، هەر تۆیت شایسته به پەرستن.. هەر تۆیش باشترین پشتیوانی نیازمەندان و میهرەبانترینی خاوەن موڵك و دەسەڵاتداران و، بەخشندەترین و جوامێرترینی داوا لێ کراوان و، دەستکراوەترینی بەخشەرانیت.. تۆ ئەو پاشایەی که هاوبەشی نییه و، ئەو تاك و تەنهایەی که هاوشانی نییه. جگه له تۆ، هەرچی شت هەیه چارەنووسی لەناوچوونه. به ئیزنی خۆت نەبێ ناپەرسترێیت، هەر به ئاگاداری و زانیاری خۆیشت نەبێ سەرپێچیت ناکرێت، گوێڕایەڵیت دەکرێ، تۆیش پاداشت دەدەیتەوە، سەرپێچیت دەکرێ، کەچی تۆ دەبووری. نزیکترین شایەت (بینەر)ی هەموو شتێك و پارێزەرەکەشی هەر تۆیت. پێش (ئارەزووی) نەفسەکان کەوتوویت و جڵەوەکانت گرتووه. کردەوەکان(ی مرۆڤ)ت تۆمارکردووه و ئەجەلیانیشت تەقدیر فەرمووه. دڵان بەرەو تۆ دێن، نهێنی و پەنهان لای تۆ ئاشکرایه. حەڵاڵ ئەوەیه تۆ حەڵاڵت کردووه، حەرامیش هەر ئەوەیه تۆ حەرامت کردووه، دینیش ئەوەیه که تۆ داتناوه، فەرمانیش ئەوەیه که تۆ بڕیارت داوه، بەدیهێنراوانیش هەموو بەدیهێنراوی تۆن و بەندەش هەموو بەندەی تۆن، تۆیش پەروەردگاری میهرەبان و بەبەزەییت. سا بیکه به خاتری نووری ئەو دیدارەت که ئاسمانەکان و زەمینی لەبەر ڕۆشن بوونەتەوه و، به خاتری هەر مافێك که هی تۆیه و، به خاتری ئەو بەندانەت که داوات لێدەکەن، لێت دەپاڕێمەوه که لەم بەرەبەیان و ئێوارەیەدا لێم خۆشبیت و به توانست و دەسەڵاتی خۆت له ئاگری دۆزەخ پەنام بدەیت."[١]

اَللّٰهُمَّ إِنَّا نَسأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ مِنهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

"خودایه! داوای هەموو ئەو چاکه و خێرانەت لێ دەکەین که پێغەمبەرەکەت

١ طبراني، المجمع الكبير ٨/٢٦٤.

حەزرەتی محمد (صَلَّىَ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) داوای لیّ کردوویت. پەناشت پیّ دەگرین لە شەڕی هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەرەکەت حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)پەنای پیّ گرتوویت لێیان."[1]

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لَا يُسْتَجَابُ لَهَا

"خودایە! پەنات پێدەگرم لە زانستێك کە هیچ کەڵك و سوودی نەبێت، لە دڵێك ترسی تۆی تێدا نەبێت، لە نەفسێك کە هەرگیز تێربوون نەزانێت، لە دوعا و نزایەکیش کە گیرا نەبێت."[2]

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الْأَمْرِ وَأَسْأَلُكَ عَزِيمَةَ الرُّشْدِ وَأَسْأَلُكَ شُكْرَ نِعْمَتِكَ وَحُسْنَ عِبَادَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ لِسَاناً صَادِقاً وَقَلْباً سَلِيماً وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ مِمَّا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ

"خودایە! داوای جێگیری و دامەزراویت لیّ دەکەم لە کاروبارمدا، هەروەها داوای لێبڕان و بەردەوامیت لیّ دەکەم لەسەر ڕێی ڕاست، هەروەها داوای سوپاسگوزاریی نیعمەتەکانت و جوان ئەنجامدانی پەرستشت لیّ دەکەم. داوای زمانێکی ڕاستگۆ و دڵێکی ساغیشت لیّ دەکەم. پەناشت پیّ دەگرم لە خراپەی ئەوەی خۆت دەیزانیت، داوای چاکەی ئەوەشت لیّ دەکەم کە خۆت دەیزانیت. داوای لێخۆشبوونیشت لیّ دەکەم لەو شتانەی دەیزانیت. بەڕاستی هەر خۆت زانای پەنهان نادیارەکانی."[3]

---

١ ترمذي، دعوات ٨٨.

٢ مسلم، ذكر ٧٣؛ أبو داود، وتر ٣٢؛ ترمذي، دعوات ٦٨.

٣ ترمذي، دعوات ٢٣، نسائي، سهو ٦١.

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي، وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةَ النَّاسِ فَتَوَفَّنِي غَيْرَ مَفْتُونٍ. وَأَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُنِي إِلَى حُبِّكَ

"خودایە! داوای ئەنجامدانی کارە چاکەکان و وازهێنان لە کارە خراپ و بێزراوەکان و خۆشویستنی گەدا و هەژارانت لێدەکەم. هەروەها داواشت لێ دەکەم لێم خۆشبیت و بەزەییت پێمدا بێتەوە، کاتێکیش ویستت خەڵکی تووشی فیتنە و تاقیکردنەوە بکەیت، بەر لەوەی گرفتاری فیتنە ببم، بممرێنیت. داوای خۆشەویستی خۆت و خۆشەویستی ئەوانەی تۆیان خۆشدەوێت و خۆشەویستیی هەر کردارێکیشت لێ دەکەم کە نزیکم دەکاتەوە لە خۆشەویستی تۆ."[1]

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فَوَاتِحَ الْخَيْرِ وَخَوَاتِمَهُ وَجَوَامِعَهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَظَاهِرَهُ وَبَاطِنَهُ وَالدَّرَجَاتِ الْعُلَى مِنَ الْجَنَّةِ. آمِينَ

"خودایە! داوای دەستپێکانی چاکە و کۆتاییەکانی، گشتگیرترین و سەرەتا و کۆتایی، ئاشکرا و پەنهانەکەیت لێ دەکەم. هەروەها داوای پلە بەرزەکانی بەهەشتیشت لێ دەکەم. ئامین"[2]

اَللّٰهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ

"خودایە! کۆمەکیم بکە لەسەر یادکردن و شوکرانەبژێری و جوان پەرستیی خۆت."[3]

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعِفَافَ وَالْغِنَى

---

١ ترمذي، تفسير (٣٨) ٢، ٤؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٤٣/٥.
٢ طبراني، المجمع الكبير ٣١٦/٢٣؛ حاكم، المستدرك ٧٠١/١.
٣ أبو داود، وتر ٢٦؛ نسائي، سهو ٦٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٤٤/٥، ٢٤٧.

"خودایە! داوای هیدایەت و تەقوا و عیففەت و دەوڵەمەندی دڵ و دەروونت لێ دەکەم."[1]

اَللّٰهُمَّ أَحْسِنْ عَاقِبَتَنَا فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا وَأَجِرْنَا مِنْ خِزْيِ الدُّنْيَا وَعَذَابِ الْآخِرَةِ

"خودایە! لە هەموو کاروبارێکدا ئاکام و عاقیبەتمان بەخێر بگێڕە، لە و سەرشۆڕیی دنیا و سزای دۆزەخیش بمانپارێزە."[2]

وەك دەبینن، مەحاڵە لەناو دەربڕینەکاندا بتوانیت تاکە وشەیەکیش دەربێنیت. ئەو گونجاوییەش کە لە ڕەوتی ڕەوانی پەیڤەکاندا بەدی دەکرێت، شایانی سەرسوڕمانە. لە توانای کەسیشدا نییە بگاتەوە بە ئاسۆکانی ئەم دوعایانە. بەڵێ وایە، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تەنانەت لە دوعاشدا بێهاوتایە و نموونەی نییە.

سەرجەمی ئەولیا مەزنەکان و پیاوچاکان بەو بڕگانەی کە لە دوعاکانی پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وەریانگرتووە، هەوڵیان داوە گیان و ڕەنگ ببەخشن بە نزا و پاڕانەوەکانیان و بە دەستی دوعای ئەو پێغەمبەرە نازدارە لە دەرگای میهرەبانیی پەروەردگاریان داوە. لە دوعاکانی پێغەمبەری خوادا دەربڕین و شێواز و ڕووناکییەکی وا هەیە، زۆر بە ئاسانی لەنێو وتەی کەسانی تردا دەناسرێتەوە و دەتوانرێ بوترێت: "ئەم وتەیە فەرمایشتی حەزرەتی محمد المصطفییە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ)..."

من وەك خۆم کاتێك موناجات و ڕاز و نیازەکانی کەسانێکی وەك حەسەن شازەلی و ئەحمەد بەدەوی و ئەحمەد ڕوفاعی و شاهی گەیلانی دەخوێنمەوە، وەختە لە هۆش خۆم بچم، تەنانەت لە هەندێ جێدا هەر خۆم پێناگیرێ. لە ڕاستیدا

---

١ مسلم، ذكر ٧٢؛ ترمذي، دعوات ٧٢.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ١٨١/٤؛ طبراني، المجمع الكبير ٣٣/٢.

دوعاكانی ئەوانیش زۆر كاریگەرن! كەچی دەبینین هەموویان چەندین بڕگەیان لە دوعاكانی پێغەمبەری خواوە خواستووە و تێهەڵكێشی نزاكانی خۆیان كردووە، لەم ڕێیەشەوە لە بەرەكەتی پەیڤە نەبەوییەكان سوودمەند بوون و نزاكانیان بەرەكەت و دەوڵەمەندیی بەدەست هێناوە. ئەوەتا ئێمەش نزا و پاڕانەوەی ئەو زاتە گەورانە دەكەینە تكاكاری نزا و پاڕانەوەكانی خۆمان و، بە ئومێدی گیرابوونی ئەو دوعایانە لە قاپیی ڕەحمەتی پەروەردگار دەدەین.

لە كۆتاییدا دەڵێین: تەواوی دەربڕینەكانی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بەڵگەن لەسەر فەتانەتەكەی. بەشێكیش لە وتەكانی، بە هۆی ئەوەی كە "جوامع الكلم"ن، دارای گرنگییەكی تایبەتن. شێواز و دەربڕینی دوعاكانیشی هەر دەچنە ئەم خانەیەوە. كەوابێ، چ فەرمایشتەكانی چ دوعاكانی، مەنتیقی پێغەمبەرانەی ئەویان دەردەخست، واتە بووبوونە ئاوێنەی باڵانمای ئەو ژیرییەی كە بەسەر ئاخیرەتدا دەیڕوانی و لە كارێزی ئیلهام سەرڕێژ بووبوو. كەوابوو ئەو شتێكی تر نییە جگە لەوەی پێغەمبەری خوایە و سەرداری گشت پێغەمبەرانە...

# عیصمەت

## أ) عیصمەت بە شێوەیەکی گشتی

### ١. واتای زمانەوانی و واژەیی عیصمەت

تایبەتمەندییەکی تر لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەران، تایبەتمەندیی بێتاوانی و مەعصومییەتیانە. ئێمە ئەم تایبەتمەندییە بە "عیصمەت" ناو دەبەین.

عیصمەت لە زمانی عەرەبیدا بە واتای (ڕێگری کردن و بوونە لەمپەر یاخود خستنە ژێر چاودێری و پاراستن) دێت. بە واتا واژەییەکەشی مەبەست لە عیصمەت؛ پارێزراویی پێغەمبەرانە -بە پشتیوانی و چاودێریی خوای گەورە- لە تەواوی گوناهە بچووك و گەورەکان. واتە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) هەرگیز بواری ئەوە نادات بەو بەندانەی کە وەك پێغەمبەر دەیاننێرێت، گوناهـ ئەنجام بدەن و تووشی گوناهـ ببن.

لە قورئانی پیرۆزیشدا ئەم وشەیە لە چەند بۆنەیەکی جیاوازدا باسکراوە. جێی خۆیەتی لێرەدا چەند نموونەیەك بهێنینەوە:

کاتێك حەزرەتی نوح ڕوو دەکاتە کوڕەکەی و پێی دەڵێت: يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا "ڕۆلەگیان وەرە، لەگەڵ ئێمەدا سواری کەشتیەکە ببە." کوڕەکەی وەها وەڵامی دەداتەوە: سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِ "پەنا دەبەمە بەر چیایەك و دەمپارێزێت لەم زریان و لافاوە." جا ئەو کرداری (يَعۡصِمُنِي)یەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، لە چاوگی "عَصَمَ"وە وەرگیراوە و هاوواتایە لەگەڵ وشەی "عیصمەت" دا و بە واتای پاراستن دێت. لە وەڵامیشدا حەزرەتی نوح (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) وشەیەك بەکاردەهێنێت کە لە هەمان چاوگەوە داتاشراوە: لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ "ئەمڕۆ هیچ پارێزەرێك نییە لە ئاست فەرمانی خوادا." جا ئیتر لێرەدا

"عَاصِمَ"، چ بە واتاکەی خۆی بەکار هاتبێت، چ بە واتای "مەعصوم"، جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە.[1] چونکە ئەوەتا هەردووکیان، ئەمیان "پارێزرەر" و ئەوی دیکەشیان "پارێزراو"، بەدەوری هەمان چاووگدا دەسوورێنەوە کە ئەویش "عیصمەت"ە.

کاتێك زولەیخا باسی عیففەت و عیصمەتی یوسف دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ﴿ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ﴾ (یوسف : ٣٢) "ویستم بۆ چێژ و ئارەزووی خۆم بەکاری بهێنم، بەڵام ئەو پاکیزانە ڕەفتاری کرد." وشەی "فَٱسْتَعْصَمَ"ی ناو ئایەتەکە، لە هەمان کاتدا بە واتای (خۆی پاراست، خۆی لێ بەدوورگرت، ڕێگری کرد)یش دێت.

وشەی "وَٱعْتَصِمُوا۟"ی ناو ئایەتی ﴿ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا ﴾ (آل عمران : ١٠٣) دیسانەوە بە واتای خۆ ئاڵاندنێکی توندوتۆڵ و دەستگرتنێکی تۆکمە دێت بە شتێکەوە لەپێناو نەپچڕان و پەرتەوازە نەبووندا. کە ئەویش دەستگرتنە بە پەتی خواوە. جا ئەوەی دەست بەو پەتەوە بگرێت لە کەوتن و لادان پارێزراو دەبێت.

هەروەها کرداری "يَعْصِمُكَ"ی ئایەتی ﴿ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ (المائدة : ٦٧) "بێگومان خودا دەتپارێزێت لە خەڵکی."یش هەر هەمان واتا دەگەیەنێت.

## ٢. هەموو پێغەمبەرێك مەعصومە

تەواوی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) مەعصومن. لەسەرگوزەشتی ژیانیاندا بچووکترین لادان و سەرپێچی بەرچاو ناکەوێت. ئەوان دەستە مرۆڤێکی بێ وێنەی ئەوتۆن، بە پیرۆزی و هەڵبژێرراوی بەدیهێنراون، نەك تەنها ئەوەی کەسانێکی چاك و چاکخوازن، بەڵکو بژاردەترینی نێو بژاردەی چاکانیشن. بەدرێژایی ژیانیشیان

[1] بڕوانە: سورەتی هود، ئایەتی ٤٢-٤٣.

هێندەی تۆزقاڵێك چییە نەیانهێشتووە هەڵبژاردەیی و قودسیەتەکەیان گەردی لێ بنیشێت.

پێغەمبەران فیترەتیان سازگار و ڕۆحیان باڵا و ئیرادەیان پتەو و دەروونیشیان خاوێن و بێگەردە. ئەو تەجەللییانەی لە خوای گەورەوە دێن، چۆن هاتوون، ئاوەها بەو شێوەیە لەواندا بەرجەستە دەبن و، بە ڕەهەندەکانیانەوە دەردەکەون و هەستیان پێ دەکرێت. ئەوان وەك ئەو دڵۆپە و نمەئاوەن کە تیشکی خۆر دەدەنەوە و وەك خۆی پەخشی دەکەنەوە. لە ئاوێزەی دڵی ئەواندا؛ نە تیشکەکان تووشی شکانەوە دەبن، نە ڕەنگەکانیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

بەڵێ هەروایە، لە ڕووی مەنتقیشەوە هەر دەبێت وا بێت. چونکە پەیامبەران بە ئەرکی بانگەواز و گەیاندن لەناو ئێمەدان.. ئامانجی بوونی ئەوان تەنها و تەنها تەبلیغە. واتە دوێنراوی یەکەمی فەرمایشت و فەرمانە ئیلاهیەکان ئەوانن.. هەر ئەوانیشن ئەو فەرمانانەی وەریدەگرن وەك خۆی دەیگەیەننە مرۆڤەکان. جا ئەگەر پێغەمبەران خاوەنی بونیادێکی ڕۆحی وەها ڕوون و سازگار نەبوونایە، ئەوا هەرگیز سەرکەوتوو نەدەبوون لە گواستنەوەی پەیامە ئیلاهییەکان وەك خۆی. جا ئیتر ئەوکات، وەحیی ئیلاهی بەر ماهییەتی ناڕوون و دەروونی ناسازگار و ویژدانی خەوش گرتوویان دەکەوت و، بەوێنەی شکانەوەی تیشك و گۆڕانی بۆ شتێکی تری جیاواز، ئەم ماتە ڕووکەش و بونیادانەش، هەرچی شت هەیە لە تاریکستانی دڵ و هەست و هزری خۆیاندا هەڵیاندەسەنگاند و، بە خۆیان بزانیایە یان نا، دەبوونە هۆکاری شێواندنی ئەو وەحییە. بەم جۆرەش، ئەو تایبەتمەندی و چۆنێتییەیان لەدەست دەدا کە لەگەڵ ویست و فەرمانەکانی پەروەردگاردا دەگونجا.

لە هەمان کاتدا پێغەمبەران ڕۆڵی ئاوێنە دەبینن لە گواستنەوەی ئەو نهێنییانەی تایبەتن بە زاتی ئەقدەس و موقەددەسەوە. جا بۆیە دەبێ ئەم ئاوێنەیە لەوپەڕی پاك

و خاوێنیدا بێت تا ئەوەی وێنەی ئەو حەقیقەتانەی لە ویژدانەکاندا دەینەخشێنێ سەرلێشێوێن و بەهەڵەدابەر نەبێت.

مرۆڤ تەواوی ئەو حوکمە ئایینیانەی تایبەتن بە ئیمان و باوەڕ و کردارەوە لە پێغەمبەرانەوە فێردەبێت. بۆیە پێویستە بە تەواوترین و کامڵترین شێوە، درەوشانەوەی دین لە پێغەمبەراندا ببینێت تاوەکو شوێنیان بکەوێت و بە شوێنکەوتنیشیان بەختەوەریی دنیا و دواڕۆژی دەست بکەوێت.. جا ئەگەر ئەو ڕابەرە هەمەکییانەی کە سەرمەشق و پێشەوای خەڵکین، دەستیان بچێتە گوناهـ، دەی ئیتر چۆن دەبێ شوێنکەوتنیان جائیز بێت؟ لە ڕاستیدا شوێنکەوتنی ئەو جۆرە مرۆڤانە وابەستەی مەیلی عەودالًیی ئیستیقامەتە، کە لە ناو ناخی مرۆڤ خۆیدایەتی. شوێنکەوتەیی مرۆڤانێکیش کەوا ئەگەری لادانیان هەیە، پێچەوانەی ئەم عەودالًییەی ناو ناخی مرۆڤە. نا.. نەخێر، هیچ پێغەمبەرێك گوناهی ئەنجام نەداوە و هەر هەمووشیان لە سەرجەم جموجووڵ و هەڵسوکەوتەکانیاندا، جوانترین و کامڵترین تابلۆی ژیانیان پێشکەش کردووە و ژیانیان هەر لەسەر هەمان هێڵی ئیستیقامەت بەڕێ کردووە. چەندە سەختە باوەڕ بەوە بکەیت مرۆڤێك خۆی شایانی چوونە بەهەشت نەبێت، هەستێت دەستی خەڵکی بگرێت و وایان لێبکات ببنە شایستەی بەهەشت! لە کاتێکدا ئێمە دەزانین خوای گەورە سەرجەمی پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردووە، دەستی مرۆڤایەتی بگرن و بەرزیان بکەنەوە بۆ ئاستێك شایستەی چوونە بەهەشت بن.

ئەوە لە سایەی مەعصومیەتی پێغەمبەرانەوەیە (عَلَيهِمُ السَّلَام) کە دینە ئاسمانییەکان لە بەرامبەر سیستەم و تیۆریە مرۆییەکاندا بە ئەندازەیەك بالأیی و سەرکەوتنیان تۆمار کردووە، بواری بۆ هیچ بەراوردێك نەهێشتووەتەوە. جا ئەگەر بارودۆخەکە بەم جۆرە نەبووایە، ئەوا دەرەنجامەکەش بەم شێوەیە نەدەبوو. بێگومان پێغەمبەران، بەتایبەتیش لە سالأنی پێش پێغەمبەرێتیدا، هەریەکەیان بۆخۆی ئامانجێکی بالأ و مەبەستێکی مەزنی هەبووە... هیچ گرفتێکیش لەمەدا نەبووە.

بۆیە دەبینین کاتێك پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەر لە پێغەمبەرایەتی لەتاو خەمی ڕزگاریی مرۆڤایەتی دەتلایەوە، ئەو ئێش و ئازارە ڕۆحییانەی لە چیای نوور دەیچەشتن، کۆمەڵە سوێ و ژانێك بوون لەم بەرزە ئاوات و ئامانجە باڵایەوە سەرچاوەیان گرتبوو. بەڵێ ئەو خاوەنی ئامانجێکی باڵا و مەبەستێکی مەزن بوو. ئەویش بریتی بوو لە ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی بە هەر جۆرێك بێت. بەڵام ئەوەندە هەبوو کە سنووری ئەو لەوێدا کۆتایی پێ دەهات. ڕەچەتەی ڕزگاریی مرۆڤایەتی، شتێك نەبوو لەدەستی ئەودا بێت و زادەی بیری ئەو بێت. بەڵکو ئەو ڕەچەتەیە ڕاستەوخۆ لە لایەن پەروەردگار خۆیەوە لە ڕێگەی وەحیەوە دەهات.

جا ئیتر لێرەدا ڕێگەی ئایدیالیزم و وەحی لەیەکتر جیادەبنەوە؛ یەکێکیان سەرتاپا مرۆیی و ئەوی دیکەشیان سەرتاپا ئیلاهی. هەر بۆیە ئەو پەیامبەرەش کەوا ئەم سیستەمە ئیلاهییەی دەخرێتە ئەستۆ، پێویستە دارای بونیادێکی ڕۆحیی تەواو جیاواز بێت لەو بونیادەی کە نموونەخوازان و خەیاڵ پەرستان هەیانە. بەڕاستیش هەر بەو جۆرە بوو.

خاڵێك هەیە، حەز ناکەم بێ ئاماژە بۆکردنی، بەسەریدا تێپەڕم: وەك چۆن پێغەمبەران لە نموونەخوازان و خاوەن هزرە خەیاڵییەکان جیا بوونەتەوە و بە مەعصومیەت ڕازێنراونەتەوە، هەر بەو شێوەیە دەبێت ئوممەتەکانیشیان خاوەن هەمان بونیاد و هەمان مەعصومیەت بن. پێشم وایە دیارترینی ئەو تایبەتمەندییانەی کە شوێنکەوتووانی پێغەمبەرێك لە بارستە جەماوەرییەکانی تر جیادەکاتەوە، هەر ئەمەیە.

گومانی تێدا نییە کە، پێویستە هەموو کەسێك لە ژیانیدا خاوەن مەبەستێکی باڵا و ئامانجێکی مەعنەوی بێت. ئەوانەشی بێ بەش لەمە دەژین، بە مرۆڤانێکی وێڵ و بێ شیرازە دادەنرێن. هەر لەبەر ئەوەشە کە یەکێك لە سوڵتانانی گوفتار

دەڵێت: ئەگەر ئامانجی ئەندێشە (ئامانجێکی باڵا و مەبەستێکی مەزن کە مرۆڤ لەپێناویدا بژی) نەبێت، یاخود ئەو ئامانجە لەبیرچووبێتەوە یاخود لەبیرخۆ برابێتەوە، ئەوا زەینەکان دەگۆڕێن و دەبن بە "خۆپەرستی".[1]

مەعصومیەت و بێگوناهیی پێغەمبەران، وەك فیترەت و سروشتێکی بەدیهێنراوی لێ هاتبوو تیایاندا و، دەتوت بووە بە ڕەهەندێکی دانەبڕاوی بونیادیان. لەوانەیە سەر ڕووی مانگ یان ڕووخساری خۆر چەند لەکە و پەڵەیەکی ڕەشی پێوەبێت، بەڵام لە ڕۆحی پێغەمبەرێکدا تەنانەت بە ڕێبوارییش سێبەری گوناهـ ڕەت نابێت.

بۆ نموونە؛ گەر وەلییەك گوناهێك ئەنجام بدات، با بڵێین بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، وشەیەکی پێچەوانەی ڕاستی لە زاریەوە بێتە دەر، ئەوا ئەو وەلییە، تەمەنێك لە ویژدانیدا بە ئازار و سوێی ئەوەوە دەتلێتەوە. بەڵام ئەگەر وەها وشەیەك -بە فەرزی مەحاڵ- لە زاری پێغەمبەرێکەوە دەربچوایە، ئەوا ئازاری ویژدانیی لەزار دەرچوونی ئەو وشەیە، لە مەحشەریشدا هەر بەردەوام دەبوو. هەر لەبەر ئەمەیە کە حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئازار و نارەحەتی ئەو سێ ڕستە تەعریزەی[2] لە ژیانیدا وتوویەتی (تەعریز درۆ نییە، بەڵکو لەپاڵ درکاندنی ڕاستیدا، گەیاندنی واتایەکە بە کەسی بەرامبەر -لەپێناو بەرژەوەندییەکدا- کە لە دەرەوەی واتای ئەو وشەیەدایە کە دەربڕاوە و خۆشمان زۆر جار دەیکەین.) لە گۆڕەپانی مەحشەریشدا دەچێژێت و لە تاوا ئەوانەی بە مەبەستی شەفاعەت کردن دێنە لای، ڕەوانەی حەزرەتی موسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەکات.[3]

بەڵێ، چ ویژدانی ئەو و چ ویژدانی سەرجەم پێغەمبەرانی تر، لە بەرامبەر گوناهدا تا ئەو ئاستە هەستیار و داخراوە.

---

١ بەدیعوززەمان، مەکتووبات، ٨٧١.

٢ ئەم سێ ڕستە تەعریزە، لە دواییدا لە بەشی عیصمەتی حەزرەتی ئیبراهیمدا ڕوونەکرێتەوە.

٣ بخاري، تفسير (١٧) ٥؛ مسلم، إيمان ٣٢٦.

ڕاستییەکەی، کاتێك دەستمان دایە شیکردنەوەی ئەم بابەتە، مەبەستمان لێی باسکردنی مەعصومیەتی سەروەرمان حەزرەتی محمد (صَلَّىَاللّٰهُتَعَالَىٰعَلَيْهِوَسَلَّمْ) بوو. بەڵام هەموو پێغەمبەران، بە دەربڕینەکەی سەروەرمان "أبناءُ عَلَّات"[1] واتە کوڕی هەمان باوکن.. بەڵێ، هەموویان وەك دەستە برایەك وان کە پەروەردەی دەستی یەك باوك بن. بۆیە ئێمەش -ئەگەرچی بە کورتە ئاماژەیەکیش بوو بێت- هەوڵ دەدەین شتێك دەربارەی مەعصومیەتی هەموو پێغەمبەران بڵێین. نەخوازەڵا لەنێو ئەو ڕۆحە باڵا و بەژنە ناوازانەدا ئەوانەیان کەوا لە ڕێی پەرتووکە شێوێنراوەکانەوە هەوڵ دەدرێت دامێنی مەعصومیەتیان بەلیتاوی تۆمەتی دەم هەڵبەست و دروستکراو لەکەدار بکرێت. ئەو سەردارانە بەتایبەتی دەخەینە ناو بازنەی توێژینەوەکەمان و هەوڵ دەدەین لەژێر چەپکە ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا، قێزەونیی ئەو بوختان و دەم هەڵبەستانە بخەینە پێشچاو کە دەخرێنە پاڵیان. بەڵام وەك لە سەرەوەیش ئاماژەمان پێدا، بابەتی سەرەکی ئێمە حەزرەتی موحەممەدە و، مەعصومیەتەکەشی تەوەری بنەڕەتی ئەم بەشەیە.

بەڵێ، هەموو پێغەمبەران مەعصومن و حەزرەتی محمد المصطفىیش (صَلَوَاتُ اللّٰهِوَسَلَامُهُعَلَيْهِ) سەرگوڵی ناو کۆڕی مەعصومانە. چونکە ماهییەتەکەی یەکپارچە بە تەجەللییە ئیلاهییەکان شێلراوە و، لە ئاوێنەی دڵیشیدا هەردەم پەروەردگار موتەجەللی بووە. جا ئیدی ئەو ڕۆحە مەزنە کە خاوەن ماهییەتێکی ئاوەها و دڵێکی لەو جۆرەیە، بێ شك هەر خۆی مەعصومی نێو مەعصومان دەبوو.

خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) لەپێناو بانگەوازێکی تایبەت و زۆر گەورەدا و بۆ گەیاندنی ئەو بانگەوازە، کۆمەڵە مرۆڤێکی پارێزراو و چاودێری کراوی هەڵبژاردووە، کە ئەوانیش پێغەمبەرانن. بۆیە بە ڕەچاوکردنی ئەم حاڵەتە تایبەتییەیان، بە شێوەیەکی تایبەت هەمیشە پاراستوونی. ئەمەش هەمان ئەو تایبەتمەندیی پۆشتەکردنەی

---

1 بخاري، الأنبياء ٤٨؛ مسلم، فضائل ١٤٤.

پێغەمبەرانە بە سیفەتی عیصمەت و هێشتنەوەیانە لە ئاسۆی مەعصومیەتدا. ئاخر پێویستە ئەوان هەمیشە ئەو پایە بڵند و پاك و بێگەردەیان بپارێزن تاوەكو بتوانن ببن بە ڕێنوێن و پێشەوا بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی.. دەبێ مێژەر و جبەی ئەوان لە هەموو چەشنە لەكە و چەپەڵییەك پارێزراو بێت، تا ئەوەی چاوی ئەو كەسانەی چاویان لێدەكەن و شوێن پێیان هەڵدەگرن بە شوێنی ترەوە سەرقاڵ نەبێت. ئەوان ڕێبەر و ڕێنیشاندەری سەفەری بەرەو خودا و ڕەزامەندی خودا چوونن. وەك ئاشكرایشە، لە هیچ گوناهێكدا بگرە لە بچووكترینیشیاندا ڕەزامەندی و خۆشنوودیی خوای گەورە بەدی ناكرێت. جا كەسێك خۆی لە ڕەزامەندی پەروەردگار بێ بەش بێت، چۆن دەتوانێت كەسانی تر بەو ڕەزامەندییە شاد بكات؟! شتی وا هەرگیز ڕێی تێناچێت. كەوابوو ئەنجامدانی گوناهیش لە لایەن پێغەمبەرانەوە هەرگیز ڕێی تێناچێت.

## ٣. پێغەمبەران لە گەورە و بچووكی گوناهـ مەعصومن

بە بۆچوونی زۆرینەی زانایان، پێغەمبەران لە گەورە و بچووكی گوناهـ پارێزراون. بچووكترین گوناهـ چییە ئەنجامیان نەداوە. سەبارەت بەو زەللە و هەلآنەش كە دەدرێنە پاڵ هەندێ لە پێغەمبەران، سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین كە ئەوانە گوناهـ نین، خاڵێكی تریش ئەوەیە كە ئەم زەللانە بەر لە پێغەمبەرایەتییان ڕوویان داوە. لە هەردوو حاڵەتەكەشدا پێغەمبەر وەك پێغەمبەر هەر مەعصومە. ئەمە جگە لەوەی كە ئەو بەهەڵەدا چوونانەی كە ئێمە بە "زەللە" ناویان دەبەین، شتانێكن پەیوەندییان بە حاڵ و مەقامەكانیانەوە هەیە، واتە؛ ئەم زەللانە بۆ خەڵكانی ئاسایی بە گوناهـ دانانرێن، بەڵكو بۆ ئەو موقەڕڕەبینانە بە هەڵە دادەنرێن كە لە هەموو كەس زیاتر لە خوداوە نزیكن.

بۆیه لەو باوەڕەدام هەڵە بێت ئەم دەستەواژەی زەللەیە کە بەتەواوی مانا پەیوەندی بە حاڵ و مەقامی تایبەتی پێغەمبەرانەوە هەیە، وەك بابەتێکی ئاسایی هەڵبسەنگێنین.

ئاخر چۆن دەکرێ پێغەمبەران مەعصوم نەبن و گوناهـ ئەنجام بدەن، لە کاتێکدا تەنانەت ئێمە خۆشمان لە چوارچێوەی پێوەرە مرۆییەکانماندا، کاتێك فەرمانبەرێك بۆ جێیەکی بێ نرخی دنیایی دیاری دەکەین، سەرەتا هەڵدەستین بە ئەنجامدانی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بۆ دڵنیابوون لەو کەسە. باشە ئەی ئەگەر ئەو ئەرکەی دەسپێررێتە ئەو کەسە، ئەرکێکی گرنگی وەك پێغەمبەرایەتی بێت!.. بێگومان دەبێت لەمەدا لێکۆڵینەوەی دڵنیایی هەتا حەوت پشت بڕوات!

جا ئەگەر لە هەڵبژاردنی کەسی شیاودا، ئەو کاروبارانەی کە تەنانەت زۆر سادە و ئاسایین و بەتەواوەتی ڕوویان لە دنیایە، هێندە هەستیاری بنوێنرێت، دەی بۆ سەرکردایەتی و فەرمانبەری و ئەرکێك کە مەزنترین ئەرکە و، هەم دنیا و هەم ئاخیرەتیشی لەخۆ گرتووە، دەبێت چ هەستیارییەك بنوێنرێت کە هاوشانی مەزنیی ئەو ئەرکە بێت؟ دەی ئایا شیاوی و لێهاتوویی ئەو کەسە بە هەند وەرناگیرێت کە ئەو ئەرکەی پێ دەسپێررێت؟

ئاخر تۆ بیر بکەرەوە، تەنانەت ئەو فریشتەیەش کە وەحی بۆ پێغەمبەران دەهێنێت، لە نێو فریشتەکاندا بە ئەمنییەتەکەی ناسراوە و هەر لەبەر ئەم تایبەتمەندییەشیەتی کە ئاوەها ئەرکێکی خراوەتە سەرشان. ئەوەتا قورئانی پیرۆز دەربارەی جوبرەئیل (عَلَيْهِالسَّلَام) دەفەرموێت: مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ "لەوێ گوێڕایەڵی دەکرێت و ئەمینیشە." هەم لەبەرامبەر خوادا زۆر گوێڕایەڵە و هەم بۆ هەڵگرتنی وەحیش ئەمیندارترین کەسە. جا ئایا ڕێی تێ دەچێت ئەم وەسفانە لەو فریشتەیەدا بە مەرج وەربگیرێت کە هۆکاری گواستنەوەی وەحیە و لەو پێغەمبەرەدا بە مەرج وەرنەگیرێت کە نوێنەرایەتی وەحی دەکات؟

بەڵێ، هەرگیز خوای گەورە ئەرکێکی وەها قودسی و هێندەی ئەوەش خاوێن، ناسپێرێت بە کەسێك ساختەکار و دز و سەرخۆش و دوژمنی نامووس و ئابڕوو بێت. دەی ئیتر چۆن دەبێت سیفەتگەلێکی پەست و نەویی لەم چەشنە کە تەنانەت کەسانی ئاساییش بێزی لێ دەکەنەوە، لە پێغەمبەرێکدا بوونیان هەبێت؟ ئەی چۆن دەکرێت ئەو بوختانچی و درۆهەڵبەستانەی نەنگی و کەموکوڕی دەدەنە پاڵ پێغەمبەران، پێیان بوترێ مرۆڤ و خاوەن ژیری؟ بەڵێ، مرۆڤی چڵکن، هەرگیز نابێتە نوێنەری پاکیزەیی و بێگەردی. هەرگیز بەو جۆرە مرۆڤانەش ناوترێت پێغەمبەر. بە دڵنیاییەوە بەو کەسەش ناوترێت مرۆڤ کەوا خەوش و لەکەی لەو جۆرە دەداتە پاڵ پێغەمبەران..!

بەڵێ، ژیری داخوازی مەعصومیەتی پێغەمبەرانە. دووبارە، ژیری داخوازی ئەوەیە کە؛ عیصمەت و بێ گوناهیی ئەوپەڕی ئامانج و مەبەستی باڵای ئەو مرۆڤە قودسییانەش بێت کەوا هەڵگرتنی بانگەوازی پێغەمبەرانیان بۆ خۆیان کردووەتە دروشم. ژیریش بە جۆرێك ئەمە دەخوازێت کە؛ دەبێت چوونە ناو گوناهیان بەلاوە ترسناکتر و بەسوێتر بێت وەك لە چوونە ناو دۆزەخ.

عیصمەت زۆر گرنگە. لە ڕاستیدا دەڵێی پێغەمبەرانی مەزنیش هەموو ژیانیان هەر لە نمایش کردن و خستنە پێشچاوی عیصمەتەکەیاندا بەسەر بردووە. خۆ ئەگەر هەڵاوێر (استثناء)ی ئەو چەند وتەیەی کتێبە شێوێنراوەکان بکەین کە من بە "وڕێنە" ناویان دەبەم، ئەوا کەسێکت بەرچاو ناکەوێت گوناهـ بداتە پاڵ پێغەمبەران. قورئانی پڕبەخشش بە شێوەیەکی شایان بە شان و شکۆیان لێیان دواوە و هەمیشە وەك نموونەی پاکیی خستوونیەتە ڕوو.

لە ئاسماندا جوبرەئیل و عەزرائیل و میکائیل و ئیسرافیل چی بن، لە زەویشدا پێغەمبەران ئەوەن. بەڵام ئێمە تەنها ئەوەندە لە بارەی ئەم بەژن و باڵایانەوە دەزانین

که قورئانی پیرۆز بۆمانی گێڕاوەتەوە و بە ناویش تەنها ئەوانەیان دەناسین.
ئیبراهیم حەققی ئەو ناوانەی هۆنیوەتەوە و لە چەند دێڕێکدا دەڵێت:

وتوویانە گرۆهی واجبە زانینی نامی پەیامبەران
خوا لە قورئاندا هێناویە ناوی بیست و هەشتیان
یەکێ ئادەم، یەکێ ئیدریس، نوح و هود هەروا صالح
یەك ئیبراهیم، یەك ئیسحاق، هاودەم لەگەڵ ئیسماعیل ذبیح الله
یەعقوب و یوسف و شوعەیب، لوط لەگەڵ یەحیا
زەکەریا و هارون، پاشان موسا کلیم الله
داوودیش و سولەیمانیش، ئیلیاس و ئەییوبیش هەروا
یەك ئەلیەسەعە، یەکێ تر عیسایە کە ئەمەیانە روح الله
ناوی یەکیان ذالکفل، ئەوی تریشیان یونس پێغەمبەر
خاتەمی گشتیش، حەبیبی حەق محمد رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)
عوزەیر و لوقمان و ذوالقرنین، یەك ڕا نییە لەسەر ئەم سیان
وتراوە "پێغەمبەرن" وتراویشە بەشێکن لە "أولياء الله"

هەموو ئەم پێغەمبەرانە وەك پەڕەیەکی سپی وان کە هیچ شتێکی لەسەر نەنووسراوە. هەرچیەکیان لەسەر نووسرابێت، ئەوا پەروەردگاری بالادەست خۆی بە دەستی قودرەت و قەڵەمی قەدەری خۆی و بە ئامانجی ئەوەی ببنە ڕێبەری خەڵکی

نوسیویەتی. پاشانیش پێشکەشی ڕوانین و پێزانین و سوودمەندیی مرۆڤەکانی کردوون.

وەك لە سەریشەوە وتمان، ئەگەر چی هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە دەشێ پێغەمبەران پێش پێغەمبەرایەتییان تووشی (زەللە) بووبێتن، بەڵام ئەم بۆچوونە لە بازنەیەکی بەرتەسکدا ماوەتەوە و ڕای کەمینەیە. هەر بۆیە "مەرجوح"ە، ئەمەش وا دەکات ببێتە ڕایەکی "مەجروح". زۆرینەی زۆری زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە پێغەمبەران تەنانەت لە منداڵیشیاندا پارێزراو بوون. چەندین دەقیشمان هەیە کە پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکات.

## ٤. بەڵگەکان سەبارەت بە مەعصومیەتی پێغەمبەران

خوای باڵادەست لە ڕوانگەی منەتەوە بەم شێوەیە لەگەڵ حەزرەتی موسا دەدوێت:

﴿ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴾ "ئەی موسا! تۆم خۆشەویست کردووە تا لە ژێر چاودێری خۆمدا پەروەردە بیت."

لەم ئایەتەوە ئەوە تێ دەگەین کە پەروەردگار، بە نیشتەجێ کردنی حەزرەتی موسا لە کۆشکەکەی فیرعەوندا، پەروەردەکردنی حەزرەتی موسای نە بۆ فیرعەون و نە بۆ دایکی موساش جێ نەهێشتووە.. بەڵکو لەپێناو ئەوەی هیچ خەیاڵێکی تر نەچێتە چاوی و، هیچ بیرێکی بێگانە ڕۆحی داگیر نەکات، ڕاستەوخۆ خۆی پەروەردەی کردووە و هەر خۆیشی پێی گەیاندووە. جا ئیتر پێغەمبەرێك کە بەم شێوە چاودێرییە پەروەردە کرابێت، مەعصوم نەبێت چی دەبێت؟ هەر لە منداڵییەوە لەژێر چاودێری پەروەردگاردا بووە و بە باشترین پەروەردە پەروەردە کراوە.

پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرمایشتێکیدا دەفەرموێت:

مَا مِن بَنِي آدَمَ مَوْلُود إِلَّا يَمَسُّهُ الشَيْطَانُ حِينَ يُولَد، فَيَسْتَهِلّ صَارِخاً مِنْ مَسِّ الشَّيْطَانِ غَيْرَ مَرْيَمَ وَابْنَهَا

"هەرچی منداڵێك لەدایك دەبێ، دەستی شەیتانی دەگاتێ. (ئیدی ئەو منداڵەش) لەتاو ئەم لێکەوتەیەی شەیتان دەست دەکات بە گریان، جگە لە مەریەم و کوڕەکەی."[1]

واتە، وەختێ حەرزەتی عیسا لەدایك بووە، شەیتان نەیتوانیوە توخنی بکەوێت. حەزرەتی عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام) پێغەمبەرێکە تەنانەت لە ساتەوەختی لەدایك بوونیشیدا لەژێر پارێزگاریی خوای گەورەدا بووە. دەی کەوابێ، چۆن دەکرێ سەبارەت بە پێغەمبەرێکی وا تەسەووری گوناهـ بکرێت؟

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لە ژیانیدا دوو جار نییەتی چوونە زەماوەندی هێناوە، لە هەردووکیشیاندا خواوەندی باڵادەست حاڵەتی خەواڵوویی بەسەردا هێناوە و لە ڕێدا خەوی لێکەوتووە.[2]

خۆ ئەگەر بڕۆشتایە، ئەگەری ئەوە هەبوو چاوەکانی بە حەرامدا هەڵبتەقێن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە تەنانەت لە سنووری وەها گوناهێکی ئەگەراوییش نزیکی نەدەخستەوە و دەیپاراست. ئەمە لە کاتێکدا هێشتا ئەرکی پێغەمبەرایەتیشی نەخرابووە سەرشان.

لە دەمی منداڵیدا بەشداریی بنیاتنانەوەی کەعبەی پیرۆزی کرد. ئەوە بوو بەرد و خشتی بەکۆڵ هەڵدەگرت و دەیدایە دەست مامەکانی، بەڵام ئەو کۆڵانەی هەڵیدەگرت، جەستەی بەدەرکەوتوویان ئازار دەدا، ئەڵبەتە ئەویش بەم حاڵە

---

١ بخاري، الأنبياء ٤٤؛ مسلم، فضائل ١٤٦-١٤٧.
٢ إبن حبان، صحيح ١٤/١٦٩-١٧٠؛ بيهقي، دلائل النبوة ٢/٣٣-٣٤.

نارەحەت دەبوو. بۆیە حەزرەتی عەبباس (رضي الله عنه) ئامۆژگاریی کرد کە دامێنی کراسەکەی بەرز بکاتەوە و بیدا بەسەر شانیدا. ئەمە شتێکی زۆر ئاسایی بوو لای خەڵکی ئەو سەردەمە. پێغەمبەریشمان بەگوێی کرد، ئەوە بوو کەمێك لە سەروو ئەژنۆیەوە بەدەرکەوت.. هێشتا هەنگاوێکی نەنابوو، تەخت لەسەر پشت کەوتە زەوی و چاوی بڕییە خاڵێك و وەك لە جێی خۆیدا وشك بووبێت وابوو. بەڵێ، جوبرەئیل ئەوەی بۆ ڕوون کردووەتەوە کە ئەم کارەی دروست نییە و پێی وتووە کە: "کاری وا لە تۆ نایەت."[١]

ئاخر ڕۆژێك دەهات داپۆشینی دامێنەکانیش دەبوو بە یەکێك لە ئەرکەکانی و مرۆڤایەتی وانەی شەرم و ڕەوشتی لەسەر دەستی ئەو دەخوێند. جا ئەگەرچی منداڵێکی بچکۆلانەش بێت، کەچی هەر لەژێر سێبەری پەروەردەی تایبەتیی پەروەردگاردا گەورە دەبوو.. بەڵێ، پەروەردگار خۆشەویستەکەی خۆیی تەنانەت لە منداڵیشدا لە گوناه، بگرە لە بچووکترین گوناه دەپاراست.

وەك چۆن فەرماندە سەربازییەکانی داهاتوو، هەر لەو کاتەوەی کە لە قوتابخانەی سەربازیدان، دۆسیەکانیان بە بایەخەوە سەرپەرشتی دەکرێت و بە هەستیارییەوە چاودێری ئەوە دەکرێ کە ئایا بەملا و بەولادا لایانداوە یان نا. بەڵێ، ئەو کەسەی دوای چل ساڵ لە شوێنێکی دیاریکراودا دادەنرێت، بە درێژایی ئەو چل ساڵە، هەموو هەڵسوکەوت و حاڵ و بارێکی دەخرێتە ژێر چاودێرییەوە. هەر بەو جۆرەش خواوەندی حەق تەعالا، فەرماندەکانی ڕێنوێنیی مرۆڤایەتی هەر لە منداڵییانەوە دەخاتە ژێر چاودێرییەکی لەم جۆرەوە و دەیانپارێزێت و لە گوناه بەدووریان دەگرێت. ڕای زۆرینەی زانایانیش هەر لەسەر ئەمەیە.

ئەوان، چاکانی نێو بەرەی ئادەمی و کاکڵە و سەرتوێژی فەزیلەتە مرۆییەکانن.

---

١ بخاري، حج ٤٢، مناقب الأنصار؛ مسلم، حيض ٧٧.

ئەم قەیماغ و سەرتوێژە، سەرتوێژی شیرە و لە ڕۆحی شیر خۆیەوە پاڵێوراوە. قورئانی پیرۆز لە ڕێی دەستەواژەی "ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ"ەوە ئەمەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێت: "هەڵبژاردەی نێو هەرە باشەکانن." واتە پەیامبەران هەر لەسەرەتاوە و لە دەستپێکی ڕێوە باشترینی مرۆڤەکانن. بەڵام هەموو هەرەباشەکان پێغەمبەر نین؛ بەڵکو پێغەمبەران لە نایابترین و بێ هاوتاترینی هەرەباشەکان هەڵدەبژێررێن.

## ٥. عیصمەت لە دەرەوەی پێغەمبەران

دیوێکی تری بابەتەکە بریتییە لەوەی کە ئایا دەکرێ عیصمەت و لە گوناهـ پارێزراوی لەو کەسانەشدا بەرجەستە ببێت کە پێغەمبەر نین؟ واتە؛ ئایا خوای گەورە لە دەرەوەی پێغەمبەرانیش هەندێك لە مرۆڤە هەڵبژاردەکان لە ئەنجامدانی گوناهـ دەپارێزێت؟ دووبارە ڕای جومهووری زانایان لەسەر ئەوەیە کە: "جگە لە پێغەمبەران کەس مەعصوم نییە." هەموو کەسێك ئەگەری ئەوەی هەیە گوناهێکی بچووك یاخود گەورە ئەنجام بدات. بەڵێ، مەعصومیەت تەنها تایبەتە بە پێغەمبەران. فەرمایشتێکی پێغەمبەریشمان ئەم بۆچوونە پشتڕاست دەکاتەوە. ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيۡهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ "هەموو مرۆڤێك تووشی هەڵە دەبێت، باشترینی هەڵەکارانیش تۆبەکارانن."[1]

بەڵام لێرەدا خاڵێك هەیە بە پێویستی دەزانم سەرنجی بدەین؛ قسەکردن لەسەر ئەوەی کە دەکرێ مرۆڤێك بە شێوەیەکی گریمانەیی و خەملێنراوی هەڵە و گوناهـ ئەنجام بدات، ئەوە ناگەیەنێت کە هەر بە ڕاستی گوناهی ئەنجام داوە. هەر بۆیە

---

١ ترمذي، قيامة ٤٩؛ إبن ماجة، زهد ٣٠؛ دارمي، رقاق ١٨.

دەتوانین بڵێین ئەو پێشەوا و کەسایەتییە ئایینیانەش کە لە دەرەوەی پێغەمبەران دەبنە پێشەنگ و ئیمامی مرۆڤایەتی، دەگونجێ لە لایەن خوای باڵادەستەوە لە گوناهـ بپارێزرێن. ئەمەش نە لە دوور نە لە نزیك هیچ پەیوەندییەکی بە بیروباوەڕی شیعەکانەوە نییە سەبارەت بە "مەعصومیەتی ئیمام". بۆ نموونە؛ لە وەڵامی پرسیارێکدا کە بڵێت: "ئایا ڕێی تێدەچێت ئیمامی ڕەببانی گوناهـ ئەنجام بدات؟" هەموومان دەڵێین: "بەڵێ، ڕێی تێدەچێت گوناهـ ئەنجام بدات." چونکە ئیمامی ڕەببانی پێغەمبەر نییە و دەشگونجێت بە شێوەیەکی گریمانەیی گوناهـ ئەنجام بدات. بەڵام داخۆ ئیمامی ڕەببانی لە ژیانییدا هیچ گوناهێکی ئەنجام داوە؟ جا ئیتر لێرەدا وەڵامی ئەم پرسیارە، هەمان ئەو وەڵامەی سەرەوە نابێت. چونکە لە توانای هیچ کەسێکدا نییە تەنانەت گوناهێکی بچووکی ئیمامی ڕەببانی نیشان بدات یاخود بیسەلمێنێت. ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت کە خۆی لە خۆیدا ئەگەری ئەنجامدانی گوناهـ بە واتای ئەنجامدانی گوناهـ نایەت. جا ئیتر خوای گەورە؛ ئەولیا و ئەصفیا و موقەررەبینی نزیك لە خۆی -لەم چوارچێوەیەدا- دەپارێزێت و لەوانەیە نەهێڵێت ئەوانیش تووشی گوناهـ ببن.

حەزرەتی عەبدولقادری گەیلانی، شاهی ئەولیایان و سەرتاجی تەواوی گەورە پیاوانە، خوای باڵادەست ئەم کەڵە پێشەوایەی ئیسلامەتی پاراستووە و لە گوناهـ بەدووری گرتووە. ئەوەتا لە یەکێك لە مەنقیبەکانیدا[1]، هاتووە کە:

لە ڕۆژی "یوم الشك"دا خەڵکی سەریان لێ دەشێوێت و نازانن ئایا دەبێ سبەی بەڕۆژوو بن یان نا؟ بۆیە دێن و دەردی خۆیان دەبەنە لای یەکێك لە پیاوچاکان. ئەویش پێیان دەڵێت: "بڕۆن ئەمشەو لە گەیلان منداڵێك هاتووەتە دنیاوە، لە دایکی بپرسن؛ ئەگەر ئەو منداڵە لە دوای ئیمساك شیری خواردبوو، ئەوە بیکەن

١ مەنقیبە: بریتییە لە گێڕانەوەی بەسەرهات و حاڵ و بارودۆخە پەندئامێز و نائاساییەکانی پیاوچاکان.

به جەژن. خۆ ئەگەر نەیخواردبوو، ئەوە بەردەوام بن لەسەر ڕۆژووەکەتان." ئیتر ئەوانیش دەڕۆن و لە دایکی منداڵە دەپرسن. لەم نێوەندەشدا دایکە هەر داخ و حەیفی ئەوەیەتی کە بۆچی ئەمڕۆ منداڵەکەی شیر ناخوات؟ کاتێك خەڵکەکە ئەمە دەبینن، ڕوو دەکەنە دایکە و پێی دەڵێن: "دایەگیان مەترسە، منداڵەکەت هیچی نییە، مژدەت لێبێت! منداڵێکی وات هێناوەتە دنیاوە، دەبێتە باوکی هەموو دنیا." خەڵکەکە ئەمە دەڵێن و پاشان بەردەوام دەبن لەسەر ڕۆژووەکەیان...[1] ئەمە تەنها مەنقیبەیەکە و نابێت لە ڕوانگەی بەڵگەی شەرعییەوە بخرێتە بەر نەشتەری ڕەخنە. دیسانەوە هەر سەبارەت بەو زاتە دەگێڕنەوە کە چۆن، بەس بۆ ئەوەی تووشی درۆ نەبێت، شوێنی پارەکانی خۆی بەو دز و جەردانە وتووە کە ڕێیان پێ گرتووە.

خوای گەورە ئەو کەسانە دەپارێزێت کە لەسەر ڕێگەکەینی و ناهێڵێت لە گوناهەوە بگلێن. خوای گەورە لە ئایەتێکدا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ (الأنفال : ٢٩) "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ئەگەر تەقوای خوا بکەن و پارێزکار بن بەرامبەر بە خودا، ئەوا دەرك و تێگەیشتنێکی واتان دەداتێ بتوانن چاکە لە خراپە جیابکەنەوە. هەروەها خراپەکانتان بۆ دەپۆشێ و لێتان دەبورێ. خودا خاوەنی نیعمەت و بەخششێکی زۆر و فراوانە."

لە ئایەتەکەوە بەئاشکرا تێدەگەین کە خوای گەورە (جَلَّ وَعَلَا) پاراستنێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەو کەسانەی لەناو بازنەی تەقوادان. بەڵێ، ئەو توانایی و لێهاتنێکی وەهای بەخشیوە بە موتتەقییان، بتوانن هەر لە ڕێوە چاکە لە خراپە جیابکەنەوە و خۆ بەدوور بگرن لە کەوتنە ناو هەڵە و گوناهەوە.

---

١ نبهاني، جامع الكرامات الأولياء ٢٠٣/٢.

لە ئایەتێکی تریشدا وەها دەفەرموێت:

﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾

(الأنعام : ١٢٢)

"ئایا حاڵی ئەو کەسەی کە مردبوو (بەهۆی بێباوەڕییەوە) ئینجا (بەهۆی ئیمانەوە) دڵیمان زیندوو کردەوە و نوور و ڕووناکییەکمان پێبەخشی (کە ڕۆشنی بکاتەوە) کاتێك لەناو خەڵکیدا دەگەڕێت، (ئایا ئەو کەسە) حاڵی وەك ئەو کەسە وایە کە لە تاریکیدا گیری خواردووە و ناتوانێت لێی دەربچێت؟ جا ئیدی ئەم جۆرە کافرانە، کار و کردەوەکانیان بۆ ڕازێنراوەتەوە."

ئەو مرۆڤانەی شانیان داوەتە بەر بەرنامەی خوا و شەکانەوەی بەیداخەکەیان کردووەتە مەبەستی هەرەباڵای ژیانیان، تا لەسەر ئەم بەڵێن و گوفتارەیان بەردەوام بن، بەپێی دەستووری ئیلاهی: ﴿ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ ﴾ (البقرة : ٤٠) "ئێوە بەرامبەر بەو پەیمانەی بە منتان داوە وەفادار بن، تا منیش پەیمانەکەی خۆم بهێنمە جێ." مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت و لە لایەن پەروەردگاریانەوە دەپارێزرێن. ئەوەتا خوای باڵادەست لە جێیەکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴾ (محمد : ٧) "ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئایینی خوا بکەن و هەوڵی سەرخستنی بدەن، ئەوا خوایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدار و جێگیرتان دەکات."

جا ئیتر هاودەم لەگەڵ ئەم چەشنە دڵنیاییەدا، ئەوانەی وا لە دڵەوە و بە ئیخلاسەوە لە خزمەتی ئیمانی و قورئانیدان -إن شاء الله- تووشی گوناهی گەورە

نابن، تەنانەت جاری وا هەیە لە گوناهی بچووکیش پارێزراو دەبن. ئەوەندە هەیە کە ئەم دڵنیاییە بەستراوە بە مەرج و تەقدیری پەروەردگارەوە. جگە لە پێغەمبەرانیش سەبارەت بە هیچ کەسێك ناتوانین بڵێین لە دڵنیاییدایە. تەصدیقی عیصمەتی کەسانی دی تەنها کاتێك مانای دەبێت کە ئەو چەشنە پاراستن و پارێزگاری لێکردنە بووبێت بە ڕووداوگەلێکی بەرجەستە لە واقیعدا... ئیتر ئەوکات دەتوانین بڵێین؛ خوای گەورە فلانە کەسی لە گوناهـ پاراست. بەڵێ، بۆ ئەوانەی لە دەرەوەی بازنەی پێغەمبەرایەتیدان، هیچ زامنییەك سەبارەت بە داهاتوویان نییە. ئەوە تەنها پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) کە باڵی عیصمەت و پارێزراوییان کێشاوە بەسەر ڕابردوو و داهاتوو و سەرجەم دەمەکانی زەمەندا.

هەروەها مەعصومیەتێکی تریشمان هەیە کە بە ئەزموون و موشاهەدە سەلمێنراوە. ئەویش بریتیە لە هەست کردن و بینینی پارێزگاری و چاودێری خوای گەورە بۆ بەندە پەسەندکراوەکانی.

تۆ واز لە مرۆڤە گەورەکان بێنە، خۆ ئەگەر هەریەك لە ئێمە سەرنجی ژیانی خۆی بدات، ئەوا سەرسام و حەیران دەبێت لەوەی کە چۆن چۆنی لە ڕێگەی کۆمەڵە پاڵنەرێکەوە کە هەر بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە، لە چەندەها گوناهـ کە هەموو هەلومەرجەکانیشیان ساز و ئامادەبووە، پارێزراوە و بەچاوی خۆشمان دەبینین کە چۆن لەو گوناهانە دوورخراوینەتەوە.

لە لایەکی ترەوە، ئەو چاکانەی هاوەڵە بەڕێزەکان و ئەوانەش کەوا لەسەر ڕێی ئەوانن لە ڕابردوودا ئەنجامیان داوە، وەك ئەوەی زنجیرە بەربەستێکی پارێزەر بن بۆ داهاتوویان، ئاوا لە گوناهـ و تاوان دەیانپارێزن و دەبنە هۆکاری پاراستنیان. ئیتر وەك بڵێی ئەوانیش داخلی بازنەی ئایەتی: ﴿ لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ (الفتح : ٢) دەکرێن. ئەمەش لە ڕوویەکەوە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای

گەورە لەبەر خاتری ئەو چاکانەی لە ڕابردوودا ئەنجامیان داوە، دەیانخاتە ژێر چاودێریی دڵنیایی بەخشی خۆیەوە. بۆ نموونە؛ ڕەنگە کەسێك بیەوێت گوناهێك ئەنجام بدات، یاخود بۆ جێیەك بڕوات کە گوناهی تێدا ئەنجام دەدرێت. کەچی دەبینین خوای گەورە قاچی دەشکێنێت و دەبێتە ڕێگر لە چوونی بۆ ئەو شوێنە. خۆ ئەگەر بیەوێت بە چاوی ئەنجامی بدات، ئەوا چاوی لە بینین دەکەوێت. ئەگەر بە دەستیش بێت، ئەوا ئەمجارە دەستی لەکار دەکەوێت. لە کۆی هەموو ئەم ڕووداو و لەمپەرانەوە، ئەوە حاڵی دەبین کە خوای گەورە ئەو بەندە خۆشەویستەی خۆی پاراستووە. ئەو موسیبەتە دونیاییانەش کە بەسەریدا هاتوون، بەهۆی ئەوەی قیامەتی ئەو کەسەیان ڕزگار کردووە، لە حوکمی هیچدان.

هەر سەبارەت بەم بابەتە، لە فەرمایشتێکی قودسیدا هاتووە کە:

وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطِشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا

"بەندەکەم بە هیچ شتێکی خۆشەویستتر، لەو ئەرکانەی لەسەریم فەرز کردووە لێم نزیك نابێتەوە. بەندەکەم بەردەوام دەبێت لە نزیك بوونەوە لێم بە ئەنجام دانی نافیلەکان، هەتا لە کۆتاییدا خۆشم دەوێت. جا هەر ئەوەندەی بەندەکەمم خۆشویست، ئیتر دەبمە ئەو گوێیەی پێی دەبیستێ و ئەو چاوەی پێی دەبینێ و ئەو دەستەی شتی پێ دەگرێ و ئەو قاچەی هەنگاوی پێ هەڵدەنێت."[1]

یەك لە واتاکانی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە: من جوانی و خێر و باشەی پیشان دەدەم و هەردەم لە شەڕ و خراپە و بەدخوویی دەیپارێزم. دەبمە چاوانی، ئیتر ئەوەی دەیبینێت هەر چاکەیە. دڵۆپ دڵۆپ مەعریفەت دەتکێنمە ناخیەوە، جا ئیتر

١ بڕوانە: بخاري، رقاق ٣٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٢٥٦/٦.

ئەویش لە ناخیدا هەمیشە هەست بە هۆشیاری و بێداریی دەکات و هەموو ئان و ساتێك بیر لە خوا دەکاتەوە و ئەم بیرکردنەوەیەش لە دەروونیدا ڕەگ دادەکوتێت و بەردەوام خێر و چاکە دەبیستێ و ئیرادەشی هەردەم مەیلی ئەو لایە دەکات و هەر بەرەو ئەو ئاڕاستەیەش لەکاردا دەبێت. هەرچی کۆسپ و تەگەرەی بەردەم گەیشتنیشیەتی بە چاکە، تێپەڕاندنی هەموویانی بۆ ئاسان دەکەم. ئەو لە منەوە نزیکە و منیش نامەوێت لە ڕێی گوناهەوە دڵ و هەستەکانی تری بریندار ببن.

فەرمایشتە قودسییەکە بەم چەند وشەیە کۆتایی پێدێت: وَإِنْ سَأَلَنِي لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لَأُعِيذَنَّهُ "ئەگەر شتێکم لێ داوا بکات، یەکسەر پێی دەبەخشم و ناهێڵم داواکەی دووبارە بکاتەوە. وە ئەگەر لە شەڕی شتێکیش پەنام پێبگرێت، ئەوا دەیپارێزم و پەنای دەدەم."

واتە؛ ئەگەرچی لە ڕووی فەرەزی و تەقدیریشەوە چ سەبارەت بە پێغەمبەران و چ سەبارەت بە بەندە بۆ خوا سوڵحاوەکان -وەك کەسانی تریش وتویانە- ئەگەری ئەنجامدانی گوناهـ داشنرابێت، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە خوای گەورە هەموو پێغەمبەران هەر و، لە پیاوچاکانیش ئەوانەیان کە خۆی ویستی لەسەر بێت، دەپارێزێت و ناهێڵێت توشی گوناهـ ببن.

گەنجەکەی سەردەمی حەزرەتی عومەر نموونەیەکی جوانی ئەمەیە. ئەم گەنجە هەرگیز مزگەوتی جێ نەدەهێشت. دەتوت باڵندەیەکە لە باڵندەکانی مزگەوت. گرنگی بە پەرستشەکانی دەدا و بە هەموو حاڵ و بارێکیەوە دیار بوو لەو کەسانەیە کە بەهۆی پەرستشە سوننەتەکانیانەوە لە پەروەردگاریان نزیك بوونەتەوە. ئەوەبوو ماوەیەك حەزرەتی عومەر چاوی بەم گەنجە نەدەکەوت لە مزگەوت.

جا مەگەر یەکێك لە حیکمەتەکانی نوێژی جەماعەت و نوێژکردن لەدوای ئیمامێکەوە، کە بەگوێرەی هەندێك لە مەزهەبەکان فەرز و بەگوێرەی هەندێکی

تریشیان یەکێکە لە پایەکانی نوێژ و بە لایەنی کەمەوە سوننەتێکی موئەککەدەیە، هەر ئەمە نییە؟ ئیمام ڕوو دەکاتە جەماعەتەکەی و لێیان ورد دەبێتەوە. ئەگەر لەناو کۆمەڵی نوێژخوێناندا یەکێك دیار نەبێت، هەواڵی دەپرسێت، ئینجا ئەگەر دەردێك، گرفتێك، شتێکی هەبێت، بەدەمیەوە دەچێت. جا دەڵێن چی ئەگەر ئەو ئیمامە حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) و، ئەو جەماعەتەش هاوەڵە بەرێزەکان بن! جەماعەت هەر چەندێك قەرەباڵغ بووایە، حەزرەتی عومەر جەماعەتەکەیی زۆر چاك دەناسییەوە و وەك بلێی بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لە حاڵیان، هەموو ڕۆژێك سەرژمێری دەکردن.

ئەوە بوو کاتێك چاوی بە گەنجەکە نەکەوت، پرسی: "داخۆ فلانە گەنج چی بەسەر هاتووە، یەك دوو ڕۆژە لە مزگەوت نایبینم؟" سەرەتا هاوەڵان نەیانویست وەڵام بدەنەوە، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیەوە چاوی بڕیبووە زەوییەکە، بۆ ئەوەی چاویان بەر چاوی حەزرەتی عومەر نەکەوێت. جا کاتێك حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) ئەم حاڵەتە نامۆیەی نوێژخوێنان دەبینێت، پرسیارەکەی دووبارە دەکاتەوە. هەرچۆنێك بێت یەك لە ئامادەبووان وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت: "ئەی ئەمیری ئیمانداران! بەمردوویی لەسەر ڕێی شوێنێکی نەشیاودا دیتمانەوە. جا بۆ ئەوەی نەبێتە مایەی نیگەرانی بۆ جەنابتان، هەر زوو نوێژمان لەسەر کرد و ناشتمان."

حەزرەتی عومەر دەستبەجێ تێدەگات چی ڕووی داوە. وەك ئەوەی پەردە لەسەر چاوی هەڵگیرابێت و گەنجەکەی لەسەر ماهییەتی ئەسڵی خۆی دیبێت وەها بوو... ڕاستی ڕووداوەکەش بەم جۆرە بوو:

لەسەر ڕێی هاتوچۆی مزگەوتی ئەم گەنجە، ماڵی ئافرەتێکی لێ دەبێت کە بووبووە ملۆزم بۆ ئەم لاوە خواناسە و بەرۆکی بەر نەدەدا. گەنجە هێشتا زگورتە و ئافرەتەش لەپێناو لە خشتەبردنیدا هەرچی فێڵ و تەڵەکەی شەیتانی هەیە

بەکاری دەهێنێت. گەنجەی خواناسیش هەموو جارێك بەرپەرچی داواکارییەکانی دەداتەوە و ئارام دەگرێت و بەم شێوەیە لە کەوتنە نێو گوناهـ ڕزگاری دەبێت.

بەڵام هەرچۆنێك بێت هەموو مرۆڤێك ساتێکی لاوازی هەر هەیە. ئیتر ئەو ڕۆژەش ساتی لاوازی ئەو گەنجە بوو. کاتێك ئافرەتە بە هەموو ئاشوفتەییەکیەوە ئاماژەی بۆ دەکات، گەنجە خۆی بۆ ناگیرێت و ڕووەو ئەو ماڵە یەك دوو هەنگاو دەنێت. لەناکاو بەبێ ویستی خۆی هەست بە دووبارە بوونەوەی ئایەتێك دەکات لەسەر زمانی. واتە؛ بێ ئەوەی گەنجەکە هەست بە خۆی بکات، بەبێ وەستان ئایەتێك دەڵێتەوە. ئیتر ئەو ئایەتەی کە لە سەرەتادا بێ ئەوەی هەستی پێ بکات هاتبووە سەر زمانی و دەیوتەوە، بەس بوو بۆ ئەوەی کاتێك هەستی پێ دەکات، ڕۆحی لە جەستەی دەربهێنێت. ئەو ئایەتەش کە وەك هەورە بروسکە لەسەر زمانی چەخماخەی دەدا ئەمە بوو:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَـٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ (الأعراف : ٢٠١)

"ئەوانەی وا لەنێو بازنەی تەقوادا دەژین، وەختێك لە شەیتانەوە گورزێك یان وەسوەسەیەکیان بۆ دێت، دەستبەجێ خوایان بیر دەکەوێتەوە و چاویان بە ڕووی حەقدا دەکەنەوە."

گەنجەکە حاڵەتێکی ڕۆحیی وای بۆ دروست دەبێت، هەروەك بڵێی ئایەتەکە سەر لەنوێ لە ئاسمانەوە دابەزیبێتە سەر ئەم: بۆیە بەرامبەر بە پەروەردگاری هەست بە شەرمێکی زۆر دەکات لەپای ئەو کارەی بەنیاز بوو ئەنجامی بدات.. ئینجا لەتاو ئەوەی ئەو هەموو چاکەیەی پەروەردگاری لەبیرچووبووەوە و گەر بۆ ساتێکیش بێت مەیلی چووبوو بەلای گوناهدا، ڕادەچڵەکێت و لەرز دایدەگرێت.. چ جای کاریگەیی ئەوەی کە پەروەردگاری تەنانەت لە کاتی پێ هەڵخزانیشدا

لەگەڵ نەفسی خۆیدا بەتەنها جێی نەهێشتبوو و بەو ئایەتەی خستبوویە سەر زوبانی، ڕووی وەرچەرخاندبووە خۆی. ئیتر هەموو ئەمانە، ئەم مرۆڤە نوورانییە بە جۆرێك دەهێننە جۆش و خرۆش، هاوسەنگی دڵی بەرگەی ئەم هەژانە لاهوتییە ناگرێت و بە یادی ئەوەوە ڕۆحی دەردەچێت.

جا کاتێك حەزرەتی عومەر لە سەرگوزەشتەی گەنجەکە ئاگادار دەبێتەوە، ڕاستەوخۆ بەرەو گۆڕەکەی دەکەوێتە ڕێ. بەسەر گۆڕەکەدا دەچەمێتەوە و تا دەنگی بڕبکات، هاوار دەکات: يَا فَتَى! وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ "ئەی گەنج، بۆ ئەوانەی لە خوای خۆیان دەترسن دوو بە هەشت ئامادە کراوە." ڕێك لەو کاتەدا دەنگێکی پڕ، هاوشێوەی دەنگی حەزرەتی عومەر دەبیسترێ و، گۆڕستانەکە دێنێتە لەرزە. ئەم دەنگە هی گەنجەکەیە و دەڵێت: "ئەی ئەمیری ئیمانداران، خوای گەورە دوو قاتی ئەوەی پێ بەخشیوم کە تۆ باسی دەکەیت."[1] ئەم دەنگە؛ چ دەنگی گەنجەکە خۆی بێت، یان دەنگی فریشتەیەك بێت و لەجێی ئەودا هاتبێتە گۆ، یاخود هیچ کام لەمانە نەبووبێت، بەڵکو ئاسمان بووبێت و هاتبێتە لەرزە و ئەمانەی وتبێت، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. چونکە گەنجەکە پاداشتی لە خوا ترسانی بە دوو بەرامبەر وەرگرتووە.

ئەو لایەنەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە، بریتییە لەمە: خۆ ئەگەر ئەم گەنجە توشی گوناهیش ببوایە و بڕووخایە، ئەوا گوناهەکەی تەنها لە سنووری خۆیدا دەمایەوە. چونکە بەرپرسیارێتییەکی وەك سەرکردایەتی یان پێشەنگیی نەبوو. بەڵام ئەگەر پێغەمبەرێك گوناه ئەنجام بدات، ئەوا دنیا بەسەر یەکدا دەڕووخێت، چونکە ئەوان لە مەقامی نوێنەرایەتی کردنی جیهانیاندان. تۆ بڵێی ئەو خوایەی گەنجێك لە گوناهێك دەپارێزێت، پێغەمبەرەکەی خۆی نەپارێزێت؟

[1] إبن كثير، تفسير القرءان العظيم ٢/٢٨٠.

له فەرمایشتێکدا، کاتێك پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کە تامی ئیمانیان چەشتووە، دەفەرموێت: "ئەو کەسەی پێی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ ناو کوفر، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەوە شیرینیی ئیمانی چەشتووە."[1] بیر لە مرۆڤێکی ئاسایی بکەنەوە؛ ئەوەتا دوای ئەوەی خواوەند لە کوفر و یاخی بوون ڕزگاری کردووە، گەڕانەوە بۆ حاڵی پێشووی لە چوونە ناو دۆزەخ بە لاوە ناخۆشتر و بێزراوترە. ئەو هۆکارەش کە ئەم پەرچەکردار و شێوازە مامەڵەیەی لە دژی گوناهـ تێدا دروست کردووە، ئەو چێژ و تامەیە کە لە ئیمانەوە دەستی کەوتووە. داخۆ ئەو بەدبەختانەی گوناهـ دەدەنە پاڵ پێغەمبەران، ئیمانی پێغەمبەران هێندەی ئیمانی ئەم کەسە ئاساییەش نابینن وا ڕێ بە خۆیان دەدەن تۆمەتی لەم جۆرەیان بۆ دروست بکەن. حاشا و سەد هەزار جار حاشا لەوەی ئیمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمْ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامِ) لەو ئاستەدا نەبێت کە ببێتە ڕێگر لە ئەنجامدانی گوناهـ.

ئەوانەی دەیانەوێت پارێزراویی ئەولیاکانی خوا -چ جای پێغەمبەران- ببینن، ئەوا گەر تەنها چاوێك بە کتێبی (نفحات الأنس) یاخود (طبقات)ەکەی شەعرانیدا بگێڕن، ئەمەیان بەس دەبێت و لە ڕێی چەندین نموونەی ڕوون و ئاشکراوە دەبینن کە چۆن بە سەدان وەلی لە گوناهـ پارێزراون. بۆ نموونە، خواردن پێشکەشی دەکرێت، بەڵام خواردنەکە حەرامی تێکەڵ بووە. دۆستی خوداش پارووییەك دەبات بۆ دەمی و ماوەیەکی زۆر خەریکی جوینی دەبێت، بەڵام هەرچی دەکات بۆی قووت نادرێت. سەرەنجام بۆی دەردەکەوێت کە پاروەکە حەرامی تێکەڵ بووە. جا ئەگەر خوای گەورە تەنانەت بەندەیەکی وەلی خۆیشی لە پاروە حەرامێك بەم شێوەیە بپارێزێت، بە خەیاڵدا هێنانی ئەوەی کە پێغەمبەرانی ناپارێزێت، دەبێ چ کاڵفامی و نادانییەك بێت، ئێوە هەر خۆتان ئەمە لێکبدەنەوە!

---

١ بخاري، إيمان ٩، الأدب ٤٢؛ مسلم، إيمان ٦٧.

بەڵێ، عیصمەت سیفەتێکی تایبەت بە پێغەمبەرایەتییە و دابڕانی لە پێغەمبەران مەحاڵە. هەموو پێغەمبەرێك سەرفراز بەم سیفەتە دێتە دنیا. بە دەربڕینێکی تر بڵێین؛ کەسێك ئەم سیفەتەی تێدا نەبێت، ناکرێ ببێت بە پێغەمبەر.

بەرلەوەی بچینە سەر سەلماندنی عیصمەتی پێغەمبەران، چەند نموونەیەك لە تەورات و ئینجیلی شێوێنراو دەهێنینەوە کە هەوڵ دراوە سازگاریی عیصمەتی پێغەمبەرانی پێ لێڵ بکرێت. پاشانیش دەچینە سەر شیکردنەوەی ئەم بابەتە لەژێر ڕۆشنایی دەستوورەکانی قورئانی پیرۆزدا و هەوڵ دەدەین وەڵامی پێویستی بوختانچیان بدەینەوە. بەڵام یەك دوو مەسەلە هەیە پێم خۆش نییە بەسەریاندا بازبدەم:

## ٦. قورئانی پیرۆز و کتێبە پێشینەکان لە ڕوانگەی عیصمەتەوە

دۆزینەوەی ڕاستی و پاراستنی "ئیستیقامەتی فیکری" لەڕێی کتێبانێکی وەك تەورات و ئینجیل و زەبوورەوە، کە لە بنەڕەتدا گوفتاری ئیلاهین بەڵام وتەی مرۆڤیان تێکەڵ بووە و تووشی دەستکاری کردن و شێواندن هاتوون، کارێکی ئەستەمە. هەر بۆیە ئەو تابلۆ بزێوانەی سەبارەت بە پێغەمبەران کێشاویانە -نەك هەر لە پێغەمبەر، بگرە لە مرۆڤی ئاساییش ناوەشێتەوە- بەتەواوەتی لە شێوێنراویی ئەو کتێبانەوە سەرچاوەی گرتووە. واتە؛ لە ڕوویەکەوە ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی تر سەبارەت بە شێوێنراویی ئەم کتێبانە لەبەردەستدا نەبێت، ئەوا تەنها ئەم تابلۆ پڕ لە بوختانانە بەسن بۆ ئەوەی ببن بە بەڵگە لەسەر شێوێنراوییان.

خوای باڵادەست بەڵێنی پاراستنی بەم کتێبە ئاسمانییانە نەداوە. ئەمە لە کاتێکدا دەربارەی قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ (الحجر : ٩) "بە ڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر

ئێمەش دەیپارێزین." ئەمە لە هەمان کاتدا ئاماژە بۆ مەرجەعییەتێکی ئیلاهی و پارێزراویش دەکات. هەر بۆیە کۆدەنگی هەیە لەسەر ئەوەی کە حوکمەکانی قورئان هەتا ڕۆژی قیامەت هەر بەزیندوویی دەمێننەوە. چونکە قورئان لەژێر زامنی و پاراستندایە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرچاوەی سەرەکی کە پێویستە لە بابەتی پێغەمبەراندا بۆی بگەڕێینەوە، قورئانی پیرۆزە. ئەگینا پەڕاوە ئاسمانییەکانی پێشوو، بەهۆی ئەوەی کە شێواندنیان بەسەردا هاتووە، تەواوی ئەو قسە و گێڕانەوانەیان کە لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا یەك ناگرنەوە، هەر هەمووی بێ بنەمایە و لە حوکمی نەبوودایە. چونکە هەست و بیری ئادەمیزادیان تێکەڵ بووە. هەرچی بابەتی پێغەمبەرایەتی و مەعصومیەتیشە، لە توانست و دەسەڵاتی هیچ مرۆڤێکدا نییە قسەی تێدا بکات. ئەوە تەنها پێغەمبەرانن کە سەبارەت بە بابەتانێکی غەیبی وەك ئەمە کە تایبەتە بە ڕابردووەوە، پاڵپشت بە وەحی قسە دەکەن. لە دوای سەروەریشمان هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت. چونکە ئەوەی پێویست بووبێت بوترێت، کۆتا پێغەمبەر هەر هەموویی وتووە. تەنانەت حەزرەتی عیساش گوفتاری بۆ ئەو جێ هێشتووە و فەرموویەتی: "من دەڕۆم تا سەروەری جیهانیان بێت."[١]

وێناکردنی باطیل و کارە ناڕەواکانم هیچ بەلاوە جوان نییە. بەڵام ئەوەندەی پێویست بکات چەند نموونەیەك لەو بوختانانە دەهێنینەوە و دواتر دەچینە خزمەت حوکمەکانی قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە. ئینجا لەبەر ئەو چەند نموونەیەش کە تەنها لە چوارچێوەی پێویستیدا و لە دەرەوەی ویستی خۆمان بە ناچاری باسیان دەکەین، دەخیلی ئەو ڕۆحیانەتە پاك و بێگەردەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) دەبم و داوای لێبووردنیان لێدەکەم. چونکە لەپێناو سەلماندنی عیصمەتی ئەو سەروەرانەدا، ناچار بووم شتانێکی پڕوپووچ و ناڕەوا بگێڕمەوە.

١ کتێبی پیرۆز، عەهدی نوێ، یوحەننا، بابی ١٦، ڕستەی ٧.

## ٧. ئەو بوختانە ناشیرینانەی لە کتێبەکانی پێشوودا بۆ پێغەمبەران هەڵبەستراون

لە لاپەڕە ٢٢٨ی "سفر التکوین"دا چەندین نموونەی هاوشێوەی ئەوەمان بەرچاو دەکەوێت کە گوایا حەزرەتی لوط لەگەڵ کچەکانیدا پەیوەندی بەستووە و مەیی خواردووەتەوە و زینای کردووە و بەردەوامی وەچەی لە کچەکانیەوە بووە.[1]

بەڕاستی جێی تێڕامانە! ئەوەتا هەردوو شاری سەدووم و عاموورا لەبەر گوێ نەگرتنیان لەم پێغەمبەرە، بە خۆیان و خەڵکەکایەنەوە ڕۆچوون بە ناخی زەویدا. ئەوە بوو خوای گەورە سیمبولێکی پاکیزەیی وەك حەزرەتی لوطی بۆ ناردن. کەچی لەبری گوێڕایەڵی کردنی، هەستان گاڵتەیان بە پاکیزەییەکەی کرد. هەر بۆیە تەواوی ئەو گەلە ڕووبەڕووی سزای بەکۆمەڵ بوونەوە. خۆ ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی تریش نەبێت لەسەر پاکیزەیی حەزرەتی لوط -کە برازای حەزرەتی ئیبراهیمە- داخۆ دەبێت دار و پەردووی ئەم شارە خاپوور و نغرۆکراوانە و، دیواری وێرانە و ڕووخاوی خانە و ماڵەکانیان بەس نەبێت وەك بەڵگە؟ جا ئێستا دەپرسین: ئایا کتێبێك دێڕ گەلێکی لەم شێوەیەی تێ ئاخنرابێت، ڕەوایە پێی بوترێت کتێبی ئیلاهی؟

هەر لە لاپەڕە ٢٢٨ی بابی ٣٨ی "سفر التکوین"دا باس لە یەهودای کوڕی حەزرەتی ئیسحاق دەکرێت، کە ئەگەری ئەوە هەیە پێغەمبەر بووبێت. بەگوێرەی ئەوەی باسکراوە؛ یەهودا لەگەڵ خێزانی کوڕەکەی خۆیدا زینای کردووە، بەم پێیەش حەزرەتی داود (عَلَيْهِ السَّلَام) و حەزرەتی سولەیمان (عَلَيْهِ السَّلَام) و وەچەی پێغەمبەرانی تری بەنی ئیسرائیل، بەرهەمی ئەم پەیوەندییە ناشەرعییە بوون.[2]

بێگومان ئەم بوختانە قێزەونەی کە بۆ تەواوی پێغەمبەران هەڵبەستراوە، جگە لە

---

١ کتێبی پیرۆز، عەهدی کۆن، تکوین، بابی ١٩، ڕستەی ٣١-٣٨.
٢ کتێبی پیرۆز، عەهدی کۆن، تکوین، بابی ٣٨، ڕستەی ١٢-٣٠.

درۆیەکی بێ بنەما و هەڵبەستراو، هیچی تر نییە. ئەوەتا پێغەمبەری سەروەرمان (عَلَيْهِأَفضَلُصَلَاةِوَسَلَامِ) فەرموویەتی کە بنەچەی لە حەزرەتی ئادەمەوە دەستی پێکردووە و هەر لە ڕێی نیکاحیشەوە بەردەوام بووە.[1] هەروەها لە فەرمایشتێکی تریشدا فەرموویەتی: "هەموو پێغەمبەران منداڵی هەمان باوکن."[2] جا مادام لەنێو زنجیرە بنەچەی ئاڵتوونیی پێغەمبەری سەروەرماندا هیچ زینایەك نییە، کەوابوو ئەم حوکمە بەسەر هەموو پێغەمبەرانی تریشدا دەچەسپێت. مەگەر پێغەمبەری سەروەرمان نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم نییە؟ ئەو یەهودایەش کە باسکرا، ئەویش هەر نەوەی حەزرەتی ئیبراهیمە (عَلَيْهِالسَّلَامُ).. لە ماڵ و خانەی پێغەمبەردا بە هیچ جۆرێك زینا جێی نابێتەوە، تەنانەت لە بابەتێکی وەك ئیمامەتیشدا، هەتا کەسێکی تر وەستابێت، ئیمامەتی کەسێك کە منداڵی زینا بێت بە مەکروهـ دانراوە.[3] باشە دەڵێن چی ئەگەر ئەو مرۆڤە ئیمامی سەرجەم مرۆڤایەتی، واتە پێغەمبەرێك بێت، ئاخر هەرگیز دەگونجێت ژێری ئەمە قبووڵ بکات؟

دووبارە لە بابی یازدەهەمی "سفر الملوك"دا باس لەوە کراوە کە حەزرەتی سولەیمان (عَلَيْهِالسَّلَامُ) لە کۆتاییەکانی ژیانیدا لە دین وەرگەڕاوە و دەستی کردووە بە بتپەرستی.[4] ئەو حەزرەتی سولەیمانەی کە پێغەمبەرە و خوای گەورە (جَلَّ وَعَلَا) هەم سەڵتەنەتی دونیا و هەم سەڵتەنەتی عوقباشی پێ بەخشیوە، ئەویش بەرامبەر هەریەك لەو نیعمەتانەدا سوپاس و ستایشی زیادی کردووە و، شەو و ڕۆژ سوپاسگوزار لە خزمەت پەروەردگاریدا پشتێنی بەندایەتی شایان بەخۆی بەستووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز لەپاڵ ناوهێنانی حەزرەتی مەسیح بەوەی پاڵپشتی لێکراوە بە

---

1 إبن أبي شيبة، المصنف ٣٠٣/٦؛ طبراني، المجمع الأوسط ٨٠/٥.
2 بخاري، الأنبياء ٤٨؛ مسلم، فضائل ١٤٤.
3 مرغيناني، الهداية ٥٦/١.
4 کتێبی پیرۆز، عەهدی کۆن، ١. پاشایان، بابی ١١، ڕستەی ٣-١٢.

(روح القدس)[1] و له ڕێی نەفخەی ئیلاهییەوە هاتووەتە دنیاوە،[2] هەروەها ناوهێنانی حەزرەتی ئیبراهیم بەوەی کە (دۆستی خودا)یە[3] و حەزرەتی موساش بە (کلیم اللّه)، واتە ئەو کەسەی کە خوداوەند خۆی قسەی لەگەڵ کردووە،[4] ئینجا ڕوو دەکاتە داوود (عَلَیْهِ السَّلَام) و خێزانەکەی و پێیان دەفەرموێت: ''ئەی خانەوادەی داوود، بەو شێوەیەی شایستەی خۆتانە شوکرانەبژێری پەروەردگار بن.''[5] و ئەمانیش بەو وەسفانە یاد دەکات.

له عەهدی قەدیمدا باس لەوە دەکرێت کە حەزرەتی داوود یەکێك لە سەرکردە سەربازییەکانی سوپاکەیی بە ناوی "ئوریا"وە بەکوشت داوە و هاوسەرەکەیی بۆ خۆی بردووە.[6] ئاخر کتێبێك کردارێکی پەستی لەم جۆرەی کە تەنانەت ئەگەر کەسێکی بازاڕییش لە خەودا ببینێت تەوبەی لێدەکات، دابێتە پاڵ پێغەمبەرێك کە قورئانی پیرۆز بە "نِعْمَ الْعَبد" واتە "چ بەندەیەکی باشە"[7] ناوی بردووە، چۆن دەکرێت بە کتێبێکی ئاسمانی دابنرێت. ڕاستییەکەی، دانانی تۆزقاڵە ئەگەرێکیش بۆ ئەمە، بەڵگەی نەزانی و بێ ئاگاییە هەم لە پێغەمبەران و هەم لە پێغەمبەرایەتیش. داوود (عَلَیْهِ السَّلَام)، ئەو مرۆڤەی کە فرمێسکەکانی لە ڕووخساریدا جۆگەلەیان بەستبوو.. ئەو داوودەی کە ڕۆژانە لە کۆڕ و دانیشتنەکانیدا مرۆڤگەلێکی بێ ئەندازە لەتاو عەشقی ئیلاهی دڵیان لە لێدان دەکەوت و گیانیان دەردەچوو! ئاخر حەزرەتی داوود بەردەوام دەگریا و دڵانی دەخستە گریان. ئەو "أَوَّاه" بوو. بەردەوام

---

1 بڕوانە: سورەتی البقرة، ئایەتی ٨٧، ٢٥٣؛ سورەتی التحریم، ئایەتی ١٢.
2 بڕوانە: سورەتی النساء، ئایەتی ١٧١؛ سورەتی الأنبیاء، ئایەتی ٩١؛ سورەتی التحریم، ئایەتی ١٢.
3 بڕوانە: سورەتی النساء، ئایەتی ١٢٥.
4 بڕوانە: سورەتی النساء، ئایەتی ١٦٤؛ سورەتی الأعراف، ئایەتی ١٤٣.
5 بڕوانە: سورەتی السبأ، ئایەتی ١٣.
6 کتێبی پیرۆز، عەهدی کۆن، ٢. صموئیل، بابی ١١، ڕستەی ٢-٢٦.
7 بڕوانە: سورەتی ص، ئایەتی ٣٠.

(ئاه)ی بوو و سینەی دەینالاند. "مُنیب" بوو. بۆ ساتێکیش ڕووی لە مەولای وەرنەگێڕابوو. هەمیشە بەندایەتی کردن بووبووە دروشم و سیمای. ڕۆژووەکەی لە لایەن پێغەمبەری خواوە (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە باشترین ڕۆژوو نرخێنرابوو. ئەو صەحابییەی بە پەرۆشەوە بەشوێن چاکترین ڕۆژووی سوننەتەوە بوو، پێغەمبەری خوا بەوە ئامۆژگاری دەکات کە ڕۆژووی حەزرەتی داوود بگرێت. داوود (عَلَيْهِ السَّلَامْ) ڕۆژنارۆژێك بەڕوژوو دەبوو.[1]

حەزرەتی داوود لە هەمان کاتدا پادشاش بوو. هەموو گەنجینەکانی دەوڵەت لەژێر دەستیدا بوون. بەڵام ئەو هیچ کات بیری لەوە نەکردووەتەوە تەنانەت تیکە نانێکیش لە خەزێنەی دەوڵەت بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکار بهێنێت. بە ئارەقی ناوچەوانی بژێوی ڕۆژانەیی پەیدا دەکرد و پێداویستیی خێزانەکەشی لە قازانجی کەسیی خۆی دابین دەکرد.[2] جا تۆ وەرە تەماشای کتێبی شێوێنراو بکە، چۆن نزمترین و ناشرینترین خووڕەوشت دەداتە پاڵ پێغەمبەرێك کە تەنانەت بەرامبەر ئەو پارووەی دەیبرد بۆ دەمی، ئەوەندە هەستیارانە مامەڵەی کردووە و، بەندایەتییەکەی بووبووە پەسنی بە باڵابڕاوی! تەنانەت دنیای ئەندێشەشی زۆر لەوە بڵندتر و بێگەردتر و پەرگیرترە کە بۆ تەنها ساتێکیش بێت، لە ڕۆحیدا میوانداریی ڕەفتارێکی لەم چەشنە بکات. چ جای بگات بەوەی ئەو هەر بەڕاستی دەستی چووبێتە کارێکی لەم جۆرەوە.

هەمدیس لە نێو درۆ و بوختانەکانی عەهدی قەدیمدا کە ژێری دەست دەنێت بەڕوویانەوە، ئەمەشمان بەرچاو دەکەوێت: "ئیسرائیل زۆرانی لەگەڵ خوادا گرت و بەزاندی."[3] ئەو کەسەی ئەوان بە ئیسرائیل ناوی دەبەن، حەزرەتی یەعقوبە.

---

١ بخاري، تهجد ٧، صوم ٥٩؛ مسلم، صيام ١٨٢.

٢ بخاري، بيوع ١٥؛ طبراني، المجمع الكبير ٢٦٧/٢٠.

٣ کتێبی پیرۆز، عەهدی کۆن، تکوین، بابی ٣٢، ڕستەی ٢٤-٣٠.

جا ئیدی ئەو فەلسەفە ماددیگەراییەی ڕۆژئاوا کە ژێریی دابەزیوەتە چاوی، بە ڕادەیەك دزەی کردووەتە نێو ئەم کتێبانەشەوە، کار گەیشتووەتە ئەوەی -حاشا- وا وێنای خوای گەورە بکەن -پاك و بێگەردی و بڵندی بۆ خوای گەورە لەوەی دەیدەنە پاڵی- کە مرۆڤێکە و لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا لە زۆراندایە.

حەزرەتی حەمزە (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بەو قسەیەی کە پێش موسڵمان بوونی بە پێغەمبەری خوای وت، وەك بڵێی وەڵامی ئەمانەی داوەتەوە، ئەوەبوو وتی: "برازای شیرینم! وەختێك لە چۆڵەوانی بیاباندا بەتەنها مامەوە، تێگەیشتم لەوەی کە خاوەند زۆر لەوە گەورەترە لەنێو چوار دیواردا جێی ببێتەوە." جا ئەوە چۆن کتێبێکی ئاسمانییە کە تەنانەت نەیتوانیوە بەرزببێتەوە بۆ ئاستی دەرك و تێگەیشتنی کەسێکی وەك حەزرەتی حەمزە کە هەر پێش هاتنە ناو ئیسلامیشەوە بەو شێوەیە لە خوای گەورە تێگەیشتبوو؟! ئاخر کەی ڕەوایە بەچاوی پەیامێکی ئاسمانییەوە بۆ کتێبێك بڕوانین کە تێڕوانینی بۆ خوا هێندە تەسك و کۆتا بێت؟ جا ئێستا وەرە و باوەڕ بەو قسانەیان بێنە کە دەربارەی پێغەمبەران دەیکەن!.. نەخێر، هەم تەورات و هەم ئینجیلیش، پڕاوپڕن لە بوختان و شێوێنراویی دژ بە خوا و پێغەمبەرانی بەندەگەلی جێ قبووڵی ئەو.. بەڵێ، یەکێکیان سەرچاوەی بوختان و ئەوی تریشیان داوی شێوێنراوییە.

لە لایەکی ترەوە، قورئانی پیرۆز بەرپەرچی هەموو ئەو تۆمەت و بوختانانە دەداتەوە کە بۆ پێغەمبەران هەڵبەستراون. چونکە قورئان بە شێوەیەکی ڕەها فەرمان بە شوێنکەوتەیی پێغەمبەران دەکات. ئەوان کۆمەڵێك پێشەنگ و ئیمامی ئەوتۆن کە لە هەموو ڕوویەکەوە شوێنکەوتن و گوێڕایەڵیان پێویستە. قورئانی پیرۆزیش فەرمانی ئەمە بە خەڵکی دەکات. پێغەمبەران هەر هەموویان ئەو ئاوێنانەن کە ڕەزامەندی پەروەردگار بۆ ئێمە پەخش دەکەنەوە. لە ڕووخساری درەخشان و بێگەردیاندا مەحاڵە چاوت بە گەردیلەیەك تۆز یان تۆزقاڵێك خەوش

بکەوێت. جا ئیتر بە ئاماژەکردن بەم واتایە، قورئانی پیرۆز هەمیشە جوانی و پاکی و تایبەتمەندیی پێغەمبەرانمان بۆ دەگێڕێتەوە و فەرمان بە پێغەمبەری خۆشەویستیشمان دەکات کە بۆمان باس بکات.

جار جاریش هەندێ لەو بەسەرهاتانەی لە قورئاندا سەبارەت بە پێغەمبەران گێڕراونەتەوە، بە هەڵە خوێندنەوەیان بۆ کراوە و وا لێکدراونەتەوە کە گوناهـ و هەڵە بن و ڕوویان لە پێغەمبەران بێت. تەنانەت جاری وا هەبووە ئەم بۆچوونە لایەنگریشی بۆ دروست بووە و کەسانێك لە دەوری کۆبوونەتەوە. بێگومان ئەوانەی کەوتوونەتە نێو ئەم هەڵەیەوە، بەزۆری ئەوانەن کەوا لە قاڵبی تەنگی واژەکاندا گیریان خواردووە و تا ڕادەیەکیش ئاسۆی بیرکردنەوەیان تەسکە. خۆ ئەگەر ئەوانیش هەندێك تێڕابمانایە و وردبینانە مامەڵەیان بکردایە، ئینجا کەمێك خۆیان لە بۆچوونە پێشوەختییەکان دابماڵیایە و کەمێکیش ئامادەیی پێشوەختیان بەرامبەر ئیسرائیلیات تێدا بووایە، بە دڵنیاییەوە ئەو کات ئەوانیش هەروەك جمهوری زانایان بیریان دەکردەوە و بەرامبەر ئەنبیای عیظامیش بە ڕێزێکی زیاترەوە مامەڵەیان دەکرد.

## ب) عیصمەت و پێغەمبەرانی تر

بەرلەوەی بچینە خزمەت ئەو ئایەتانەی پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەیە، پێم خۆشە بەکورتی سەرنجتان بۆ لای چەند خاڵێك ڕابکێشم:

### بابەتی زەللە

**یەکەم:** کاتێك پێغەمبەران ڕووبەڕووی حاڵەتێکی وا دەبنەوە کە لە نێوان دوو شتدا یەکێکیان هەڵبژێرن، با بڵێین ئەگەر لە نێوان "علي الأعلى"، واتە باشترینی باشەکان و "أعلى" واتە باشدا، ئەوان باشیان هەڵبژاردبێت، ئەوا لەوانەیە ئەمە بۆ

ئەوان بە زەللە دابنرێت. بەڵام ئەمە سەرسم دان یاخود هەڵەیەك نییە بەو مانایەی کە ئێمە لێی تێگەیشتووین. چونکە ئەو شتەی هەڵی بژاردووە "أعلی"، واتە باشە. بەڵام دەکرێ بوترێت -بێگومان ئێمە مافی وتنی شتی وامان نییە- کاتێك پێغەمبەرێك خۆی لە بەرامبەر وەها هەڵبژاردنێکدا دەبینێتەوە، بەو پێیەی کە لە موقەررەبینە، دەبوایە "علي الأعلی"ی هەڵبژاردایە. لەگەڵ دووپات کردنەوەی ئەوەی کە هیچ کەسێك ناتوانێت ئەم هەڵبژاردنە بە گوناه لە قەڵەم بدات.

ئێستا با لە دەلاقەی نموونەیەکەوە هەوڵ بدەین ڕۆشنایی زیاتر بخەینە سەر ئەم لایەنە: گریمان کەسێك دەیەوێت خەتمی قورئان بکات، دەبێت لە چەند ڕۆژدا ئەم خەتمە تەواو بکات؟ ئیدی لێرەدا لە نێوان دوو هەڵبژاردەدا سەرپشك دەکرێت؛ یەکەمیان ئەوەیە دەڵێت: وا باشترە بە تێڕامان و وردبوونەوە لە واتای ئایەتەکان، لە ماوەی دە ڕۆژدا خەتمی بکەم، کە لە ڕاستیشدا بەم شێوەیە ژیان لەگەڵ واتای ئایەتەکان و ڕۆچوون بە قووڵاییەکانی قورئاندا مەیسەر دەبێت. یان ئەوەیە دەڵێت: لە ماوەی حەوت ڕۆژدا خەتمی دەکەم، چونکە ئەم شێوازە، نیشانەی هۆگری و وابەستەیی زیاترمە بە فەرمایشتی پەروەردگارمەوە. بەڵام دواتر بڕیار دەدات بە دە ڕۆژ خەتمەکەی تەواو بکات، ئیتر بەم شێوەیە دەست دەکات بە خەتمەکەی.

ئێستا با وا دابنێین کە ڕەزامەندیی پەروەردگار لەگەڵ ئەوەدا بوو بە حەوت ڕۆژ تەواوی بکات. بەڵام ئەم مرۆڤە بە ئیجتیهادی خۆی بڕیاری دا بە دە ڕۆژ بیخوێنێ. ڕەزامەندیی پەروەدگار "علي الأعلی"یە. بەڵام خۆ ئەو کارەی ئەم کەسەش پێی هەستاوە هەر هیچ نەبێت "أعلی"یە. بەم پێیە، دەردەکەوێت کە گوناهێك لە ئارادا نییە تاکو بەو کەسە بوترێت: "کارەکەت هەڵە بوو، گوناهت ئەنجامدا." بەڵکو قورسترین شتێك کە دەکرێ بەو کەسە بوترێت ئەوەیە کە لە کاتێکدا باشترینی لەبەردەمدا بووە، ئەو چووە خۆی بە باشەوە خەریك کردووە. بۆیە بە هیچ شێوەیەك ڕەوا نییە گوناهی بدرێتە پاڵ.

جا ئیتر بارودۆخ و چۆنیەتیی ئەو کارانەش کە پێغەمبەران بە ئیجتیهادی خۆیان هەڵیان بژاردووە و ئەنجامیان داوە، ئا بەم شێوەیەیە. کەوابێ، کەی دروستە پێغەمبەران بەهۆی ئەم کردارانەیانەوە گوناهـ بدرێتە پاڵیان؟ لە بەشەکانی دواتردا، لە شوێنی خۆیدا دووبارە دەگەڕێینەوە سەر ئەم بابەتە.

**دووەم:** پێش هەموو شتێك، پێویستە ئەوە بزانین کە پێغەمبەران سەردار و پێشەوای هەموو موجتەهیدانن. بۆیە دەبینین لەو بابەتانەدا کە پەیامی خوای گەورەیان لەبارەوە پێ نەگەیشتووە، جا ئیتر ئەو بابەتانە، تایبەت بن بە ئەحکام، یان ژیانی کەسیی خۆیان، یاخود سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی بن، پێغەمبەران دێن و ئیجتیهاد دەکەن و ڕای خۆیان لە بارەیانەوە دەردەبڕن. وەك چۆن دەکرێ هەندێ لەو ئیجتیهادانەیان یەکاویەك لەگەڵ ویستی پەروەردگاردا یەك بگرێتەوە، بە هەمان شێوە دەکرێ هەندێکی تریان لەو ئاستەدا نەبن. بەڵام ئەوەندە هەیە کە تەواوی ئیجتیهادەکانیان لە چوارچێوەی ویستی ئیلاهیدا بەڕێوەدەچێت. جا ئیتر ئەگەر ئیجتیهادەکانیان تەواو تەبا و یەکاویەك نەبووبێت لەگەڵ موورادی ئیلاهیدا، ئەوا بەراورد بەو ئاست و پایەیەی ئەوانی تێدان، واتە؛ بە لەبەرچاو گرتنی ئەو ڕاستییەی کە ئەوان بەرچاوی کۆشکن و پەردەی سەرچاویان لادراوە و گوێبیستی جیرەی نووکی قەڵەمی قەدەرن، وا دادەنرێت کە هەڵەیان ئەنجام داوە. چونکە ئەوەی لەوان چاوەڕوان دەکرێت، هەڵبژاردنی ئەو شتەیە کە لە سەدا سەد لەگەڵ موورادی ئیلاهیدا یەك دەگرێتەوە. ئەم بەهەڵەدا چوونەشیان لە ئیجتیهادەکانیاندا هەرگیز گوناهـ نییە و عیصمەتەکەیان لەکەدار ناکات، تاکو بەم هۆیەوە لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکرێت. خۆ ئەگەر بەفەرزی مەحاڵ شتێکی واش ڕوویدات، ئەوا پێم وایە کاری بەندەگانی بەر قاپی نەبێت.

**سێیەم:** هاوشێوەی ئەم جۆرە سەرسم دانانە پێش پێغەمبەرایەتییان ڕووی داوە. بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنجی وشەکە بدەین، دەبینن کە ئێمە لێرەدا وشەی سەرسم

دانمان بەکارهێناوە. سەرسم دان؛ بە دەما کەوتنە سەر زەوی و تەخت بوون نییە. ئەوانەی بەردەوام وا سەریان لە سوجدەدایە، هەرگیز بەدەما ناکەونە سەر زەوی. ئەگەر لە سەرسم داندا پێ هەڵکەوتنێکی بچووك و سووکە لەتردانێکیش هەبێت، هەرگیز ناگاتە کەوتن تاکو وەك گوناهـ باس بکرێت.

با ئێستاش لەڕێی چەند نموونەیەکی بەرجەستەوە هەوڵ بدەین بڕوانینە ئەو لایەنانەی عەرزمان کردن. سەرەتا دەمەوێت سەرنجتان بۆ لای باوکی مرۆڤایەتی، حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ڕابکێشم.

## ١. حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ)

قورئانی پیرۆز لە شوێنێکدا کە باسی حەزرەتی ئادەممان بۆ دەکات، دەفەرموێت:

﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ۝ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴾

(طه : ١٢١-١٢٢)

"ئادەم سەرپێچی خوای خۆی کرد و لەڕێ لایدا. پاشانیش پەروەردگاری هەڵی بژارد و تۆبەکەی قبوول کرد و ڕێی ڕاستی نیشاندا."

هەروەك دەبینین لە ئایەتەکەدا دەستەواژەی "اجْتَبَى" بەکارهاتووە. "اجْتَبَى"ش بریتییە لەو کردەیەی کە نەهێڵیت شتێك بنیشێتە بنك و ببێت بە خڵتە. یان بەوێنەی کەف ئەملا و ئەولای پێ بکرێت. بۆیە لێرەدا خوای باڵادەست ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێت کە حەزرەتی ئادەمی لە کەوتنە ناو حاڵەتێکی وەهاوە قوتار کردووە. ئەو لایەنەشی کە لە وەرگێڕانەکەدا بە "سەرپێچی" ناومان بردووە، لە دواییدا باسی دەکەین و دەیسەلمێنین کە هەرگیز ناکرێت بە وەها کردارێك بوترێت سەرپێچی. ئێستاش با بە سەرنجەوە بەردەوام بین لە بەدواداچوونی حەزرەتی ئادەم.

گەر پێویست بکات گوێڕایەڵی لە یەکێکەوە فێربین، ئەوا پێویستە لە حەزرەتی ئادەمەوە (عَلَيْهِ السَّلَام) فێربین. ئەوەتا هەر ئەوەندەی سەرسمی داوە، یەکسەر ڕووی کردووەتە پەروەردگاری کە لە کەوتن پاراستوویەتی و بەدەم پاڕانەوە وتوویەتی:

﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾ (الأعراف : ٢٣)

"وتیان پەروەردگارا! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد. خۆ ئەگەر لێمان نەبووریت و ڕەحممان پێ نەکەیت، ئەوا دەچینە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە."

ئەمە زەللەیەك بوو. بەڵام ڕاستەوخۆ بەدوای ئەم زەللەیەدا، خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) حەزرەتی ئادەمی خستەوە سەر ڕێی ڕاست و هیدایەتی دا. لەمەشەوە دەگەینە ئەوەی کە زەللەکەی حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) بەر لە "إجتباء" بووە. دەتوانین بڵێین: حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) لەو قۆناغەدا نیمچە خەزانێکی بەسەردا هاتووە و گەڵاکانی کەمێك زەرد بوون، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز تووشی گەڵاڕێزان نەبووە. بەڵکو لەوانەیە بەوێنەی سرووتێك[1] لە ڕووی ڕەشەبادا چەمابێتەوە، بەڵام هەر کە ڕەشەباکە وەستاوە، ئەمیش وەك جاری جارانی ڕاست بووەتەوە و بە ڕۆحە سافەکەی شادبووەتەوە. بیریشمان نەچێت کە هەر پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) خۆی مرۆڤی باوەڕداری بە سرووت شوبهاندووە. بەم پێیە، کافریش لە حوکمی چناردایە. سەرەتا قەد و باڵای خۆی نمایش دەکات و دەچێت بە ئاسماندا، بەڵام هەر ئەوەندەی کەوت، ئیتر هەستانەوە و ڕێك بوونەوەی بۆ نییە.[2] جا بۆیە گەر ئەم تێڕوانینی سێیەمە بەهەند وەربگرین، ئەوا ئەم حاڵەتەی حەزرەتی ئادەم پێش پێغەمبەرایەتییەکەی بووە. دەتوانین ئەوانی تریش لەسەر ئەمە بپێوین.

١ سرووت: لاسکی دەغڵ و دانی وەکو گەنم و جۆیە.
٢ بخاري، مرضع ١، التوحيد ٣١؛ مسلم، صفات المنافقين ٥٨-٦٠.

هەروەها حاڵەتەکەی حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بریتی بوو لە نسیان و لەبیرچوونێك. ئەوەتا خوای گەورە بە سوێند و جەخت لێکردنەوە هەواڵی ئەم ڕەوشەی حەزرەتی ئادەممان پێ ڕادەگەیەنێت و دەفەرموێت:

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾

(طه : ١١٥)

"سوێند بێت بێگومان پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت، کەچی بیری چووەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە نەمانبینی پێداگری لەسەر (گوناهەکەی) بکات."

ئەمەش خۆی لە خۆیدا ڕوویەکە لە ڕووەکانی ئایەتەکە.

لە جێیەکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: "پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت و وتمان: 'ئەی ئادەم! خۆت و هاوسەرەکەت لەم بەهەشتەدا نیشتەجێ بن، لە هەرچی و لە هەرکوێ حەزدەکەن بە تێروپڕی بخۆن و بخۆنەوە. بەڵام نزیکی ئەم درەختە مەکەون، ئەگینا دەچنە ڕیزی ستەمکاران و ئەوانەی سنووریان بەزاندووە و لە ناز و نیعمەت بێ بەش بوون.' "[١]

بەڵام ئەو ئەمەی لەبیرچووەوە. جا بۆ نا، لە کاتێکدا لەبیرچوون لە داخوازییەکانی مرۆڤ بوونە! ئەوەتا کاتێك سەروەرمان ئەم بابەتە شی دەکاتەوە، دەفەرموێت: "ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەبیری چوو، نەوەکانیشی لەبیریان چوو."[٢] پێغەمبەری سەروەرمان کە بە جوانترین شێوە شارەزای فیترەتی مرۆڤە، بەو چەند وشەیەی سەرەوە، ئەم بابەتەی بە جوانترین شێوە بۆ پوخت کردووینەتەوە. بەڵێ، مرۆڤ شتی لەبیر دەچێت، حەزرەتی ئادەمیش (عَلَيْهِ السَّلَامُ) مرۆڤە، کەوابێ

---

١ بڕوانە: سوورەتی البقرة، ئایەتی ٣٥، سوورەتی الأعراف، ئایەتی ١٩.
٢ ترمذي، تفسير (٧) ٣.

ئەویش لەبیری دەچێت و لەبیریشی چوو. جگە لەوەی کە لە فەرمایشتەکەدا ئاماژە بە کاریگەریی هۆکاری بۆماوەیی کراوە لە بنیاتنانی کەسایەتی مرۆڤدا. ئەمەش بۆ خۆی سەرەداوێکە بۆ شارەزایانی ئەم بوارە.. کەواتە لە باوانمانەوە لەبیرچوونمان بۆ گواستراوەتەوە. خوای گەورە (جَلَّ جَلالُهُ) ئەم تایبەتمەندییەی لە ماهییەت و کرۆمۆسۆمەکانی ئادەمدا جێگیر کردووە؛ ئێمە ناتوانین ئەمە لە ناخماندا هەڵبکەنین و فڕێی بدەین. بۆیە پەروەردگار بە وتەی: فَنَسِيَ "لەبیری چوو" ئەو گومانە خراپە پووچەڵ دەکاتەوە کە دەرحەق بە حەزرەتی ئادەم دەبرێت و ڕاستەوخۆ بەدواشیدا دەفەرموێت: وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا "هەروەها نەمانبینی کە پێداگری لەسەر (گوناهەکەی) بکات." هەرچۆنێك بێت ڕێگاکە ڕایکێشا و بەرەو ئەو ناڕاستەیە بردی، بەڵام بیرمان نەچێت کە ئەو لە ئەنجامی لەبیرچوونەوە ئەم کارەی ئەنجامدا، گەرنا، کارێك نەبوو بە ویستی خۆی ئەنجامی بدات و پێداگری لەسەر بکات.

جا تۆ بڵێی ئەو میوە قەدەغەکراوە چی بووبێت؟ ڕاستییەکەی، ئەوەندە بیرورِا و تێڕوانینی زۆر و جۆراوجۆر هەیە لەو بارەیەوە، ئەگەر لێرەدا ئاماژە بە هەموویان بکەین، ڕەنگە ئێرە ببێتە دوکانی میوەفرۆشی. هەربۆیە خۆمان نادەین لە قەرەی ئەم بابەتە. جۆ، گەنم، برنج، خورما، ترێ و چەندانی تریش.. هەرکامێکیشیان بێت، هەڵبژاردنی یەکێکیان ئەنجامی بابەتەکە ناگۆڕێت. گرنگ ئەو حاڵەت و گرفتەیە کە لەپاش نزیکبوونەوە لەم میوە قەدەغەکراوەوە پەیدا بووە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی ئێمە کەمێك جیاوازترە لەوەی کە تا ئێستا وتراوە.

میوە قەدەغەکراوەکە ئەو هەستە مرۆییانەی حەزرەتی ئادەمە کە مەحاڵە بتوانێت لە بەرامبەریاندا خۆی ڕابگرێت. لە سایەی ئەم هەستەوەیە کە مرۆڤایەتی زیاد دەکات و بەردەوامی بە وەچەی خۆی دەدات. هەمان ئەو هەستە، لە ناخی

دایە حەواشماندا بوونی هەیە. خوا هەر خۆی باشتر دەزانێت، توخن کەوتنی ئەو "درەختە" بە واتای ئەنجامدانی ئەو کارە دێت کە بەردەوامیی وەچەی ئادەمی دەستەبەر دەکات.

سەرەڕای ئەمەش، ئێمە ناڵێین کە "ڕاستترین بۆچوون ئەمەیە." بەڵام بڕوامان وایە کە موتاڵاکردنی ئەم ئەگەرەش لەپاڵ ئەو ئەگەرانەی تردا کە تا ئەمڕۆ باسکراون، سوودی خۆی هەبێت. خۆ ئەگەر پێکامان ئەوا ئەمە لوتفی خوای گەورەیە، ئەگەر هەڵەش بوو، پەنا دەگرین بە ڕەحمەتە بێ پایانەکەی.

بەر لەوەی بچینە سەر حوکمی شەرعیی لەبیرچوون و هەڵەکردن، پێم باشە لێرەدا شتێکتان یاد بخەمەوە. لە قورئانی پیرۆزدا کاتێك چیرۆك و بەسەرهاتەکان دەگێڕرێنەوە، دەبینین کۆمەڵە ڕووداوێکی پچڕ پچڕ ڕێك دەخرێن، ئیتر چوارچێوەی گشتی بەسەرهاتەکە بەو شێوەیە دەردەکەوێت. لێرەشدا هەر هەمان شتە. لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا بە حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِالسَّلَامُ) و حەزرەتی حەوا وتراوە کە نزیکی میوە قەدەغەکراوەکە نەکەونەوە. بە هیچ جۆرێکیش دیار نییە ئەو ماوەیە چەندە کە پاش ئەم فەرمانە بەسەریاندا تێپەڕیوە. ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە ئەوەندە کات تێپەڕیوە بەس بێت بۆ ئەوەی حەزرەتی ئادەم ئەم فەرمانە لەبیر بکات. جا ئیدی توخن کەوتنی میوە قەدەغەکراوەکەش بەدوای ئەم لەبیرچوونەوەیەدا هاتووەتە گۆڕێ.

لەبیرچوونەوەش حاڵەتێکە قەڵەم تیایدا گوناه نانووسێت. پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰاللّٰهُعَلَيْهِوَسَلَّمَ) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ "قەڵەم لە ئاست ئەم سێ شتەدا لەسەر ئوممەتەکەم هەڵگیراوە: لەبیرچوون، هەڵە، هەروەها کاری بەزۆر."[1] ئەی مەگەر قورئان فێرمان ناکات کە

[1] طبراني، المجمع الصغير ٥٢/٢؛ بيهقي، السنن الكبرى ٦٠/١٠؛ إبن حجر، فتح الباري ١٠٢/٣؛ عجلوني، كشف الخفا ٥٢٢/١.

له وەها بارودۆخێکدا داوای لێخۆشبوون بکەین؟ ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾ (البقرة : ٢٨٦) "خوایە گیان لێمان مەگرە ئەگەر بیرچوونمان بەسەردا هات یاخود هەڵەمان کرد." ئەی مەگەر ئایا هەموو شەوێك پێش خەوتن ئەم دوعایە ناخوێنین؟

حەزرەتی ئادەم لەبیری چووەوە و بە هەڵە توخنی ئەو میوە قەدەغەکراوە کەوت، لەولاشەوە زۆرلێکردنی ئافرەت یاریدەدەر بوو بۆ ئەمە. ئەگەر ئەم ڕووداوە -بە گوێرەی فەرموودەکەی سەرەوە- لەو ساتەوەختی لەبیرچوونەوەیەدا ڕووی دابێت کە تیایدا قەڵەم هەڵدەگیرێت و گوناهـ نانووسرێت -کە هەرواش بووە- ئیتر چۆن دەتوانن حوکمی ئەوە بدەن کە حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) کەوتووەتە ناو گوناهەوە؟!

له کاتێکدا مرۆڤانی ئاسایی خۆیان لە ئەنجامدامی ئەو شتانە بەدوور دەگرن کە خوای گەورە بە ستەم و یاخیبوون ناوی بردوون، چۆن ڕێی تێدەچێت ئەو مرۆڤە هەڵبژاردانەی کە خوای گەورە خۆی هەڵی بژاردوون و شەرەفی پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیون، خۆیان لەو کارانە بەدوور نەگرن. بەڕاستی بەسەر زاردا هاتنی پێچەوانەی ئەمە، غەفڵەتێکی گەورە و گرانە. تەنانەت گەورەکانمان بە دروستیان نەزانیوە ئەم ئایەتە لە چوارچێوەی ئەم مانایەدا بخوێنرێتەوە. گرفتێك لەوەدا نییە مرۆڤ بە مەبەستی تەفسیر، ئایەتی: ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾ (طه : ١٢١) بخوێنێتەوە و ماناکەشی لێکبداتەوە. بەڵام دووبارەکردنەوەی بەبێ ئامانجێکی دیاری کراو و هەروا بۆ خۆشی و بە شێوەیەك کە سەربکێشێت بۆ هەڵە تێگەیشتن، ئا ئەمەیان کارێکی ڕێگە پێ نەدراوە. چونکە حەزرەتی ئادەم پێغەمبەرە. باسکردنی پێغەمبەریش وەك ئەوەی باس لە هەر مرۆڤێکی تری ئاسایی بکەیت، کارێکی دروست و ڕەوا نییە.

لە لایەکی ترەوە، شێوازی دەربڕینی قورئان لەمەڕ پێغەمبەران، لە ڕوانگەی

کردەوەکانیانەوە نییە، بەڵکو لە گۆشەنیگای نزیکییانەوەیە لە خوای گەورە. پێشینان بەم چەند وشەیە گوزارشتیان لەم ڕاستییە کردووە: حَسَنَاتُ الْأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِينَ "ئەو کار و کردەوانەی کە بۆ گرۆی "ئەبرار" بە چاکە دادەنرێت، گەر گرۆی "موقەررەبین" ئەنجامی بدەن، ئەوا بە خراپە بۆیان دەنووسرێت."[1]

بەڵێ، تەنانەت لە یاسا زەمینییەکانیشدا ئەگەر فەرمانبەری دەوڵەت هەستێت بە ئەنجامدانی تاوانێك، ئەوا سزاکەی لە ڕادەی ئاسایی خۆی زیاتر دەکرێت. خۆ ئەگەر تاوانبار کەسێکی یاساناسی وەك دادوەر یان پارێزەر بێت، ئەو کات بۆی هەیە سزاکەی چەند قات بکرێت.

پێغەمبەرانێك کە فەرمانبەرانی حەق تەعالان و لە هەموو کەس چاکتر دەرەنجامی گوناه دەزانن. هەڵبەتە کە گوناهیان زۆر سەختتر و توندتر دەبێت.

ئەی مەگەر ئەو گوناهەی لە کەعبەی پیرۆزدا دەکرێت، لەو گوناهە بە گەورەتر دانانرێت کە لە شوێنانی تردا دەکرێت؟[2] ئەی مەگەر قورئانی پیرۆز بە خێزانە پاکەکانی پێغەمبەری خوا نافەرموێت کە ئەگەر گوناه ئەنجام بدەن ئەوا سزایان دوو هێند دەبێت؟[3] ئاخر کەعبەی پیرۆز نیشانەی دراوسێیەتی خوای گەورەیە. ئەو کەسەی لەوێدایە بە میوانی خوای گەورە هەژمار دەکرێت. بوون بە هاوسەری پێغەمبەری خواش (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) دیسانەوە مانای نزیکی لە خوای گەورەوە دەگەیەنێت. چونکە خانەی پێغەمبەر، ئەو خانەیەیە کە هەموو کات سروەی وەحی تیایدا شنەی دێ و حەزرەتی جوبرەئیلیش بەردەوام هاموشۆ دەکات. جا ئیدی ئەو گوناهانەی کە لە شوێنێکی ئاوەهادا و لە ماڵێکی لەو شێوەیەدا ئەنجام دەدرێن، بێگومان سزاکەشیان سەختتر و چەند هێندەترە. دەستووری اَلْمَغْرَمُ بِحَسَبِ الْمَغْنَمِ

١ عجلوني، كشف الخفا ٤٢٨/١.
٢ قرطبي، الجامع لأحكام القرءان ٤٩/٣.
٣ بڕوانە: سورەتی الأحزاب، ئایەتی ٣٠/٣٣.

داخوازی ئەمەیە. بێگومان بەرێژەی پاداشت، زەحمەتیش زیاد دەکات.

حاڵی پێغەمبەرانیش بەم شێوەیەیە. ئەوەتا ئەوان ئەو مرۆڤە هەڵبژاردانەن کە شەرەفمەندی حوزوور بوون. هەموو ساتێك لە دیداری فریشتەی وەحیدان و دڵیان لە ئامادەباشیدایە بۆ وەرگرتنی وەحی. جا مادام وایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە بچووکترین ئەو زەللانەش کە دێتە ڕێیان، لەسەر شێوەی گوناهـ دەردەکەوێت و ناوونیشانی گوناهی بەسەردا دەبڕرێت. چونکە ئەو مەقامەی ئەوانی تێدان، داخوازی ئەم جۆرە مامەڵەیەیە. بەڵام دیسانەوە خۆم بە ناچار دەزانم ئەوە دووپات بکەمەوە کە ئەم گوناهـ و سزایە، هەرگیز ئەو گوناهـ و سزایە نییە کە لە گۆشەنیگای تێڕوانینی ئێمەوە یاخود وەلییەکەوە بۆ گوناهـ و سزا هەڵبسەنگێنرێت. بەڵکو ئەمە زەللەیەکە کە بەتەواوەتی لە ڕوانگەی حاڵەتی تایبەتی پێغەمبەران خۆیانەوەیە (عَلَيْهِمُ السَّلَام) وا وەك گوناهـ دەردەکەوێت. کەوابێ دروست نییە پێی بوترێت گوناهـ.

لە لایەکی تردەوە، با بڵێین خوای گەورە فەرمانی بە حەزرەتی ئادەم کردووە کە بەرامبەر بە هاوسەرەکەی بەرۆژوو بێت.. حەزرەتی ئادەمیش (عَلَيْهِ السَّلَام) بەهۆی ئەوەی کە ناوی هەموو شتێکی فێرکرابوو، بە شێوەیەك لە شێوەکان دەیزانی ئەم ڕێیە بەرەو کوێ دەڕوات و چی بەسەر دێت. بەڵێ، دەیزانی ئەو چەرخە خلۆکەی چووەتە ناوی، هەڵاوگێڕی دەکات و ئەملا و ئەولای پێدەکات و -بە ڕەچاوکردنی مەیلانێکی سروشتیی بە ڕواڵەت بەهۆکراو- بەرەو خاڵێکی دەبات کە پێشتر دیاریکراوە. جا ئەگەر ئەم حاڵەتە لەبیرچوونەوە نەبێت -کە قورئانی پیرۆز بە لەبیرچوونەوە ناوی دەبات- ئەوا حەزرەتی ئادەم بە نەرمونیانی پێشوازیی لەو چرکەساتە کردووە کە تیایدا ئیرادەی مرۆڤ و ویستی پەروەردگار لە نێوەندی ڕازاوی بوونێکدا یەکیان بڕیوە و کاریگەرییان لەسەر ئەنجامەکە هەبووە، ئیتر بەم شێوەیە ئەو زەللەیە ڕوویداوە کە دەیزانن. جا ئێستا دەپرسم: چۆن و بە چ چەشنێك دەکرێ بەمە بوترێت "گوناهـ"؟!

جا مادام باسەکە گەیشتە ئێرە، بە باشی دەزانم ئەم ڕووداوە بگێڕمەوە کە ئیمامی بوخاری و تیرمیذی ڕیوایەتیان کردووە: پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) دەفەرموێت:

حەزرەتی ئادەم و حەزرەتی موسا لە ئاسمان بەیەك دەگەن. حەزرەتی موسا بە حەزرەتی ئادەم دەفەرموێت: "تۆیەك کە باوکی مرۆڤایەتیت، کەچی ئێمەت لە بەهەشتەوە هێنایە سەر زەوی." حەزرەتی ئادەمیش بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە: "ئەی تۆیەك کە کەلیمی خوایت و پەروەردگار ڕاستەوخۆ لەگەڵت دواوە، مەگەر لە تەوراتدا ئەو دەستەواژەیەت بەرچاو نەکەوتووە کە دەڵێت: چل ساڵ پێش ئەوەی ئادەم ئەو میوەیە بخوات، ئەوە لە قەدەریدا نووسرابوو." پاش گێڕانەوەی ئەم دیدارەی کە تایبەتە بە جیهانی بەرزەخەوە، سەرووەرمان سێ جار دەفەرموێت: "ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) موسا (عَلَيْهِ السَّلَام)ی بێدەنگ کرد."[1] ئەمەش لە ڕوویەکەوە لەسەرحەق بوونی حەزرەتی ئادەممان پێ ڕادەگەیەنێت. لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە: حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) بە ئەنجامدانی ئەو کردارە نەکەوتووەتە ناو گوناهەوە.

گشت ناوەکان -بەم پێیە گشت ناولێنراوەکانیش (الأسماء والمسميات)- فێری ئەو کرابوو. ئەو، سەرمەست لەنێو دنیای پڕنهێنی "أسماء"دا ژیانی بەسەر دەبرد.. ئەگەری ئەوەی کەسێکی وا بە ئەنقەست و بە ویستی خۆی گوناه ئەنجام بدات، لە ڕاستیدا نابەجێترین ئەگەرە و نیشانەی بێ ئاگاییە. ئەگەرێکی تریش ئەوەیە کە: قەدەغەبوونی ئەو میوەیە، کاتیی بووە و حەزرەتی ئادەمیش ئەمەی زانیوە. بەڵام هەستا ئیجتیهادی کرد و پێش وەختی خۆی دەستی برد بۆ میوەکە؛ بەم شێوەیەش ڕۆژووەکەی شکاند. بەڵێ، ئەو کردارەی وا ئەمرۆکە بە ئەنجامدانی لە بازنەی حەڵاڵدا مرۆڤ پاداشتی دەست دەکەوێت، ئەو ڕۆژە بۆ حەرزەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) کە لەو پێگەیەدا بووە، بە شێوەیەکی کاتی قەدەغە کراوە. یاخود ئەم قەدەغەکردنە

---

١ بخاري، القدر ١١؛ مسلم، القدر ١٣.

بەگوێرەی نزیکیی ئەوەوە بووە لە خوای گەورە. بۆیە کردارەکەی بە لادانێك، یاخود زەللەیەك بۆ لەقەڵەم دراوە.

ئەو پێوەر و تێڕوانینەی سەبارەت بە حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) هەوڵماندا بیانخەینە ڕوو، لە تێگەیشتنی بارودۆخی پێغەمبەرانی تریشدا دەبنە یاریدەدەر بۆمان. بەڵێ، تێدەگەین کە پێغەمبەران بە سیفەتی عیصمەت ئارایشت دراون و، ئەو هەڵە و زەللانەش کە دەدرێنە پاڵیان، هەرگیز بەو جۆرەی کە ئێمە لێی حاڵی بووین بە گوناهـ دانانرێن.

## ٢. حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام)

حەرزەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام) لەپێناو ڕزگاربوونی کوڕەکەیدا، لە حوزووری پەروەردگاردا موناجات دەکات و لەسەر ئەمەش ئاگادار دەکرێتەوە. ئەمەش لە یەکەم ڕوانیندا بۆ پێغەمبەرێك بە زەللە دێتە پێشچاو. ئێستا با سەرنجی خۆمان لە ئاست ئەم حاڵەتەی باوکی دووەمی مرۆڤایەتیدا چڕ بکەینەوە و، لەژێر ڕۆشنایی قورئاندا هەر هیچ نەبێت هەوڵ بدەین لە چوارچێوەی ئەم ڕووداوەدا لە نزیکەوە ئەم مرۆڤە مەزنە بناسین:

لە قورئانی پیرۆزدا دوعاکەی حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام) و وەڵامی خوای باڵادەست بۆی و ئاگادارکردنەوەی بەم شێوەیە باسکراوە:

﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ (هود : ٤٥)

"نوح هاواری بۆ لای خوای خۆی برد و وتی: پەروەردگارا! کوڕەکەم لە خێزانی خۆمە. بێگومان پەیمانی تۆیش ڕاستە و (کاتی خۆی فەرمووت خێزانی

تۆ ڕزگارن لە تیاچوون) و تۆیش زاناترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانیت.“

حەزرەتی نوح (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) لەتاو ئەم ڕووداوە چاوەڕوانکراوە کە بەسەر ئوممەتەکەیدا هاتبوو، تووشی سەغڵەتی و پەشۆکان بووبوو. بە تایبەتیش پەرۆشی عاقیبەتی کوڕەکەی بوو و پەرۆشییەکەشی بەس بوو بۆ لەرزە پێخستنی مرۆڤێك. داخۆ ئەم سەغڵەتی و پەشۆکانەی لەتاو ئەوە بوو کە کوڕەکەی خەریکبوو دەخنکا، یاخود لە ترسی ئەوە بوو کە کوڕەکەی لەنێو گێژاوی کوفردا نوقم دەبوو؟ بەدڵنیاییەوە خەم و پەرۆشیی ئەو حەزرەتی نوحەی کە سەرەنجامی دواڕۆژ و بەختەوەریی هەتاهەتایی و سزای هەمیشەیی دەبینی و، تەماشای غەزەب و ڕەحمەتی پەروەردگاری دەکرد، لە ترسی دنیا و جسمانییەت و جەستەی کوڕەکەی نەبووە. جا چ باوکێك هەیە لە بەرامبەر تیاچوونێکی جەرگبڕی لەو جۆرەی ڕۆڵەکەیدا نەناڵێنێ؟ ”پەروەردگارا! تۆ خۆت پەیمانی ئەوەت پێدابووم کە خاووخێزانەکەم لەناو نەبەیت. دەی خۆ سوارنەبوونی ئەم کەشتییە، تیاچوونێکی ئاشکرایە و کوڕەکەشم وا لەنێو ئەوانەدا.“ بەڵێ، وتەکانی حەزرەتی نوح ئەمانە بوون.

لە بەرامبەر ئەم نرکە و ناڵینەدا، خوای باڵادەست بەم شێوەیە ڕووی ڕاستەقینەی مەسەلەکەی فێردەکات و دڵی دەداتەوە:

﴿ قَالَ يَـٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَـٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ (هود : ٤٦)

”ئەی نوح! ئەو لە خێزانی تۆ هەژمار ناکرێت، چونکە بەڕاستی ئەو کارێکی خراپی ئەنجام داوە. کەوابوو داوای شتێکم لێ مەکە کە زانیاریت لەبارەیەوە نییە. با ئەمەش ئامۆژگارییەك بێت بۆ تۆ، خۆت مەخەرە ڕیزی نەزانانەوە.“

ئەو لە خاووخێزانی تۆ نییە. بەڵێ، ڕاستە ئەو لە پشتی تۆ و لە هاوسەرەکەت هاتووەتە دنیاوە.. لە بێشکەی ئێوەدا و بە لایلایەی ئێوە گەورە بووە. بەڵام

خاووخێزانی تۆ، ئەوانەن کەوا لەسەر ڕێبازەکەتن. چونکە ئەو کارێکی نابووتی ئەنجام داوە و چووەتە نێو بازنەیەکی خراپەکێشەوە. لە تۆ یاخی بوو و چووە نێو ڕیزی کافرانەوە. ئەوانیش پەلیان گرت و بردیان تا لە ئاودا خنکاندیان، ئەم خنکانەشی دووچاری نوقم بوونی ئەبەدیی کرد. داوای شتێکم لێ مەکە کە زانیاری تەواوت نییە لەبارەیەوە! ئامۆژگاریت دەکەم تاوەکو نەچیتە ڕیزی نەفامانەوە. تۆ مەردی مەیدانی زانست و مەعریفەت و مەحەببەتیت و بادەنۆشی مەعریفەتی ئیلاهیت. جا بۆیە ئەم دوعا و داواکارییە لە پێغەمبەرێکی وەك تۆ ناوەشێتەوە کە موقەررەبیت و لە خۆمەوە نزیکیت.

ئەو زەللەیەش کە لە ژیانێکی نۆسەد و پەنجا ساڵیدا دراوەتە پاڵ حەزرەتی نوح، تەنها خۆی لەمەدا دەبینێتەوە. لە سەروبەندی نوقم بوونی کوڕەکەیدا، ڕوو دەکاتە خوای باڵادەست و بۆ ڕزگاربوونی کوڕەکەی دەپاڕێتەوە. باشە، ئایا دەبێت حەزرەتی نوح بۆچی دوعای کردبێت و بۆچی پاڕابێتەوە؟

**یەکەم:** وەك لە ئایەتەکەشدا هاتووە، خوای باڵادەست پێی ڕاگەیاندووە کە خاووخێزانەکەی و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سواری کەشتییەکە بکات. ئایەتەکە ئەم لایەنەمان بەم شێوەیە بۆ باس دەکات:

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ﴾ (هود : ٤٠)

"جا کاتێك فەرمانمان دەرچوو (بە لەناوبردنی بێباوەڕان) و لە تەنوورە پڕ ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد (کە ئەوە نیشانەی دەست پێکردنی تۆڵە خواییەکە بوو)، ئەوسا وتمان: لە هەر ڕەگەزەو جووتێك و خاووخێزانەکەت جگە لەوانەی کە حوکممان بەسەردا داون، هەروەها باوەڕدارانیش سواری کەشتییەکە بکە."

ئەمە ئەو پەیمانەیە کە حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام) لە خوای باڵادەستی وەرگرتووە.

نیتر ئەویش لەسەر بنەمای ئەم پەیمانە داوایەکی لەو جۆرەی لە خوای گەورە کردووە. تا ئەو ساتەوەختەش نەیدەزانی کە کوڕەکەی حوکمێکی وای لەسەر دراوە. کەوابێ داواکارییەکەی حەزرەتی نوح (عَلَيْهِالسَّلَامُ)، جگە لە باس کردنی پەیمانەکەی خوای گەورە شتێکی تر نییە.

حەزرەتی نوح بە وەحیی پەروەردگار دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتییەك و، هەر بە فەرمانی ئەویش خەڵکی بۆ لا بانگ کرد. گومانیشی تێدا نییە لەنێو ئەو خەڵکانەی بانگی کردبوون، ئەندامانی خێزانەکەی خۆیشی تێدابووە. لە ڕاستیدا خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) پێی وتبوو کە ئەندامانی خێزانەکەی، واتە "أهل"ەکەی سواری کەشتییەکە بکات. خوای گەورە وەهای پێ وتبوو، بەڵام وا کوڕەکەی بە بەرچاوی خۆیەوە لەگەڵ شەپۆلەکاندا لە زۆراندا بوو. لەم چرکەساتە سەختەدا کە هەموو دەرگاکانی ڕزگاری بەڕوویدا داخرابوون، ڕووی کردە دەرگانەی ئەو زاتەی کە هەموو گرێ کوێرەکان دەکاتەوە و بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەی لێی پاڕایەوە. بارودۆخەکە بەجۆرێك بوو، نە ڕێگەچارەیەك مابوو پەنای بۆ بەرێت، نە لقێکیش هەبوو جگە لە دوعا دەستی لێ گیر بکات.

کاتێکیش هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە کوڕەکەی لە ئەهلی ئەو نییە، لە پەلوپۆ کەوت.. ئاخر چونکە ئاگاداری ئەمە نەبوو، لەبەر ئەوەیش کە کوڕی خۆی بوو، هەر وای دەزانی لە خێزانی خۆیەتی. کتومت بەو شێوەیە بوو؛ چونکە هەر کە وریاکردنەوەکەی بیست، بەبێ دواکەوتن یەکسەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری و کەوتە نزا و پاڕانەوە:

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ (هود : ٤٧)

"پەروەردگارا! پەنات پێدەگرم لەوەی داوای شتێکت لێبکەم کە زانیاریم

لەبارەیەوە نییە. خۆ ئەگەر لێم نەبووریت و ڕەحمم پێ نەکەیت، ئەوا دەچمە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە."

لەمەوە بەڕوونی دەردەکەوێت کە ئەو وەختەی حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەم داواکارییەی لە بەردەرگانەی پەروەردگاریدا عەرز کردووە، ئاگاداری ئەم حاڵە نەبووە و پێی نەزانیوە. کاتێکیش پێی زانیوە، ڕاستەوخۆ لە ویستەکەی پەشیمان بووەتەوە و داوای لێخۆشبوونی کردووە. ڕوو دەکەمە جەنابتان، ئاخر چۆن دەکرێت بە وەها هەڵوێستێك بوترێت هەڵە، لە کاتێکدا ویژدانی مرۆڤ وەك ئاسۆیەك تەماشای ئەمە دەکات و سەری ڕێز لە ئاستیدا دادەنەوێنێت؟

**دووەم:** داواکارییەکەی حەزرەتی نوح چی بوو؟ خۆ ئەگەر داوای هیدایەتی کردبێت لە خوای گەورە بۆ کوڕەکەی، ئەوا چ شتێك لەوە سروشتیتر هەیە باوکێك بەرامبەر ڕۆڵەکەی ئەنجامی بدات؟ نەخوازەڵا باوکێکی وا کە لە هەمان کاتدا پێغەمبەرە و بە تەنگ هیدایەتی سەرجەم مرۆڤایەتییەوەیە. چ شتێك لەوە ئاساییتر، بگرە گەورەترە بۆ کەسێك کە سۆز و بەزەییەکەی هێندە فراوان و بەرین بێت، بەزەیی بە ڕۆڵەکەیدا بێتەوە و دوعای بۆ بکات و سەرفرازیی ئەبەدیی بۆ بخوازێت؟

بەڵێ، لێرەدا خۆمان لە بەرامبەر شەفەقەتێکی پێغەمبەرانەدا دەبینینەوە. خۆ ئەگەر ئەو شەفەقەتەی لەواندا هەبووە لەودیو سنووری ئیدراکی ئێمەوە نەبوایە و زۆر جیاواز نەبوایە، ئەوا مەحاڵ بوو بتوانن شان بدەنە بەر باری قورسی پێغەمبەرایەتی و بیبەن بەڕێوە. بڕواننە دایك! بۆ ئەوەی جگەرگۆشەکەی لەئامێز بگرێت و بەدەم بەجێهێنانی هەموو داواکارییەکیەوە ڕاپەڕێت، دەبێت سروشتی لێوان لێو بێت لە سۆز و بەزەیی. ئەی دەڵێن چی ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەرێك بێت، بگرە لە گەورە پێغەمبەران بێت و ئامێزی بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی کردبێتەوە و عەودالی بەجێهێنانی تەواوی خواستە ڕەوا دنیایی و ئاخیرەتییەکانیان بێت و لەو

پێناوەدا خەوی لێ تاڵ بوویێت..!

کاتێك قورئانی پیرۆز باسی سەروەرمان دەکات، حاڵەتی ڕۆحیی ئەو نازدارەمان لە بەرامبەر موشریکاندا بەم شێوەیە بۆ شیکار دەکات:

﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ (الكهف : ٦)

"هەر لەبەر ئەوەی باوەڕ بەم وتەیە (قورئان) ناهێنن، هێندەی نەماوە خۆت لەناو ببەیت و لە داخ و خەفەتدا بمریت."

پێغەمبەری خواش (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بارودۆخی خۆی بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە و لەو بارەیەوە ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە:

إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ أُمَّتِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَاراً فَجَعَلَتِ الدَّوَابُّ وَالْفَرَاشُ يَقَعْنَ فِيهَا فَأَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ وَأَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهَا

"نموونەی من و ئوممەتەکەم لە نموونەی مرۆڤێك دەچێت ئاگرێکی کردبێتەوە. مێروو و پەروانەش (ئەوانەی ئاگرەکەیان دیوە) دەوری دەدەن و دەکەونە ناوی. بەڵێ، من دەستم لە کەمەرتان گیر کردووە و ڕاتان دەکێشم، کەچی ئێوە ملتان ناوە و بەرەو ئاگرەکە دەڕۆن."[١]

ئەگەر شەفەقەتی پێغەمبەرانە ئەمە بێت، دەی خۆ حەزرەتی نوحیش پێغەمبەرە و ئەویش هەڵگری هەمان شەفەقەت بووە...

بەڵام ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەوەیە کە: هەر کە حەزرەتی نوح ئاگادارکردنەوەکەی بیست، دەستبەجێ گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە و دەستی لە دوعاکەی هەڵگرت و داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری کرد.

١ بخاري، الأنبياء ٤٠، رقاق ٢٦؛ مسلم، فضائل ١٧-١٩.

ئێستاش با پێکەوە لێکچوونی نێوان دوعاکەی حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ‌السَّلَامُ) و نزا و پاڕانەوەکەی حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ‌السَّلَامُ) ببینین.. ئەوەبوو هەردووکیان پاش ئەوەی زانیان هەڵەیان کردووە، یەکسەر ڕوویان کردە پەروەردگار و بە هەمان ئەدا و شێواز و لەنێو هەمان کەشدا دەستی نزایان بەرز کردەوە. ئاخر چونکە هەردووکیان زادەی هەمان هەوێن و هەمان سروشت بوون، لە هەمان مەدرەسەدا خوێندبوویان و لە لای هەمان "مامۆستا"ش وانەیان وەرگرتبوو. لەبەر ئەوە گەڕانەوەشیان لە هەڵە بە هەمان شێوە دەبوو. بۆیە کاتێك قورئانی پیرۆز "إنابة" یاخود "أوبة"ی ئەم دوو زاتەمان بۆ باس دەکات، هەمان شێواز بەکار دەهێنێت، ئەگەرچی بە چەند وشەیەکی جیاوازیش بێت.

**سێیەم:** دەستوورێکی شەرعیمان هەیە دەڵێت: "ئێمە بەپێی ڕواڵەت بڕیار دەدەین."[١] هەر لەسەر بنەمای ئەم دەستوورە بوو کە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەشداری لە پرسەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولدا کرد، سەرەڕای ئەوەی دەیزانی موونافیقیشە. بە هەمان شێوە چەندین موونافیقی تریشی بەرێ کردووە و پەردەی سەر ڕووی هەڵنەماڵیون.[٢] هۆکاری ئەمەش، دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسانە لە ڕواڵەتدا نوێژی خۆیان دەکرد و ڕۆژوویان دەگرت و ئەرکە ئایینییەکانیان بەجێ دەهێنا. جا بۆی هەیە کوڕەکەی حەزرەتی نوحیش لە حاڵەتێکی ئاوەهادا بووبێت. لەوانەیە هەردەم وەك موسوڵمان خۆی نیشان دابێت، بەڵام لە ناخەوە موونافیق بووبێت. یاخود دەکرێ نیفاقەکەی ڕێك لەو کات و شوێنەدا سەری دەرهێنابێت. حەزرەتی نوحیش بە گوێرەی ڕواڵەتی دەرەوەی حوکمی داوە و بە یەکێك لە خانەوادەکەی خۆی دایناوە. بڕیاردانیش بەپێی ڕواڵەت، هەرگیز گوناه نییە. کەواتە حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ‌السَّلَامُ) هەرگیزا و هەرگیز گوناهی ئەنجام

---

١ الرازي، محصول ٥٣٨/٥؛ آمدي، إحكام ٣٤٣/١؛ إبن كثير، تحفة الطالب ١٧٤/١؛ إبن حجر، تلخيص الحبير ١٩٢/٤.
٢ بخاري، تفسير (٩) ١٢، ١٣.

نەداوە؛ بەڵكو بە ئەركی سەرشانی خۆی هەستاوە. ئاخر ئێستا بیهێنە پێشچاوی خۆت: ئەو پێغەمبەرە مەزنە ٩٥٠ ساڵ ڕەنجی داوە، ڕاكەڕاكی كردووە، گاڵتەی پێكراوە و بە شێت بانگكراوە، بەڵام ئەو هێندەی سەرە دەرزییەكیش چییە لەرزەی پێ نەكەوتووە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز خۆی باسی كەمیی ژمارەی ئەو كەسانەمان بۆ دەكات كە باوەڕیان پێی هێناوە: ﴿وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ (هود : ٤٠)
"جگە لە كەسانێكی كەم، كەس لەگەڵیدا ئیمانی نەهێنا."

هەركەسێك دەیەوێت لە حەزرەتی نوح (عَلَيْهِ السَّلَام) تێبگات، ئەوا با بەوردی لە سورەتی نوحدا بەدواداچوونی بۆ بكات. ئەوسا تێدەگات كە ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە بە ئەندازەی دووری نێوان عەرش و فەرش، لە گوناه دوور و پاك و بێگەردە. دەسا خوای باڵادەست بەر شەفاعەتی پێغەمبەری سەروەر و حەزرەتی نوحیشمان بخات.. (ئامین)

## ٣. حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام)

...ئینجا دێینە سەر باسی باوكی پێغەمبەران، حەزرەتی خەلیل.. ئەو مرۆڤە نەبەردەی لە هیچ نەسڵەمیوەتەوە و لە ئاست هیچ شتێكدا چاوی نەتروكاندووە. ئەو ڕۆحە مەزنەی، وەختێ خرایە نێو ئاگرەوە، بە "بَرد" و "سَلام" پێشوازی لێكرا. ئەو پوختەی مرۆڤە هەڵبژاردانەی كە بەهەشتی لە ناخیدا هەڵگرتبوو و بۆ هەر شوێنێك بچوایە -تەنانەت گەر دۆزەخیش بووایە- ئەو شوێنەی دەگۆڕی بە بەهەشت. لە كاتێكدا هەركەسەو بە گێڕانەوەی بنەچەی خۆی بۆ سەر پێغەمبەری خوا دڵخۆش دەبێت، كەچی ئەو سەروەرە دڵخۆشی خۆی بە چوونەوە سەر حەزرەتی ئیبراهیم دەردەبڕی و دەیفەرموو:

"من له ئیبراهیمی باپیره گەورەم دەچم."[1] ئێستاش با توێشووی تێفکرین بدەین به کۆڵی هزردا و ببینه ڕێبواری ڕێی عیصمەتی ئەم پێغەمبەره مەزنه.. لەوێش جارێکی تر ماهییەتی ڕاستەقینەی عیصمەت ببینین.

## ئەستێرەکان و مانگ و خۆر

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) له هیچ قۆناغێکی ژیانیدا نەکەوتووەته نێو شیرکێکی وەك ئەستێره پەرستییەوه. ئەوەش که تەماشای مانگ و خۆر و ئەستێرەکانی کردووه و دانه دانه به "ربي" ناوی بردوون، نه له دوور نه له نزیك هیچ پەیوەندییەکی به پەرستنیانەوه نییه. ئێستاش با دیسانەوه قورئانی پیرۆز بکەینەوه چاوساغمان و له ڕوانینگای ئایەتەکانیەوه بڕوانینه ئەم بەسەرهاتە:

﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأَفِلِينَ ۝ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ۝ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾

(الأنعام : ٧٦-٧٨)

"کاتێك شەو داهات، ئەستێرەیەکی دی ئەوسا وتی: ئا ئەوەیه پەروەردگاری من(!)، بەڵام کاتێك ئەستێرەکه ئاوا بوو، وتی: من شتی ئاوابوو و بەسەرچووم خۆشناوێت.

ئینجا کاتێك هەڵهاتنی مانگی دی، وتی: ئا ئەوەیانه پەروەردگاری من! وەختێ مانگیش ئاوا بوو، وتی: سوێند بێ ئەگەر پەروەردگارم ڕێی ڕاستی

---

١ بخاري، تفسير (٢١) ٨؛ مسلم، إيمان ٢٧٠-٢٧٢.

نیشان نەدامایە، ئەوا بێگومان دەچوومە ڕیزی گومڕایانەوە.

ئەوجا کاتێك هەڵهاتنی خۆری دی، وتی: پەروەردگاری من ئا ئەمەیە! ئەوەتا ئەمەیان گەورەترە. کاتێك ئەویش ئاوا بوو، وتی: ئەی گەلەکەم، بەڕاستی من دوورم لەو شتانەی ئێوە کردووتانن بە هاوەڵ و شەریك."

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) هەر کە لەدایك بووە، بە حەنیفی لەدایك بووە. بۆیە هەرگیز ڕێی تێناچێت بە واتا ڕاستەقینەکەی بە ئەستێرە و مانگ و خۆری ناو ئایەتەکەی وتبێت "پەروەردگارم". خۆ ئەگەر بمانەوێت بانگەشەیەکی لەم جۆرە بکەین، ئەو کات پێویست دەکات ئەو ئایەتە بە نەبوو دابنێین کەوا لە پێش ئەم ئایەتانەوە هاتووە، مەبەستم لەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ (الأنعام : ٧٤)

"ئیبراهیم بە ئازەری باوکی وت: ئایا تۆ ئەو بتانە بە خوای خۆت دەزانیت؟ ڕاستییەکەی خۆت و هۆزەکەشت لەنێو گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینم."

ئایەتی دواتریش بەم شێوەیەیە:

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴾

(الأنعام : ٧٥)

"جا ئیتر بەم شێوەیە مەلەکووتی ئاسمانەکان و زەویمان پیشانی ئیبراهیم دا، تاوەکو لەوانە بێت کە بە پلەی یەقین گەیشتوون."

جا ئیتر چۆن ڕێی تێدەچێت پێغەمبەرێکی پڕچەك بەم هەست و هزرە و، کراوە بەڕووی ئەم چەشنە لە جیهانە پەنهانەکاندا -با بۆ ماوەیەکی کاتییش بێت- بە ئەستێرەکان بڵێت: "پەروەردگارم". بیروڕای ئێمە ئەمەیە، کتێبە پڕ لە

ئەفسانەکانیش چی دەڵێن با بیڵێن. ئەمە جگە لەوەی کە نەك بەتەنها جیهانی مولك، بەڵکو جیهانی مەلەکووت (واتە پشت پەردەی بوون)یشی پیشاندراوە.. ئەویش لە سایەی ئەمەدا چووە ڕیزی بە یەقین گەیشتووانەوە. نەك هەر گەیشت بە یەقین، بەڵکو بە ئاسمانی "حق الیقین"دا پەروازی دەکرد، کە دواهەمین قۆناغی یەقینە. بەم پێیە، پاش ئەوەی دوو ئایەتی سەرەتا باسی ئەوەیان بۆ کردین کە چۆن حەزرەتی ئیبراهیم گەیشتووە بە حەق تەعالا و بە چ شێوەیەك ئامادەباشی تێدابووە بۆ گەیشتن بە پلەی یەقین، ئەم چەند ئایەتی دوایی دێن و ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە چۆن حەزرەتی ئیبراهیم لە دووتوێی ئەو ڕووداوەدا ویستوویەتی وانەیەك فێری گەلەکەی بکات. کەوابوو پێویستە لەم سۆنگەیەوە بڕوانینە بابەتەکە و لە گۆشەی ئەم تێڕوانینەوە سەرلەنوێ خوێندنەوەی بۆ بکەین.

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە گەلەکەی حەزرەتی ئیبراهیم ئەستێرەیان دەپەرست. هەمان دیاردە لە سەردەمی نەفامیشدا دەبینین. سەردەمانێك مرۆڤی دەوری نەفامی ئەستێرەی "شیعرا"یان دەپەرست، هۆکارەکەشی ئەوە بوو، بەگوێرەی زانیارییە فەلەکییەکانی ئەو ڕۆژگارە، زۆر گەورە و درەوشاوە دەهاتە پێشچاو. بۆیە وەك پەرستراوێکی لێهاتبوو. لە بابلی کۆنیشدا نەریتی ئەستێرەپەرستی هەر هەبووە. سەرەتا حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) ڕوانییە ئەو ئەستێرەیەی کە لە دوورەوە زۆر بچووك دیار بوو و پاشان سەرنجی خەڵکەکەی بۆ ڕاکێشا. ئینجا لە دووتوێی گوفتارێکی تەبا لەگەڵ ژیری و ڕواڵەتدا، بەهێواشی لە دەرگای بیرکردنەوەیانی دا و هۆشیارییەکی کەمی تێدا بێدار کردنەوە. ئەوەی لە زاری دەهاتە دەر، هەر هەمووی ڕاستی بوو و کاڵای ساختە و درۆی بەکار نەدەهێنا. بەجۆرێك کە لەگەڵ هەر بەڵگە هێنانەوەیەکدا، خواوەندێك لەو خواوەندانەی لە ئاسماندا دەیانپەرست و ئەو بتەش کە لەسەر زەوی نمایندەی ئەو خواوەندەی دەکرد، لەژێر گورزی بەڵگەکانیدا هەپروون دەبوو. بەڵێ، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام)

لەسەر ئاستی عەقڵ و مەنتیق، یەك بە یەكی بتەكانی دان بە زەویدا، مەگەر خۆشی هەر بۆ ئەوە نەهاتبوو بتەكان تێك بشكێنێت؟!

هەندێ لە زانایانی تەفسیر وا دادەنێن كە لە سەرەتای ڕستەی "هذا ربي"دا ئامرازێكی "الأستفهام الإنكاري" هەبێت.[1] واتە؛ هەمزەی ئیستیفهام كە یەكێكە لە ئامرازەكانی پرسیار كردن، لە سەرەتای ئەو ڕستەیەدا تەقدیر كراوە. ئەوسا واتاكە بەم جۆرەی لێ دێت: أَهَذَا رَبِّي؟ "ئا ئەمە خوای منە؟"، "نەخێر، ئەمە نییە." ئەمەش یەكێكە لە لێكدانەوەكانی بابەتەكە. بەڵام شێوەی ئەو لێكدانەوەیەی ئێمە دەمانەوێت سەرنجی جەنابتانی بۆ كێش بكەین، بریتیە لەمەی خوارەوە:

حەزرەتی ئیبراهیم لە ڕوانگەی ئەو كەرەستانەوە كە بەكاری هێناون، بە جۆرێك ڕەفتاری كردووە وا دەربكەوێت كە گرنگی دەدات بەو شتانەی ئەوان بە خوای خۆیانی دەزانن. بەم شێوەیەش ئەوانی ڕاكێشاوەتە گۆڕەپانی مشتومڕی خۆیەوە. مەحاڵیش بوو لە ڕێگەیەكی ترەوە بتوانێت بیانهێنێتە ناو ئەو زەمینەیەوە. بۆیە دەبینین گوێیان بۆ گرت و سەرنجی قسەكانیان دەدا، چونكە لە خەیاڵی خۆیاندا دەیانوت: "خۆ ئەوە باس لە خواوەندەكانی ئێمە دەكات!" بەڵام بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، مشتومڕەكە بە كۆتا قسەكانی حەزرەتی ئیبراهیم هاتە پایان. ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەركەوتنی بەرەی ئیمان بوو بەسەر بەری كوفر و بێباوەڕیدا.

بەڵێ، دەستی گەلەكەی گرت و بەنێو ئەستێرە و مانگ و خۆردا گەڕاندنی و ئەوەی بیرخستنەوە كە چارەنووسی هەموویان هەر ئاوابوونە. واتە؛ هەموویان هەڵهاتن و ماوەیەك بەرز بوونەوە و پاشانیش ئاوابوون. بەم پێیە، ئەو شتانەی كەوا بەگوێرەی كۆمەڵە یاسایەكی دیاریكراو و لە چوارچێوەی ئەو یاسایانەدا هەڵدێن و ئاوا دەبن، یان دێنە بوون و پاشان بەرەو نەمان دەچن، توانای ئەوەیان نییە حوكمی

---

[1] بڕوانە: طبري، جامع البيان ٧/٢٥٠؛ قرطبي، الجامع لأحكام القرءان ٢/٢٨٥، ٧/٢٦.

خۆیان لە بوونەوەراندا ڕایی بکەن و جڵەوی فەرمانڕەوایی گەردوون بگرنە دەست. ئاخر چۆن دەبێت شتانێك کە دێن و دەڕۆن، حوکمی شتانێك بکەن کە هەروەك خۆیان دێن و دەڕۆن؟

ئەو وتەیەی کە لە یەکەم ڕستەدا بەرامبەر بە هەڵهاتن و ئاوابوونی ئەستێرەکە بەکاری هێنا؛ "من شتی ئاوابووم خۆشناوێت." بریتی بوو لە یەکەم زەنگی وریاکردنەوە. ئەو شتانەی ئاوا دەبن و چارەنووسیان نەمانە، شتانێك نین شایستەی ئەوە بن دڵیان پێوە ببەسترێت و لە دڵدا جێیان بکرێتەوە، چ جای ئەوەی بکەوێتە دوایان و عەوداڵیان بێت. ئاخر ئەوان ڕوو لە ئاوابوونن و ملیان بەرەو تیاچوون ناوە. من یارێکم گەرەکە ئاوا نەبێت. دەبێت یارێك بێت لە خۆم بۆ خۆم نزیکتر بێت و ئاگاداری دانە بە دانەی چرپەکانی نێو دڵم بێت. ئینجا ئەوەندەش توانستی هەبێت بتوانێت هەموویانم بۆ بێنێتە دی.

پاشان هەنگاوێکی تر دەنێت؛ ئەمجارەیان مانگیان پیشان دەدات. هەرچۆنێك بێت پاش کەمێکی تر ئەویش ئاوا دەبێ و لەبەر چاوان ون دەبێت. جا ئیتر لێرەدا بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ گوفتار ناڕاستەی دوێنراوەکانی بکات، سەر و گوێلاکی ستەمکارییەکەیان دادەگرێتەوە و دەڵێت: "خۆ ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایە، منیش لە گرۆی ستەمکاران دەبووم."

لە قۆناغی سێهەمیشدا دەڕوانێتە خۆر. بەگوێرەی بیروباوەڕی ئەوان، خۆر گەورەترین خواوەندە. سەرەتا لە بچووکەوە دەستی پێکرد، ئەوجا بەڕیز دوو بتی سەرەتای بەلادا هێنا. ئێستاش نۆرەی گەورەکەیانە. وەختێك ئەویش ئاوا بوو، هاوار لە ویژدانی ئامادەبووان دەکات و دەڵێت: "من بەدوورم لەو شتانەی ئێوە بە هاوەڵ و شەریك بڕیارتان داوە." بەڵێ، ئیدی نۆبەی دواهەمین وتە هاتبوو.. بۆیە

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیْهِ‌السَّلَام) بە هەموو دڵسۆزییەکیەوە دەنگە دلێرەکەی بڵند کرد و، فەرمووی:

﴿ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ (الأنعام : ٧٩)

"بەڕاستی من ڕووم کردە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە. هەرگیز من لە موشریك و هاوەڵ بڕیاردەران نیم."

خۆ ئەگەر حەزرەتی ئیبراهیم ئەم دواهەمین ڕستەیەی لە سەرەتاوە بووتایە، ئەوا کەس گوێی بۆ نەدەگرت. بەڵام ئەو لەپێشدا بە جۆرێك دواندنی، لەگەڵ ئاستی درك و تێگەیشتنیاندا بگونجێت. ئەوانیش بەم هەنگاوە گوێیان بۆ شل کرد. خۆ ئەگەر دۆزی وتەکانی بەگوێرەی "پلەبەندی"یەکی لەم جۆرە ڕێك نەخستایە، ئەوا هەرگیز ئەو کاریگەرییەی نەدەبوو.

جا هەروەك بینیتان، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیْهِ‌السَّلَام) لەپێناو داگیرساندنی مەشخەڵی حەقیقەتی لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰه لە هەموو دەروونە تاریکە کوێرەوەبووەکاندا، بە سوودوەرگرتن لە فەتانەتەکەی، ڕێگەیەکی لەو جۆرەی گرتەبەر. ئەم شێوازەی حەزرەتی ئیبراهیم لە بنەڕەتدا یەکاویەك لەگەڵ مەنتیقی قورئانیدا یەکدەگرێتەوە. ئەی چۆن وا نەبێ، لە کاتێکدا ئەویش لە چاوگی هەمان وەحیی سوودمەندە و هەڵگۆزراوی هەمان حەقیقەتە.

دەمەوێت لێرەدا سەرنجتان بۆ لای خاڵێکی دیکەش ڕابکێشم. ئەگەر ورد ببینەوە، دەبینین حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرموێت: إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ "بەڕاستی من لەو شتانە بەدوورم کە ئێوە دەیانکەن بە هاوبەش و وەك هاوەڵ بڕیاریان دەدەن" ئەم ڕستەیەش لە زمانی عەرەبیدا بە ڕستەی ئیسمی ناسراوە. ڕستەی ئیسمیش

جێگیری و بەردەوامی دەگەیەنێت. بەم پێیە، واتاکە بەم جۆرەی لێدێت: من هەم لە سەرەتا و هەم لەم ڕەفتارانەی ئێستاشمدا، کە گلۆڵەی کۆمەڵە بەرژەوەندییەکە -و لەبەر بەرژەوەندی بەئاگاهێنانەوەی ژیری لەهۆش خۆچووی ئێوە پێی هەڵدەستم- لە هەموو ئەو هاوەڵ و هاوبەشانە بەدوور بووم و بەدوورم کە ئێوە بڕیارتان داوە و ڕاهاتوون لەسەر بڕیاردانی.

کەوابوو حەزرەتی ئیبراهیم، هەرگیز ڕەفتارێکی وای نەنوواندووە و وتەیەکی وای بە دەمدا نەهاتووە بۆنی شیرکی لێبێت. ئەم وتانەش هەروەك لە سەرەوە سەلماندمان، بەرهەم و شوێنەواری فەتانەتەکەین. بەڵێ، لەم وتانەدا هیچ لایەنێك نییە خەوشێك یاخود لەکەیەك بخاتە سەر لاپەڕەی سپیی عیصمەتی ئەو پێغەمبەرە مەزنە (سەلام و ڕەحمەتی پەروەردگار لەو و لە سەرداری پێغەمبەرانیش).

## زیندووکردنەوەی مردووان

لایەنێکی دیکەش کە وەك زەللە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِالسَّلَامُ) دەخرێتە ڕوو، داواکارییەکەیەتی لە پەروەردگار سەبارەت بە زیندووکردنەوەی مردووان. قورئانی پیرۆز ئەم ڕووداوەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي ﴾ (البقرة : ٢٦٠)

"بەیاد بهێنە کاتێك ئیبراهیم وتی: پەروەردگارا، نیشانم بدە چۆن مردووان زیندوو دەکەیتەوە. خوای گەورەش فەرمووی: ئایا باوەڕت نەهێناوە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ (باوەڕم هەیە) بەڵام دەمەوێت دڵنیایی و ئارخەیانی دڵم زیاد بکات."

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیْهِ السَّلَام) پاڵەوانێکی "هل من مزید"ی ئەوتۆ بوو کە بەهیچ جۆرێك لە زەریای ناسینی کردگاری مەزنی تینوێتی نەدەشکا. بەڵێ، ئەم پێغەمبەرە مەزنە کە هەردەم دەروازەکانی دڵی بەڕووی سروەی مەعریفەتدا لەسەرپشت بوون، بە مەبەستی گەیشتن بە کۆمەڵە قۆناغێکی تازە و، تەی کردنی کۆمەڵە ئاسۆیەکی نوێ لە ناسینی پەروەردگاردا، دەیەوێت بە چاوی خۆی ببینێت کە چۆن پەروەردگاری بەدیهێنەری مردووان زیندوو دەکاتەوە. هەربۆیە "ئەی ئایا زیاتر و زۆرتر نییە؟"ی کردووەتە دروشمی خۆی و بێ وچان دەیڵێتەوە.

تۆ بڵێی حەزرەتی ئیبراهیم لەمەڕ زیندووکردنەوەی مردووان شك و گومانی هەبوو بێت؟ نەخێر، حاشا! ئەوەتا بۆ ئەوە لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە کە "چۆنێتی" زیندوو کردنەوەی مردووانی پیشان بدات. نەك ئەوەی بەدوای وەڵامی گومان و دوودڵییەکی هاوشێوەی "ئایا تۆ توانای زیندووکردنەوەی مردووانت هەیە؟"دا بگەڕێت.

خوای باڵادەستیش داواکارییەکەی جێبەجێ دەکات و هەروەك لە ئایەتەکەدا هاتووە، فەرمانی پێدەکات بڕوات چوار باڵندە بگرێت و دەستەمۆیان بکات، ئینجا هەموویان سەر ببڕێت و پارچەپارچەیان بکات. هەر پارچەیەکیش بخاتە سەر لوتکەی کێوێك. پاشان کاتێك بانگیان لێوە دەکات، دەبینێت کە هەموویان بە باڵەفڕە بەرەو ڕووی دێن.[1]

لە ڕاستیدا خوای گەورە لێرەدا تەنها نموونەیەك لەو نموونانەی موعجیزەی زیندوو کردنەوەی پیشانداوە کە لە هەموو بەهارێکدا بە هەزارەهای دەخاتە پێشچاوی ژیریی خاوەن هەستان. بەڵام وەك بەخشایش و ئاوڕلێدانەوەیەکی پێزانین لە پێغەمبەرێکی پایەبەرزی، کاسەی دڵنیایی خۆیی بەتایبەت پێشکەشی ئەو کردووە. جا خۆ هەموو

١ بڕوانە: سورەتی البقرة، ئایەتی ٢٦٠.

تاسه و خولیایەکی حەزرەتی ئیبراهیمیش پڕ بەدڵ، نۆشینی شەربەتی مەعریفەته لەو کاسەیە. حەزرەتی ئیبراهیمیش هەردەم دروشمی "تا دێت دەسووتێم، جامێك ئاوم فریاخە"ی لەسەر زارە و تا لەم شەربەتەی پێشکەش بکرێت، لێی دەخواتەوە و بەردەوام دەبێ لە خواردنەوەی، بەڵام بە هیچ چەشنێك تینوێتی ناشکێت. کەوابوو، ئەو حەزرەتی ئیبراهیمەی کە سونبولی ژینی دوور لە شك و گومان و دوودڵییە، لەبارەی چۆنێتی زیندوو کردنەوەی مردووانەوە دەپرسی. گەرنا، هەرگیز پرسیارەکەی بەو مانایە نەبوو کە بڵێت: هَلْ تَقْدِرُ أَنْ تُحْيِي الْمَوْتَى أَمْ لَا تَقْدِرُ واته پرسیارێکی سنوور بەزێنانە و گوماناویی چەشنی "ئادەی پیشانم بدە، بزانم ئایا تۆ توانای زیندووکردنەوەی مردووانت هەیە یان نا؟" نەبووە.

ئەمە ڕێك وەك ئەوە وایە مرۆڤێك بە نیگارکێشێك کە ئەم شەیدای هونەر و دەسترەنگینیەکەیەتی بڵێت: "حەزدەکەم لەبەردەممدا تابلۆیەك بکێشی، تاوەکو بەچاوی خۆم ببینم کە چۆن وێنە دەکێشیت." یاخود وەك ئەوە وایە بە خۆشنووسێکی کارزان و لێهاتوو بڵێت: "دەست و مەچەکت وەی نەبینێ، ئادەی بنووسە، با بزانم چۆن دەنووسیت." لە هیچکام لەم پرسیارانەدا هەست بە شتێك ناکرێت کە دەستەوسانیی کەسی دوێنراوی لێ بخوێنرێتەوە. بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە، جاڕدان و دانپێدانانی کامڵیی هونەرمەندەکەی تێدا بەدی دەکرێت. چونکە لێرەدا خواست و ئارەزوویەك هەیە بۆ تەماشاکردنی شاکاری بابای هونەرمەند لە هەموو قۆناغ و هەنگاوەکانی کارەکەیدا هاودەم لەگەڵ سەرسووڕماویی و نرخاندنیدا. بەڵێ، پرسیارەکە لێرەدا لەسەر چۆنێتی زیندووکردنەوەی مردووانە، دەنا مەسەلەکە ئەوە نییە کە ئایا زیندووکردنەوە دەبێت یان نا.

**دووەم:** حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) کە خوای باڵادەست بە چەندین سیفەتی هاوشێوەی حلیم، سلیم، أواه و خلیل وەسفی کردووە، هەروەك سەیید قوتب دەڵێت: "لە بەرامبەر کاروبارەکانی ئەو کردگارە کارزانە مەزنەدا دمیەوێت پڕبەدڵ

بگری.“[1] وەك بڵێی خاوەنی ئەم دەنگە دۆستە بە دۆستەکەی بڵێت: ”پەروەردگارا! وەك چۆن بەهار زیندوو دەکەیتەوە و دەیژێنیتەوە، ئاواش لەبەرچاومدا مردووان زیندوو بکەوە، تا ئەوەی لەنێوەندی کارزانییەکەتدا مەزنیی کاروبارەکانت ببینم و بەکامی دڵ تەماشایان بکەم و لەتاوا جارێکی تر لەهۆش خۆم بچمەوە.“

لەلایەکی ترەوە، حەزرەتی ئیبراهیم دەیویست بە گوێرەی ئاستی دڵنیایی خۆی تێر ببێت. ئەوەتا مرۆڤێکی نەخوێندەوار کاتێك سەری بەر گومەزە عیرفانییەکەی دەکەوێت، ئیتر وا دەزانێت گەیشتووەتە کۆتاخاڵ و، لەوە بەدوا ڕێگەی تر نییە. موحیەددین ئیبن عەرەبی لەنێو شەتەحاتەکانیدا خاتەمی ئەنبیا دەخاتە مەقامێکەوە کە وانە لە خاتەمی ئەولیا وەربگرێت. بۆچی؟ ئاخر چونکە سەری بەر ئەو گومەزە کەوتووە کە بۆی تەقدیر کرابوو. کاتێکیش لەو دەرگایەوە چووەتە ژوورەوە کە دەبووایە لێوەی بچوایەتە ژوورەوە، نەك هەر دەرگاکە، بەڵکو چوارچێوەکەشی لەبن هەڵتەکاندووە و لەگەڵ خۆیدا بردوویەتی. بەڵام دیسانەوەش ئەم دەرگایە لەچاو ئەو کۆشکە گەورەیەدا بەسەر ژوورێکی بچکۆلەدا دەکرایەوە. ئەمە لە کاتێکدا ئەو دەرگایەی حەزرەتی ئیبراهیم لێوەی چووەتە ژوورەوە، دەرگای قەڵایەك یاخود دەروازەی شارێکە. گومەزەکەشی ئاسمانی شینە و بۆ خۆی تەماشای مانگ و خۆر و ئەستێرەکانی تیادا دەکات. خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) گومەزێکی عیرفانیی وای بەسەردا بەرز کردبووەوە، ئاسۆی عیرفانی گەورەترین وەلیەکان لەچاویدا دڵۆپێك دەبوو یان نەدەبوو. واتە ئەگەر ئێمە بە جامێك ئاو تێراو بین، ئەو خاوەنی پانتایی و فراوانییەکی وایە کە تەنانەت بە چەندین زەریای بێ بنیش تێرئاو نابێت.. بەڵێ، ئاسۆی مەعریفەتی ئەوەندە فراوانە.. هەر بۆیە ئەو زاتە مەزنە، بە بینینی کاروبارە ئیلاهییەکان لەهۆش خۆی دەچوو و وەك منداڵ بەکوڵ دەگریا.“

موحیەددینی عەرەبی لە مەولانا دەپرسێت: ”ئایا حەزرەتی محمد (عَلَيهِ الصَّلاةُ

---

١ سید قطب، في ظلال القرءان ١/٢٠١-٣٠٢.

وَٱلسَّلَامُ) كە فەرموویەتی: مَا عَرَفْنَاكَ حَقَّ مَعْرِفَتِكَ يَا مَعْرُوفُ "ئەی ئەو زاتە ناسراوەی (کە لە ڕێی هەموو پیتێکی پەڕاوی گەردوونەوە خۆتمان پێ دەناسێنیت) وەك ئەوەی پێویست بوو بتناسین، نەماننناسیت." گەورەترە یاخود بایەزیدی بوستامی کە دەڵێت: سُبْحَانِي مَا أَعْظَمَ شَأْنِي "پاك و بێگەردی بۆ خۆم، پلەوپایەم چەندە مەزنە."

وەڵامەکەی مەولانا زۆر سەرسامکەرە: "هەر بەتەنها ئەم دوو وتەیە بەسە بۆ ئەوەی پێمان بڵێت پێغەمبەری سەروەرمان چەندە لە بایەزید گەورەترە. پێغەمبەری خوا دڵێك و کۆگایەکی مەعریفەتی وای هەبووە کە هەر دەتوت زەریایە. وەك چۆن زەریاکان بەهیچ شێوەیەك تێربوون و پڕبوون نازانن، دڵی ئەویش هەرگیز تێربوون و پڕبوونی نەزانیوە. کەچی دڵ و دەروونی بوستامی هەر هێندەی شەربەیەك بووە، بۆیە یەکسەر پڕبووە و لێی ڕژاوە." دەڵێن کاتێك مەولانا ئەم وەڵامەی داوەتەوە، منداڵێك بووە لەنێو کوچە و کۆڵانەکاندا خەریکی گەمە و بازبازێن بووە. جا ئیتر ئیبن عەرەبی هەر لەو کاتەوە دەرکی بە قووڵیی مەولانا کردووە...

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) مرۆڤێك بوو تێربوونی نەدەزانی. هەر بۆیە داواکارییەکەی گوزارشت نەبووە لە شك و گومان و دوودڵی، بەڵکو وەك ڕێبوارێکی ڕێی "هَلْ مِنْ مَزِيدٍ" وتوویەتی: "ئەی خودایە، ئایا زیاتر و زۆرتر نییە؟ پێم ببەخشە هەرچی هەیە دەربارەی مەعریفەت و خوداناسی." بۆیە دەبینین لە فەرموودەیەکدا کە ئیمامی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، پێغەمبەری پێشەوامان دەفەرموێت: نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ "خۆ ئەگەر ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم شك و گومان بێت، ئەوا ئێمە لەو لەپێشترین بەو شك و گومانە."[1] واتە؛ ئەگەر شك و گومان لە دڵی ئێمەدا نەبێت سەبارەت بە زیندوو بوونەوەی مردووان، ئەوا حەزرەتی ئیبراهیم لە ئێمە لەپێشترە کە گومانێکی لەو جۆرەی نەبێت.

---

١ بخاري، الأنبياء ١١؛ مسلم، إيمان ٢٣٨.

## سێ تەعریزەکەی حەزرەتی ئیبراهیم

مادەم باس لە عیصمەتی حەزرەتی ئیبراهیم دەکەین، جێی خۆیەتی لێرەدا هەڵوێستە لەسەر ئەو سێ درۆ، ڕاستتر بڵێین ئەو سێ تەعریزە بکەین کە دەدرێنە پاڵ ئەو پێغەمبەرە مەزنە. چونکە تەوەری بابەتەکەمان بەشێوەیەکی گشتی عیصمەتی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ). جا مادەم درۆ گوناهێکی گەورەیە. کەوابوو -حاشا- درۆکردنی پێغەمبەران پێچەوانەی عیصمەت و متمانەدارییەکەیانە. بەڵێ "درۆ دەستەواژەیەکی کوفرئامێزە" و لەو دەروونانەدا جێی نابێتەوە کە نووری ئیمان ئاوەدانی کردوونەتەوە.

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا دەفەرموێت: "ئیبراهیم لە هەموو تەمەنیدا سێ کیذبەی بەسەر زاردا هاتووە."[١] وشەی "کِذْبَة" کە لە دەقەکەدا هاتووە، بەمانای درۆ نایەت، بەڵکو بە واتای "تەعریز" دێت. بەڵێ، لەوانەیە ئەم لێکدانەوەیەمان لەڕووی زمانەوانییەوە بە تەکەللوف و زۆرلەخۆکردن ببینرێت، بەڵام لە کۆتاییدا لە ڕوانگەی ئەو واتایەی کە مەبەستە، پڕ بە پێستی خۆیەتی. ئەمە وێڕای ئەوەی کە لە سەروبەندی لێکدانەوەی بابەتەکەدا ئەم لایەنە بەڕوونی دەبینرێت.

دەبێت زۆر بە وردی سەرنجی دەربڕینەکە بدەین. وەك چۆن ناکرێت بەرامبەر حەزرەتی ئیبراهیم بوترێت: "درۆی کرد"، بە هەمان شێوە، ناشتوانرێت بوترێت کە مەبەست لەم وشەیە "کِذْبَة"، ئەو واتایەیە کە لە فەرهەنگەکاندا بەرچاو دەکەوێت. هەرچەندە ئەو شتانەشی دەیلێین، ڕەنگە لە سەرەتادا وا دەربکەون کە پێچەوانەی ڕاستی بن، بەڵام پاش کەمێك سەرنجدان و وردبوونەوە، دەردەکەوێت کە وتەگەلێکی ڕاست و دروستن و پێیان دەوترێت "تەعریز".

---

١ بخاري، الأنبياء ٨؛ مسلم، فضائل ١٥٤.

سەروەرمان جارجار گاڵتەی دەکرد. بەڵام ئەوەی دەیوت، هەردەم ڕاست و دروس بوو. بۆ نموونە بە حەزرەتی ئەنەسی فەرمووە: "ئەی خاوەن دووگوێ!"[1] بێگومان حەزرەتی ئەنەس (رضيَ اللهُ عَنْهُ) خاوەنی دوو گوێ بووە. جارێکی تریشیان بە ئافرەتێك دەفەرموێت: "ئەی ژنی ئەو کابرایەی چاوی سپیایی تێدایە." ئافرەتەش لە بەرامبەر ئەمەدا دەڵێت: "یا رسول الله، چاوی مێردەکەم سپیایی تێدا نییە." پێغەمبەری سەروەریشمان ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات کە لە دووتوێی گاڵتەکەیدایە و دەفەرموێت: "چاوی هەموو مرۆڤێك سپیایی تێدایە." جارێکی تریشیان ئافرەتێکی پیر هاتە خزمەتی و داواکارییەکی لێی هەبوو: "ئەی پێغەمبەری خوا، دوعام بۆ بکە تا بچمە بەهەشتەوە." پێغەمبەری خواش بە گاڵتەوە فەرمووی: "مەگەر نەتزانیوە پیران ناچنە بەهەشتەوە." لەبەر تێنەگەیشتنی ناوەڕۆکی گاڵتەکە، دایە پیرەکە بەم وەڵامە زویر و دڵتەنگ بوو.. لەو کاتەدا کە دەیوست بچێتە دەرەوە، پێغەمبەری خوا سوعبەتی ناو قسەکانی بۆ ئاشکرا کرد و ئەمجارە خەندەی خستە سەر لێوی دایە پیرە: "پیران بە پیری ناچنە بەهەشتەوە، بەڵکو بە گەنجی دەچن..."[2]

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) تەنانەت کاتێك سوعبەت و گاڵتەشی دەکرد، زۆر ئاگاداری ئەو وشانە دەبوو کە بەکاری دەهێنان. بەڵێ، ئەو مەقامەی ئەو زاتانەی تێدا بوو، تەنانەت بە ناوی گاڵتەشەوە جێی درۆی تێدا نەدەبووەوە. ئەوان پێشڕەوی مرۆڤایەتین و لە پایەیەکدان کە لە هەموو جووڵە و بزاوتێکیاندا دەبنە نموونە و چاویان لێدەکرێت. تاکە وشەیەکی پێچەوانەی ڕاستی لەو وتانەی لە زاریان دێتە دەر، با گاڵتەش بێت، بەسە بۆ ئەوەی غیرەت بداتە بەر کەسانی دی بۆ دەستدانە درۆی جددی و گەورە. دیارە بوونە سەرمەشق و نموونەیەکی خراپی

١ ترمذي، مناقب ٤٥؛ أبو داود، الأدب ٩٢.
٢ ترمذي، الشمائل ١٩٩٦؛ الطبراني، المجمع الأوسط ٣٥٧/٥.

لەم جۆرەش هەرگیز لەگەڵ سروشتی پێغەمبەراندا یەك ناگرێتەوە.

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەر لەو ساتەوەی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە، حەنیف بووە و دوژمنی بت بووە. بگرە بەر لەوەی بە ئەرکی پێغەمبەرایەتیش ڕابسپێررێت، ئەو هەر بەربەرەکانێی بت و بتپەرستی کردووە. تا ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ناخی خۆیدا بڕیار دەدات سەرجەمی بتەکان تێك و پێك بشکێنێت.

بیروباوەڕی باوی ئەو سەردەمە بەجۆرێك بوو، بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکان تەماشای ئەستێرەکانیان دەکرد. لە جووڵە و جێگۆڕکێ جۆربەجۆرەکانی نێوانیانەوە، حوکمی جۆراوجۆریان بۆ خۆیان دادەتاشی. چونکە بەگوێرەی بۆچوونی ئەو ڕۆژگارە، خواوەندەکان لە ئاسمان و لەنێو ئەستێرەکاندا بوون. ئەوەشی دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤەکاندا هەبوو -بە بۆچوونی ئەوان- دیسانەوە هەر ئەستێرەکان بوو. حەزرەتی ئیبراهیمیش بەگوێرەی بۆچوونی باوی ئەو سەردەمە دەڕوانێتە ئەستێرەکان. بەڵام ئەم ڕوانینە، تەنها بە مەبەستی قایل کردنی کەسانی دەوروبەری و بەدیهێنانی بۆچوونە بنەڕەتییەکەی خۆی بووە. دەنا، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) هەرگیز وەك گەل و هۆزەکەی بیری نەدەکردەوە.

پاش ڕوانینە ئەستێرەکان، ئینجا دەفەرموێت ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ "من ناساغم." ئەمە یەکەم ڕووداو و یەکەمین تەعریزە. خوا یاربێت پاش کەمێکی تر پەردە لەسەر هۆکارەکەی لادەدەین. دووەم تەعریزیش ئەمەیە؛ بتەکان دەشکێنێت و تەورەکە دەکاتە ملی گەورەکەیان. کاتێکیش لێی دەپرسن: "کێ ئەم کارەی بەسەر خواوەندەکانماندا هێناوە؟" ئەویش بتە گەورەکەیان نیشان دەدات و دەڵێت: "بەڵکو کردوویەتی! ئەوە گەورەکەیان (بزانن ئەو دەڵێ چی)!"[1] حاڵەتی سێهەمیان ڕاستەوخۆ لە قورئاندا باس نەکراوە. ئەویش ئەوەیە کە بە خێزانەکەی دەفەرموێت: "ئەگەر لێیان پرسیت

[1] بڕوانە: سورەتی الأنبياء، ئایەتی ٦٣.

تۆ کێیت، ئەوا بڵێ خوشکی ئەوم!"[١] جا ئیدی ئەو سێ تەعریزەی کە حەزرەتی ئیبراهیم وتوونی، بریتین لەمانە. ئێستاش با ڕۆشنایی زیاتر بخەینە سەر هەر یەکێك لەم ڕووداوانە، تاوەکو عیصمەتی ئەو پێغەمبەرە مەزنە لە سیمای ئەم ڕووداوانەشدا بخوێنینەوە.

## ١) "من ناساغم!"

یەکەم ڕووداویان لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە باس دەکرێت:

﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ۞ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ۞ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ۞ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ۞ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۞ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ۞ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ۞ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴾

(الصافات : ٨٣-٩٠)

"ئیبراهیمیش بێگومان لە پەیڕەوانی ڕێگەی ئەو (نوح)بوو. ئەوەبوو بە دڵێکی پاکەوە هاتە خزمەت پەروەردگاری. ئیبراهیم بە باوکی و گەلەکەی وت: باشە ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟ ئایا شتی دەستهەڵبەستە دەکەنە خوا و لەجیاتی پەروەردگار دەتانەوێت بیپەرستن؟ ئاخر ئێوە چ گومانێکتان هەیە لە پەروەردگاری جیهانیان؟ (ئەوسا چاوی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و) تەماشایەکی ئەستێرەکانی کرد و وتی: من ناساغم. ئەوانیش بەجێیان هێشت و ڕۆشتن."

وەختێك حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) دەڵێت "من ناساغم!" لە ڕاستیدا مەبەستی لەو حاڵەتە بووە کە بووبووە مایەی ناڕەحەت کردنی. ئاخر ئەو هەر لە لەدایك بوونیەوە لە بتەکان بێزار بووە. هەتاوەکو ئەو بتانەشی لەناو نەبردایە،

١ بخاري، الأنبياء ٨؛ مسلم، فضائل ١٥٤.

لەوە نەدەچوو ئەم نارەحەتییەی برەوێتەوە. ئەو فەرمووی "من ناساغم!" ئەوانەی دەوروبەریشی وایانزانی بە جەستە نەخۆش کەوتووە و بیمارە، بۆیە بەجێیان هێشت و رۆیشتن، ئەگینا سوور بوون لەسەر ئەوەی لەگەڵ خۆیان بیبەن بۆ بۆنە ئایینییەکەیان. هەر کە ئەوانیش دەرۆن، یەکسەر دەکەوێتە وێزەی بتەکان و بەمەش هۆکاری راستەقینەی نارەحەتییەکەی دەردەخات. ئەوەندە هەیە لێرەدا حەزرەتی ئیبراهیم پەنای بردە بەر تەعریز و وشەگەلێکی بەکارهێنا کە ئەوان بەشێوەیەکی تر لێی تێبگەن. بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو کەرەستە وێژەییانەی بەکاری هێناون، بە هیچ شێوەیەك درۆیان تێدا نەبووە. تەنها ئەوەندە هەیە ئەوانەی لە ئامانجی حەزرەتی ئیبراهیم بێ ئاگا بوون، بە هەڵە لێی تێگەیشتن. جا خۆ ئەگەر ئاستی تێگەیشتنیان هێندە پەست و کۆتا نەبووایە، ئەوا گوێیان بۆ حەق دەگرت و لەو قسەیەش تێدەگەیشتن. بەڵێ وابوو، تەمەنێك پێداگرییان کرد و سەرسەختییان نواند و بۆ تەنها رۆژێکیش چییە گوێیان بۆ حەق و حەقیقەت رانەدێرا. راستییەکەی، هەڵەی سەرەکیش هەر لێرەوە سەرچاوەی گرتبوو.

دەربرینەکەی حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیْهِ السَّلَام) تەعریزێك بوو. بەڵام ئەو ئەوەندە سەرراست و دروست بوو، ئەم تەعریزەی تەنانەت لە مەحشەریشدا لە رووی ویژدانییەوە نارەحەتی دەکات و بەوانەی کە بۆ شەفاعەت دێنە لای، دەفەرموێت: "من لە ژیانمدا سێ جار درۆم کردووە، هەر بۆیە شایستەی شەفاعەت کردن نیم."[1]

جا ئەگەر ئەو واقیعە لەبەرچاو بگرین کەوا جوامێرانی مەیدانی خزمەتی ئەمرۆکە -چ گەرەکە کەسانی تر بە نموونە بهێنینەوە- رۆژی چەند جارێك، خۆیان بە ناچار بزانن یان نا، تەعریزی وەك "من ناساغم"یان بەسەر زاردا دێت، کە حەزرەتی ئیبراهیم لە هەموو ژیانیدا تەنها یەك جار بەسەر زاریدا هاتووە

١ بخاري، الأنبياء ٩؛ مسلم، إيمان ٣٢٧-٣٢٨.

-لەو باوەڕەدام- ئەوکات باشتر لەوە حاڵی بین کە حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) لە تەعریزەکەیدا چەندە پاکنیاز و بێ سووچ بووە. جا لەبەر ئەوەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سنووری نێوان ڕاستی و درۆ کاڵ بووەتەوە و هاتووچۆی نێوانیان ئاسان بووە، بۆیە پێویستە تەنانەت کاتێك ڕێ بە تەعریزیش -نەك درۆ- دەدرێت، زۆر بەباشی بیر بکەینەوە. چونکە ئەم سەردەمە وای لێهاتووە ڕاستی و درۆ لە هەمان دوکاندا بفرۆشرێن و دەڵێی ئاوێتەی یەکتر بوون.

پێم خۆشە لەنێو کەوانەیەکدا ئەمەشتان عەرز بکەم: مادام بارودۆخەکە بەم جۆرەیە، ئەوا پێویست دەکات تەنانەت لەو سێ جێیەشدا کە سەروەرمان ڕێگەی داوە بە درۆکردن[1] زۆر بەئاگاییەوە هەنگاو بنێین. چونکە لە چاخی بەختەوەریدا خەندەقێکی قووڵ لە نێوان ڕاستی و درۆدا هەبوو. هاوەڵە بەڕێزەکان نمایندەیی ڕاستگۆیی و، موسەیلەمە و پیاوەکانیشی نمایندەیی درۆیان دەکرد. واتە مەودای نێوان ڕاستی و درۆ ئەوەندە فراوان بوو. بەڵام ئێستا بارودۆخەکە تابڵێی جیاوازە...

بەڵێ، پێویستە خزمەتگوزارانی حەق و حەقیقەت، چ لە ژیانی کۆمەڵایەتییاندا. چ لە ژیانی کەسیی خۆیاندا، بە هیچ شێوەیەك جێ بۆ درۆ نەکەنەوە. ئەمەش یەکەم مەرجی بوون بە مرۆڤی دڵنیایی و متمانەبەخشە. دەبێت تا دەتوانین درۆ لە ئێمەوە دوور و ئێمەش لە درۆوە بەدوور بین. جا ئەگەر ئێمە ئەمەندە گرنگی بەم مەسەلەیە بدەین و هەستیار بین بەرامبەری، دەبێت پێغەمبەران کە سەرمەشقی ڕاستەقینەی ئێمەن و وانەی ڕاستی و دروستی لەوانەوە فێربووین، چەندە گرنگیان بەم بابەتە دابێت و هەستیارییان نواندبێت؟! نەخوازەڵا ئەو پێغەمبەرە، حەزرەتی ئیبراهیم، باپیرەی ڕاستترینی سەرڕاستان، حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بووبێت...

---

١ مسلم، البر ١٠١؛ ترمذي، البر ٢٦.

## ٢) "لەوانەیە ئەو کردبێتی"

دووەمیان: ئەو ڕووداوەش لە قورئانی پیرۆزدا بەم شێوەیە باس دەکرێت:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ۞ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ۞ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ۞ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ۞ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ۞ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ۞ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ۞ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ۞ قَالُوا۟ مَن فَعَلَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَآ إِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۞ قَالُوا۟ سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُۥٓ إِبْرَٰهِيمُ ۞ قَالُوا۟ فَأْتُوا۟ بِهِۦ عَلَىٰٓ أَعْيُنِ ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ۞ قَالُوٓا۟ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۞ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُوا۟ يَنطِقُونَ ﴾ (الأنبياء : ٥١-٦٣)

"سوێند بێت بەڕاستی ئێمە پێشتر ڕوشد (ئەوەی تەبایە لەگەڵ ویژداندا) مان پێشانی ئیبراهیم دابوو، ئێمە چاك ئەومان دەناسی. کاتێك بە باوك و گەلەکەی وت: 'ئەم پەیکەرانە چییە هەروا بە دەوروخولیاندا دێن و دەیانپەرستن؟!' ئەوانیش لە وەڵامدا (تەنها بەڵگەیان ئەوە بوو کە) وتیان: 'باووباپیرانمان بینیوە ئەمەیان پەرستووە.' ئیبراهیم وتی: 'بەڕاستی خۆشتان و باووباپیرانیشتان لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بوون.' خەڵکەکە وتیان: 'بەڕاست، تۆ حەقیقەتت بۆ هێناوین یان گاڵتە دەکەیت؟!' ئەویش وتی: 'نەخێر، پەروەردگاری ئێوە، پەروەردگاری زەمین و ئاسمانەکانە. هەر ئەو بەدیهێناون. منیش لەوانەم کە شایەتیی لەسەر ئەمە دەدەن.' (ئینجا ئیبراهیم

لەبەر خۆیەوە سوێندی خوارد و وتی: 'سوێند بەخوا، نەخشەیەك دەكێشم و كارێك دەنێمەوە بۆ بتەكانتان، دوای ئەوەی ئێوە بەجێتان هێشتن و پشتتان هەڵكرد.' ئینجا هەموویانی وردوخاش كرد جگە لە گەورەكەیان، سا بەڵكو سەری لێبدەنەوە. بتپەرستان كە هاتنەوە و بینیان بتەكانیان وردوخاش كراون، وتیان: 'ئەوە كێ ئەمەی بەسەر خواوەندەكانماندا هێناوە؟! بەڕاستی ئەوەی ئەمەی كردووە لە ستەمكارانە. هەندێكیان وتیان: 'بیستوومانە لاوێك بەخراپە باسیان دەكات، بە ئیبراهیم بانگی دەكەن.' وتیان: 'كەوابوو بۆ ئەوەی ئەمانە بتوانن شایەتی بدەن، بیهێنن بە بەرچاوی خەڵكەوە (لێپرسینەوەی لەگەڵدا بكەین و لێی بكۆڵینەوە).' (كاتێك ئیبراهیم هات) پێیان وت: 'ئەی ئیبراهیم، ئایا تۆ ئەمەت بە خواوەندەكانمان كردووە؟!' ئیبراهیمیش وتی: 'لەوانەیە ئەو كردبێتی، ئەوە گەورەكەیانە. خۆ ئەگەر دەتوانن قسە بكەن، ئەوا لێیان بپرسن' ..."

لە حەزرەتی ئیبراهیم دەپرسن: "ئەی ئیبراهیم، ئەوە تۆ وات بەسەر خواوەنداكانماندا هێناوە؟" ئەویش وەڵام دەداتەوە: "ڕەنگە ئەو كردبێتی." ئەمە دەڵێت و دەوەستێت. هەر بەڕاستیش لەو بڕگەیەدا وەستان (وقف) هەیە،[1] ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەو شوێنە، شوێنی وەستانە.

مەبەستی حەزرەتی ئیبراهیم لە جێناوی "ە"ی كرداری "فعلە" كە بۆ كەسی سێیەمی تاك دەگەڕێتەوە، ئەو كەسەیە كە ئەوان بە ئیبراهیم بانگیان دەكرد، واتە مەبەستی خۆیەتی. بەڵام بە بەكارهێنانی وشەسازییەكی كارامە، سەرنجیان بەرەو بتە گەورەكە ڕادەكێشێت. لە ڕاستیدا لێرەدا دوو ڕستەی جیاواز تێهەڵكێشی یەكتری كراون! بەڵام لەكاتی دەربڕیندا هەردوو ڕستەكە وەك یەك ڕستەیان لێهاتووە.

---

١ شایانی باسە بەگوێرەی هەندێك قیرائەت لێرەدا نیشانەی "جواز الوقف" هەیە: ﴿ قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَذَا فَسْئَلُوهُمْ اِنْ كَانُوا يَنْطِقُونَ ﴾

هۆکاری پەی نەبردنی گوێگرانیش بە مەبەستی ڕاستەقینەی حەزرەتی ئیبراهیم هەر ئەمە بووە. ڕستەی یەکەم بریتییە لە ﴿بَلْ فَعَلَهُ﴾ "بەڵکو کردوویەتی!" ڕستەی دووەمیش ﴿كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾ "ئەوە گەورەکەیانە!" جا کاتێك ئەم دوو ڕستەیە لێکدەدرێت، گوێگر وا تێدەگات کە مەبەستی قسەکە ئەوە بووبێت بڵێت: "ئەوە گەورەکەیان، ئەو کردوویەتی.".. ئیتر بەم جۆرە ئەمەش دەبێت بە تەعریز. لە لایەکی ترەوە، ئەم هەڵوێستە گاڵتە و سوکایەتییەکیشی تێدایە. ئەوەتا کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێت: "ئەوە گەورەکەیان" لە ڕاستیدا گاڵتەی دێت بەو تێگەیشتنە ساویلکەیەیان. بەڵام ئەوان بە جۆرێك جڵەوی ژیریی خۆیان ڕادەستی بتپەرستی کردبوو، لەوەدا نەمابوون تەنانەت لەمەش تێبگەن. ئەوە نییە بە بتەکانیانی وتبوو "گەورە!"، ئیتر ئەوە کەی گرنگە مەبەستی چیە و چی نییە. بگرە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات.

دەك داوەشێیت بتپەرستی! بەقوڕدا بچیت گومڕایی! وەی لە حاڵی ئەو ژیرییانەی کۆێراییان داهاتووە و ئەو دەروونانەش کە ڕوویان لە خودا نییە.

## ٣) "خوشکمە"

هەرچی ڕووداوی سێهەمیشە، گەردێك درۆ چییە لە ڕوخساری گەشی نەنیشتووە. بگرە هەر پێشی ناوترێت تەعریز. خۆی چۆن بووە، ئاوەها ڕاست. هەم ڕاستییەك وەك خۆری نێوجەرگەی ئاسمان... ئەگەر نەمروود یان دەستوپێوەندەکەی پرسیار بکەن، ئەوا سارە خاتوون پێیان دەڵێت: "خوشکی ئەوم." خۆ ئەگەر لە حەزرەتی ئیبراهیم بپرسن، ئەوا دەربارەی سارە خاتوون دەڵێت: "خوشکمە." چونکە ئەگەر حەزرەتی ئیبراهیم بیوتایە ئەوە خێزانمە، ئەگەری ئەوە لە ئارادا بوو زیانێك بە دایکە سارامان بگەیەنن. لەوانەبوو لە ڕێی خێزانەکەیەوە فشاریان

بخستایەتە سەر حەزرەتی ئیبراهیم.. ڕەنگیش بوو ناچاری بکەن ئەو ناوە بەجێ بهێڵێت. کەچی ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) لەم بارەیەشەوە وتی، دیسانەوە یەکاویەك ڕاستی بوو. ئەوەتا خوای گەورە هەموو باوەڕدارانی بە خوشك و برای یەکتری هەژمار کردووە.[1] یەکەمین خاڵی بەیەك گەیشتنی باوەڕداران دەستاوێژی ئیمانە. ئەوانەی بەم دەستاوێژە بەیەکەوە نەبەستراونەتەوە، با لە هەمان دایك و باوکیش بن، بە خوشك و برا دانانرێن. ئەمە سەرباری ئەوەی تەنانەت جوودایی و لێکدابڕانە کاتی و شوێنییەکانیش نابنە بەربەرست لەبەردەم برایەتی ئیماندا. باوەڕداران تێکڕا بەجارێ هەموو خوشك و برای یەکترن و لەم بابەتەشدا جیاکاری لەنێوان ئافرەت و پیاودا نییە. هەرچی نزیکییەکانی تریشە لەدوای ئەم برایەتییەوە دێن. ئەوەتا دەبینین کاتێك مرۆڤ لە خێزانەکەی جیا دەبێتەوە، پەیوەندیی ژن و مێردایەتی دەپچڕێت و نامێنێت. کەچی برایەتیی ئیمان هەر بەردەوام دەبێت.

جا ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) سەرنجی بۆ لای ئەم پەیوەندییە بنەڕەتییە ڕاکێشاوە و بە دایکە سارای وتووە "خوشکم". ئەم قسەیە یەکپارچە ڕاستییە. تەنانەت تەعریزیش نییە. بەڵام ئەوانەی پەردە بەسەر چاویاندا دادراوەتەوە و گوێشیان لە ئاست ئەم مەسەلە ناسك و سەرنجە وردانەدا ئاخنراوە، هیچ کات لەمە تێناگەن.

ئەو پەیامەی ئەم بابەتە دەیەوێت بە ئێمەی بگەیەنێت بریتیە لە: ١) حەزرەتی ئیبراهیم هەرگیز درۆی نەکردووە. ٢) مەردانی خزمەتیش کە شوێنکەوتەی ڕێبازی پێغەمبەرانن، پێویستە هەردەم دەروون و زوبانیان بەڕووی درۆدا سەرمۆرکراو بێت. نیشانداری ڕاستەقینە لەتاو خەم و خەفەتی حەرامێك کە بەرچاوی کەوتووە، یاخود درۆیەك کە لە زاری دەرچووە، تەمەنێك دەتلێتەوە و فرمێسکی پەشیمانی دەڕژێت. هەر لەم سۆنگەیەشەوە تەواوی پێشەوا و ڕابەران، لە هەر ئاست و پێگەیەکدا بن،

---

١ بڕوانە: سورەتی الحجرات، ئایەتی ١٠.

ئەوەیان لێ چاوەڕوان دەکرێت کە ژیانیان هاوشێوەی ڕۆحانییەکان بەسەر بەرن.

## دوعاکردنی بۆ باوکی

لە کۆتاییشدا با ئاوڕێك لەو زەللەیە بدەینەوە کە پەیوەندی بە نزاکەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە هەیە بۆ باوکی:

داخۆ دەبێت بۆچی حەزرەتی ئیبراهیم داوای لێخۆشبوونی بۆ باوکی کردبێت، لە کاتێکدا باوکی لەنێو گومراییدا بوو؟ مەگەر نەدەبوو پێغەمبەرێکی وەك ئەو تەنها بەو کەسانەوە بوەستێت کە بانگەوازەکەیان قبووڵ کردبوو؟ باشە بۆچی ئەوەندە لە خەمی باوکیدا بووە، پاشانیش بە مەبەستی لێخۆشبوونی، ئەو هەموو دوعا و پاڕانەوەیەی لە حوزووری خوای گەورەدا بۆ کردووە؟ ئایا ئەمە هەڵە بووە؟ باشە ئەگەر ئەمە هەڵە بووە، دەی چۆن لەگەڵ پێغەمبەرێکدا دەیگونجێنیت کە ئاسۆی بەرووی هەڵەدا بن بەست بووە؟ جا ئەگەر ئەمە وابێت، دەی ئیتر بە چیدا بزانین کە لە لایەنەکانی تریشدا هەڵەیان نەکردووە؟ چۆن ئەم شتانە بزانین تاوەکو بتوانین بەدڵنیاییەوە شوێنیان بکەوین؟

ئەمەش بناغەی ئەو پرسیار و دوودڵییەی کە مولحیدانی دوێنێ و کافر و گومانچییانی ئەمڕۆ کردوویانەتە بنێشتە خۆشەی دەمیان!

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) بەم شێوەیە دوعای کرد: ﴿ وَٱغْفِرْ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ (الشعراء : ٨٦) "لە باوکیشم خۆش ببە، بەڕاستی ئەو لە ڕیزی گومڕایاندا بوو." قورئانی پیرۆز بەم جۆرە باسی ئەو هۆکارەمان بۆ دەکات کە پاڵیان نا بە حەزرەتی ئیبراهیمەوە ئەو دوعایە بکات:

﴿ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ ۚ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴾

(التوبة : ١١٤)

"داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، کاتێکیش بۆی دەرکەوت بەڕاستی باوکی دوژمنی خوایە، خۆی لێ بەری کرد. بەڕاستی ئیبراهیم زۆر بەسۆز و دڵنەرم و خاوەن حیلم بوو."

حەزرەتی ئیبراهیم چ بەڵێنێکی بە باوکی دابوو؟! قورئانی پیرۆز ئاماژە بەم خاڵە دەکات و دەفەرموێت:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ﴾ (الممتحنة : ٤)

"بەڕاستی لە حەزرەتی ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون سەرمەشق و نموونەی چاك هەن بۆتان. ئەوان بە گەلەکەی خۆیانیان وت: بەڕاستی ئێمە لە ئێوەش و لەو شتانەش کە جگە لە خوای باڵادەست دەیانپەرستن، دوور و بەریین. هەر ناشتان ناسین. هەتا ئەو کاتەی باوەڕ دەهێنن بە خوای تاك و تەنها، لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و ڕقێکی بەردەوام لە ئارادایە. جگە لەو بەڵێنەی کە ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم. بەڵام توانای پێشگیریم نییە لە هیچ شتێك کە لە لایەن خواوە بەسەرتدا بێت."

لەم ئایەتەدا بەڵگەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا بەدی دەکرێت لەسەر ئەبەدیی

بوونی دوژمنایەتی نێوان کوفر و ئیمان. پێمان دەڵێت لە کرۆك و ڕۆحی کوفردا ڕقێکی ڕەگ داکوتاو دژ بە ئیمان هەیە. ئایەتەکەش ئاماژە بەوە دەکات کە ئەمە لە سروشتی کوفرەوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە وا دەخوازێت هەر لەم خاڵەدا بەدوای هۆکاری ئەوەدا بگەڕێین کە بۆچی کافر بە هیچ جۆرێك ناتوانێت موسوڵمانی خۆشبوێت.

قورئانی پیرۆز ئەوەمان پیشان دەدات کە باوکی حەزرەتی ئیبراهیم لەنێو گومڕاییدا بووە، ئەمەش هەرگیز ناتەواویی و کەموکورتییەك نییە بۆ حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَیهِ السَّلَام). تەنانەت دەتوانرێ بوترێت لەنێو باپیرانی سەرووەریشماندا، کەسانێك هەبوون کە نەگەیشتوون بە پلەی یەکتاپەرستی تەواوەتی. لە ڕاستیدا نازانم عەبدولموتەلیب و هاشم و لوئەی خاوەنی چ جۆرە تێڕوانینێك بوون بۆ یەکتاپەرستی، بەڵام بەو پێیەی کە لە سەردەمی "فەترەت"دا[1] ژیاون، ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانین بڵێین کە هاوشێوەی مرۆڤەکانی ئەو سەردەمە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. وێڕای ئەمەش، خۆ ئەگەر لە حاڵێکدا کەموکوڕی و ناتەواوییەکیش لەواندا هەبێت، ئەمە بە هیچ جۆرێك نابێتە ڕێگر لەوەی سەرووەرمان بە ئەرکی پێغەمبەرایەتییەکەی ڕەوانە بکرێت.

بەڵێ، سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە ئەگەر ئازەر باوکی حەزرەتی ئیبراهیم بێت و، حەزرەتی ئیبراهیمیش بەوە ناوی بەرێت کە لە گومڕاییدایە، ئەمە هیچ زیانێك بە پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی ئیبراهیم ناگەیەنێت. جاری وا هەیە خوای باڵادەست لە کەسانی ئازەرئاسا ئیبراهیم و، جاری واش هەیە لە ڕۆحگەڵێکی پاکی وەك حەزرەتی نوح (عَلَیهِ السَّلَام) کەسانی وەك کەنعان دەخولقێنێت. دەکرێت جار جار لە کەسی چاك و پاك کەسی بێ کەڵك و، لە کەسی بێ کەڵك و نابووتیش کەسی چاك بێتە مەیدان. بەڵێ، هەندێ جار کەسانی شەیتان ئاسا کەسانی فریشتەئاسا

[1] سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صَلَّی اللهُ عَلَیهِ وَسَلَّم).

دەهێننە دنیا، هەندێ جاری تریش فریشتە ئاساکان کەسانی شەیتان ئاسا دەهێننە دنیاوە.

خوای گەورە (جَلَّ وَعَلَا) لە مردوو زیندوو و لە زیندووش مردوو دەردەهێنێت. جا وەك چۆن توانستی ڕەهایە و بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستە، ئاواش کەس ناتوانێت لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکات. بەڵێ، ئەو زاتە خاوەن توانستێکی وەهایە دەتوانێ لە مردوویەکی وەك ئازەر، زیندوویەکی وەك حەزرەتی ئیبراهیم بەدی بهێنێت کە گیانی ژیانەوە دەکاتەوە بە بەری مرۆڤایەتیدا.. بەڵێ، ئەو خاوەن توانستە ڕەهایە ئەمە بەدی دەهێنێت و پاشانیش دەیکات بە بناغەی دوو زنجیرەی زێڕین.

بەڵێ، هەردوو کوڕەکەی حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرن. لە کاتێکدا بنەچەی حەزرەتی ئیسحاق (عَلَيْهِ السَّلَام) لە حەزرەتی عیسادا (عَلَيْهِ السَّلَام) دەگاتە پایان، بنەچەی حەزرەتی ئیسماعیل (عَلَيْهِ السَّلَام) بە حەزرەتی فەخری عالەم دەگاتە ئەو ئاسۆیەی تیایدا دەبێتە مەبەستی هەرەباڵای بوون.

**دووەم:** دوعاکردنی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ باوکی، بە تەواوی مانا کردەیەکی فیتری و مرۆڤانەیە. ئەوەتا پێغەمبەری پێشەواشمان بۆ ئەبوتالیبی مامی دەسووتا و بەوپەڕی پەرۆشییەوە بانگی دەکرد بۆ سەر ڕێبازی یەکتاپەرستی. تەنانەت پاش مەرگیشی هەر دەستبەرداری نەبوو. ئەوەبوو فەرمووی: "بەردەوام داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، مەگەر لێم قەدەغە بکرێت"[١] ئەو ئەبوتالیبەی بەدرێژایی چل ساڵی ڕەبەق چاودێریی سەروەرمانی کرد و هەمیشە پشت و پەنای بوو. هاوبەشی خەم و ناخۆشییەکانی دەکرد و دڵی دەدایەوە، تەنانەت لە ئابلوقە سێ ساڵییەکەی قوڕەیشیشدا بەتەنها جێی نەهێشت. جا ئیتر بەتەنگەوە بوون و پەرۆشیی

١ بخاري، جنائز ٨١، تفسير سورة (٩) ١٦، (٢٨) ١؛ مسلم، الإيمان ٣٩-٤٠.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەپێناو گەیاندنی دینی حەق بەم مامەی کە بە درێژایی ژیانی ئەوەندە خزمەتی کردبوو و هەمیشە لە هەوڵی پاراستنیدا بوو، هەروەها ئەو حەزە بێ سنوورەی هەیبوو بۆ موسوڵمان بوونی، چەندە ژێری پەسەند و سروشتی بێت، دوعاکەی حەزرەتی ئیبراهیمیش (عَلَيْهِ السَّلَام) ئەوەندە سروشتییە. ئاخر چونکە باوکی هۆکاری هاتنە دنیایەتی و تا قۆناغێکی دیاریکراو، ئەو بەخێوی کردووە و پێی گەیاندووە. ئەمە سەرباری ئەوەی ئایین فەرمانمان پێدەکات بەوەی کە تەنها "ئۆف"ێکیش چییە نابێت لە دەممان دەربچێت بەرامبەریان (واتە بەرامبەر دایك و باوك)، جا بیروباوەڕیان هەرچییەك هەیە با ببێت.[1]

سێیەم: تەبلیغ مەبەستی بوونی پێغەمبەرانە. بەڵام هیدایەتدان لە دەستی ئەواندا نییە. ئەرکی سەرشانی ئەوان؛ باسکردنی حەق و حەقیقەتە بە بەردەوامی و گرتنەبەری سەرجەم هۆکار و شێوازە ڕێ پێدراوەکانە لەم پێناوەدا. جا ئیتر حەزرەتی ئیبراهیمیش (عَلَيْهِ السَّلَام) هەوڵی دەدا لەم ڕووەوە دڵی باوکی نەرم بکات و دەروونی ساز و ئامادە بکات بۆ وەرگرتنی هیدایەت. ئەو دوعایەش کە بەڵێنی پێ دابوو، پێم وایە هەر لەم چوارچێوەیەدا بووبێت. ئاخر بیرمان نەچێت، دوعاش بۆ خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی هیدایەت و نابێت دەربارەی هیدایەت وەرگرتنی هیچ کەسێکیش تووشی بێ ئومێدی ببین. بەڵێ، پێویستە نائومێد نەبین، چونکە پێغەمبەرمان سەرباری گوفتاری ڕاشکاوانەی ئایەتی ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ (البقرة : ٦) کە باس لە هیدایەت وەرنەگرتنی هەندێ لە بێباوەڕان دەکات، کەچی ئەو زوو زوو دەچووە سەردانی بێباوەڕانی وەك ئەبو جەهل و ئەبو لەهەب و ئیبن ئەبی موعیط و بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێی ڕاست. هیدایەت لە دەستی خوادایە (جَلَّ جَلَالُهُ).. لەبەر ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیمیش زۆر باش باوەڕی بەمە هەبوو، بۆیە لەپێناو باوکیدا هەموو

---

١ بڕوانە: سورەتی الإسراء، ئایەتی ٢٣.

ڕێگاکانی تاقی کردەوە، بە دوعاشەوە. بەڵێ، لەبەر ئەم هۆیە بۆ هیدایەتی باوکی دوعا دەکات و لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ ئیمان و دڵنیایی تەواوی حەزرەتی ئیبراهیم بە خوای گەورە. بەڵام هەر ئەوەندەی لە مەشیئەتی ئیلاهی ئاگادار دەبێتەوە، دەستبەجێ دەستبەرداری دوعاکردن دەبێت و، وەك ئەوە وابوو بڵێت: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ﴾ (الأنعام : ١٤٩) "ئیرادەی فەرمانڕەوا هەر هی خوایە."

حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) لەو شارێگە نوورانییەدا کە تا سەرداری پێغەمبەران درێژ دەبووەوە، بە پەیامێکی جیهانییەوە هاتبوو. ئەرکی سەرشانی ئەو، بانگکردنی هەموان بوو، هیچ هۆکارێکیش لە ئارادا نەبوو تاکو باوکی بخاتە دەرەوەی ئەم بازنەیە. ئینجا کاتێك ئەمە پەیوەندی سروشتی نێوان کوڕ و باوکیشی دەچێتە سەر، زیاتر تۆخ دەبێتەوە. ئیتر بێگومان چ پەیوەندی کوڕایەتی و چ بەرپرسیارێتیی پێغەمبەرایەتی، وایان لە حەزرەتی ئیبراهیم دەکرد کە لە ئاست هیدایەتی باوکیدا پێداگری بکات. کاتێك دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز، دەبینین کە چەند بە جوانی وێنای هەڵوێستەکانی حەزرەتی ئیبراهیم دەکات. ئەوەتا پێمان دەڵێت کە بە چ شێوەیەك بۆ باوکی سووتابوو و لە بەرامبەر ڕەفتارە زبر و هەست بریندارکەرەکانی باوکیدا چۆن هەر بە "بابە گیان، بابە گیان" لەگەڵی دەدوا و بانگی دەکرد بۆ سەر ڕێی ڕاست:

﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ۝ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ۝ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ۝ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ۝ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا﴾ (مريم : ٤١-٤٥)

"هەروەها لە کیتاب (قورئان)دا باسی ئەو شتانەش بێنەوە یاد کە سەبارەت بە ئیبراهیم باسمان کردووە. بەڕاستی ئەو پێغەمبەرێکی سەرڕاست و ڕاستگۆ بوو. ئەوە بوو بە باوکی وت: 'باوە گیان بۆچی شتانێك دەپەرستیت کە نە دەبیستن، نە دەبینن، نە هیچ سوودێکیشت پێ دەگەیەنن! بابەگیان، لە ڕاستیدا زانستێك بۆ من هاتووە کە تۆ بۆت نەهاتووە، کەواتە پەیڕەوی من بکە، ڕێنموونیت دەکەم بۆ رێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست. بابە گیان، شەیتان مەپەرستە، چونکە بەڕاستی شەیتان لە خوا (الرحمن) یاخی بووە. بابە گیان، بەڕاستی دەترسم سزایەك لە لایەن خوای میهرەبانەوە یەخەت پێبگرێ، ئیتر ئەو کات تۆیش ببیتە یار و یاوەری شەیتان."

بەڵێ، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەو پەیامە نوورینەی دڵی کەسانی دی پێ کردبووە گوڵ و گوڵزار، سەر ڕێی باوکیشی خەملاندبوو و دەتوت خۆی کردووەتە قوربانیی. چ ڕۆڵەیەك هەیە لەپێناو هیدایەتی باوکیدا ئاوا لە دڵەوە و بە کەماڵی جددییەت و دڵسۆزییەوە هەوڵ نەدات؟! چ جای ئەوەی ئەو کەسە، پێغەمبەرێکی نەجیب و سەلار و سەلیم و ئەوواهی وەك حەزرەتی ئیبراهیم بێت...

**چوارەم:** بە ڕای هەندێ لە زانایانی تەفسیر، لە زمانی عەرەبیدا وشەی "أب" بە مانای "باو و باپیران"یش دێت. بۆیە جەخت لەسەر ئەو ئەگەرە دەکەنەوە کە دەکرێت ئەو کەسەی حەزرەتی ئیبراهیم بە "یا أبت" لەگەڵی دواوە، باوکی ڕاستەقینەی خۆی نەبووبێت، بەڵکو باپیری، مامی یاخود خزمێکی دیکەی بووبێت.[1] لە لایەکی ترەوە، وشەی "آباء" کە کۆکراوەی وشەی "أب"ە، لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە و بە واتای باو و باپیران بەکارهاتووە.

ئەوەتا حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ (يوسف : ٣٨) "شوێن ئایین و بەرنامەی باو

١ الرازي، مفاتيح الغيب ١٣/٣٨-٤٠.

و باپیرانم؛ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کەوتووم.“ لێرەدا دەستەواژەی "یا أبت" بە واتای "باو و باپیرانم" بەکارهاتووە.[1] ئەوە با دەستەواژەی "آبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ" لەولاوە بوەستێ کە لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا بەکارهاتووە و بە مانای "باو و باپیرانی یەکەممان" دێت. جا کەوا بێت، ئەوا پێدەچێت حەزرەتی ئیبراهیم کوڕی ئازەر نەبووبێت، بەڵکو نەوە یاخود برازای بووبێت، چونکە ڕیوایەتێك هەیە دەڵێت کوڕی "تارح"ە.[2] هەروەها دەکرێت کوڕی یەکێکی تریش بێت. جا مادەم دەرگای تێبینییەکان بەم چەشنە لەسەر پشتە، ئەوا دەبێت بزانین کە حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيۡهِ السَّلَام) نە ئەو مرۆڤەیە لەژێر سێبەری باوکیدا ون بێت، نە ئەو مرۆڤەشە کە پاش ئاگادار بوون لە گومڕایی باوکی، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات.. قورئانی پیرۆز یەك لە دوعاکانی حەزرەتی ئیبراهیممان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە و فێری ئێمەش دەکات کە بیخوێنین: ﴿ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡحِسَابُ ﴾ (إبراهيم : ٤١) ”پەروەردگارا، لەو ڕۆژەدا کە لێپرسینەوە بەرپا دەبێت، لە خۆم و دایك و باوکم و ئیمانداران خۆشبە.“ لێرەدا وشەی "وَالِدَيَّ" بە واتای دایك و باوك بەکار هاتووە.

خۆ ئەگەر لە ڕوانگەی ئەو لایەنانەوە بڕوانینە بابەتەکە کە باسمان کرد، ئەوا بەڕوونی دەردەکەوێت کە حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيۡهِ السَّلَام) پێغەمبەرێکی مەزنی دەستپاك و داوێنپاك و مەعصوم و بێگوناه و خاوەن عیصمەت بووە... بەختیارێکی نێو ئەو بەختیارانە بوو کە حەقبێژیی کردبووە دروشمی خۆی و هەمیشە لەپاڵ حەقدا بووە.

حەزرەتی ئیبراهیم بە تەواوی مانا نموونەی یەکتاپەرستی بوو و تەسلیمیەتەکەشی

---

1 بڕوانە: سورەتی المؤمنون، ئایەتی ٢٤ و ٦٨؛ سورەتی الصافات، ئایەتی ١٧ و ١٢٦؛ سورەتی الواقعة، ئایەتی ٤٨، سورەتی الشعراء، ئایەتی ٢٦؛ سورەتی الدخان، ئایەتی ٨؛ سورەتی القصاص، ئایەتی ٣٦.

2 الرازي، مفاتیح الغیب ١٣، ٣٧-٤٠.

له لوتکەدا بوو. هەر لەبەر ئەمەشە کە "خیللەت" تایبەت کراوە بەو و ئایەتی: ﴿ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾ (النساء : ١٢٥) "خوای گەورەش ئیبراهیمی کردووەتە دۆست و خۆشەویستی خۆی." باس لەم دۆستایەتی و نزیکییە دەکات. لەپای هیچ شتێکیشدا، بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە فەرمانەکانی پەروەردگاری لای نەداوە. تەنانەت لەو کاتەشدا کە پێیان وت: "ڕۆڵەکەت سەر ببڕە" هێندەی تۆزقاڵێك دوودڵیی نەنواندوە.[1] ئەو کاتەش کە فەرمانی: "هاوسەرەکەت و ڕۆڵەکەت لە بیابانێکی کاکی بەکاکیدا جێبهێڵە"ی پێ گەیشت، دەمودەست بەجێی گەیاند، پاشانیش بێ ئەوەی ئاوڕبداتەوە ڕۆیشت و بەجێی هێشتن.[2] جارێکی تریان بە گیانی خۆی تاقی کرایەوە؛ ئەوە بوو خرایە ناو ئەو ئاگرە دۆزەخییەی بۆی ئامادە کرابوو. بەڵام بۆ ساتێکیش بێت، خەم و سەغڵەتی ڕووی ئاسمانی متمانە و دڵنیایی ئەویان دانەپۆشی. بەڕادەیەك، کاتێك فریشتەش هات و پێشنیاری کۆمەکی کرد، ئەم خوادۆستە پێشنیارەکەیی ڕەتکردەوە و فەرمووی: "خۆ ئەو دەزانێت!" بە دڵنیاییەوە ئەو تەسلیمییەتەی ناخی پڕکردبوو لە "بَرْد وَسَلام" ئاگرەکەشی بۆ کرد بە "بَرْد وَسَلام".[3]

جا ئیدی حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئەم پێغەمبەرە بووە و پەیوەندیشی بە خوای گەورەوە تا ئەم ڕادەیە توندوتۆڵ بووە. بۆیە دوای هەموو ئەمانە، هێشتا بیر کردنەوە لەوەی کە دەکرێت پێغەمبەرێکی ئاوا مەزن کەوتبێتە ناو گوناهەوە، لە ڕاستیدا ئەمە جگە لە نەزانین و نەناسینی، ڕاشکاوانەتر بڵێین؛ جگە لە جەهالەتێکی قەترانی چی تر نییە..

---

١ بڕوانە: سورەتی الصافات، ئایەتی ١٠٢-١٠٣.

٢ بڕوانە: سورەتی إبراهیم، ئایەتی ٣٧. بۆ وردەکاری فەرموودەکەش بڕوانە: بخاري، الأنبیاء ٩؛ بیهقي، السنن الکبری ٥/٩٨.

٣ بڕوانە: سورەتی الأنبیاء، ئایەتی ٦٩. بۆ وردەکاری فەرموودەکەش بڕوانە: قرطبي، الجامع لأحکام القرءان ١١/٣٠٣-٣٠٤.

بەڵێ، ئەو شەفەقەت بوو بە بەرجەستەبوویی.. ئەوە بوو ئەم نموونە باڵایەی شەفەقەت داوای هیدایەتی باوکی کردبوو.. بەڵام هەر کە ماهییەتی ڕاستەقینەی باوکی بۆ دەرکەوت، دەستبەجێ لە داواکارییەکەی پاشگەز بووبووەوە. لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە لە ئاخیرەتدا خوای گەورە باوکی لەسەر شێوەی بزنمژمیەکدا دەردەخات، جا کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم ئەم دیمەنە دەبینێت، ئیتر دەستبەرداری ئەو پەیوەندییە سروشتیەش دەبێت کە بە باوکیەوە بەستوویەتییەوە.[1]

ڕاستیی هەموو شتەکانیش هەر خوای گەورە خۆی دەیزانێت.

## ٤. نموونە باڵاکەی عیففەت: حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام)

تەورات پڕە لە بوختان و درۆ دەربارەی حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام). هەرچی بوختان و درۆ و دەلەسەی شاخدار هەیە هەر هەموویان ڕیزکردووە و حەزرەتی یوسفیان -حاشا- دابەزاندووەتەوە ئاستی مرۆڤێکی بێ ئەرزش. لە کاتێکدا ئەم پێغەمبەرە سەروەرە لە ڕوانگەی ناخ و ڕواڵەتیشیەوە پێغەمبەرێکی پاك و بێگەردە و، وەك هەر پێغەمبەرێکی تر، ئەویش بە سیفەتی عیصمەت ساز و پڕچەك کراوە.

بەڵام جێی داخ و کەسەرە کە هەندێك لە تەفسیرنووسەکانی خۆشمان لە ڕێگەی ئەو لێوەرگرتانەی کە ناوردبینانە لە تەوراتەوە یاخود بە شێوەیەکی گشتی لە ئیسرائیلیاتەوە وەریانگرتووە، بوختانگەلێکی وایان داوەتە پاڵی، کە هەرگیز بۆ ئەو پێغەمبەرە مەزنە ناشێن و عیصمەتەکەی لەکەدار دەکەن. جا وەك چۆن تیشکمان خستە سەر عیصمەتی ئەو پێغەمبەرانەی لە خزمەتیاندا بووین، لێرەشدا هەوڵ دەدەین لەژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا، خوێندنەوە بۆ ئەو ڕووداوانە بکەین کە تایبەتن بە حەزرەتی یوسفەوە و، لە دووتوێی ئایەتەکاندا عیصمەت و

---

١ بخاري، الأنبياء ٨، حكيم، المستدرك ٢/٢٦٠.

عیففەتی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە پیشان بدەین. لە ڕاستیدا ئەمە هەوڵی پیشاندان و دەرخستنی شتێکە کە هەر خۆی هەیە. گەرنا، ئەم بابەتە لە قورئاندا زۆر بەڕوونی و ڕاشکاوانە باسی لێوە کراوە. تەنانەت ئەگەر کەسی عەوامیش یەکجار سورەتی یوسف بخوێنێتەوە -بە مەرجی تێڕامان لە واتاکانی- ئەوا دەتوانێت بەئاسانی ئەو لایەنانە بدۆزێتەوە کە قسەمان لەسەر کرد. ئەوەندە بەسە بەچاوێکەوە نەڕوانێت کە بڕیاری پێشوەختە کوێری کردبێت.

حەزرەتی یوسف بە منداڵی لە لایەن براکانیەوە خرایە بیرەوە و دواتریش وەك کۆیلە فرۆشرا و برا بۆ میصر. لەوێش وەزیرێك کڕییەوە. دواتریش کردیان بە کوڕی خۆیان و لەئامێزیان گرت. بەڵام کە یوسف دەورانی منداڵی تێپەڕاند و پێی نایە تافی لاوێتییەوە، هاوسەری وەزیر کۆمەڵە هەستێکی تری لا دروست بوو بەرامبەر بە یوسف. ئیتر ئەوە بوو ڕۆژێکیان -هەروەك قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە- دەرگاکانی بەتوندوتۆڵی لەسەر داخست و ویستی بیدات بەدەم گێژەڵووکەی ئارەزووەکانیەوە. بەڵام حەزرەتی یوسف کە لە ئاست ئەو داوایە داچڵەکیبوو و، ڕووبەڕووی شتێك بووبووەوە کە تا ئەو ساتەوەختە نە بە خەیاڵیدا هاتبوو نە بیریشی لێکردبووەوە، دەستبەجێ ویستی هەڵبێت و دووربکەوێتەوە. بۆیە بەرەو دەرگاکە ڕایکرد، بەڵام هاوسەری وەزیر خۆی گەیاندێ و دەستی لە کراسەکەی گیرکرد و دڕاندی. لەو بێنە و بردەیەشدا دەرگا کرایەوە و خۆیان لەبەردەم وەزیردا بینیەوە. ئیتر بەم شێوەیە دەرگای تاقیکرنەوەیەکی تر بەڕووی حەزرەتی یوسفدا کرایەوە. ئەوەبوو ژنە هەر کە هاوسەرەکەی خۆی بینی، یەکسەر دەستی کرد بە درۆ و بوختان هەڵبەستن: "داخۆ سزای ئەو کەسە چییە ویستبێتی خراپە لەگەڵ خێزانەکەتدا بکات؟ جگە لەوەی بەند بکرێت یان سزایەکی بەئێش بدرێت؟"[١] ئەمە بوختان بوو، بوختانێك لە هەموو ڕوویەکەوە ڕوون و ئاشکرا!

---

١ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ١٥-٢٥.

ئێستاش با لە نێوەندی دێڕی ئایەتەکاندا بەدوای ئەو ڕووداوەدا بچین کە لەسەرەوە باسمان کرد و، لەو خاڵانە ورد ببینەوە کە ئاماژە بۆ عیصمەتی حەزرەتی یوسف دەکەن:

﴿وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾

(یوسف : ٢٣)

"جا ئەو ئافرەتەی کە ئەو لەماڵیاندا بوو، بانگی کرد بۆ لای خۆی و هەموو دەرگاکانیشی توندوتۆڵ داخست و وتی: 'دەی وەرە لامەوە!' یوسف وتی: 'معاذ الله (پەنا بە خوا)! لە ڕاستیدا مێردەکەت گەورەی منە و ڕێزی لێگرتووم و چاك ڕەفتار بووە لەگەڵم. بێگومان ستەمکاران سەرفراز نابن.'"

پێش هەموو شتێك قورئانی پیرۆز غەیبەت ناکات. ناوی ئافرەتەکە ناهێنێت، بەڵکو تەنها بە ناونیشانی "ئافرەتی ماڵەکە" ئاماژەی بۆ دەکات.

ئەوە ئافرەتەکە بوو کە هەموو دەرگاکانی داخست. یەکەم دەنگیش بە هەموو ناز و مەکرێکەوە لە لایەن ئافرەتەکەوە هات. بەدواشیدا دەنگێك لەو کۆتەڵی عیففەتەوە بەرز دەبێتەوە: "مَعَاذَ ٱللَّهِ" ئای، حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ السَّلَام) بەم هەڵوێستەی، چ نموونەیەکی مەزنی ئیرادەیە بۆ هەموو ئەو گەنجانەی کە تا ڕۆژی قیامەت دێن!

لە ئایەتەکەدا ڕاشکاوانە دیارە کە حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ السَّلَام) هەڵوێستێکی یەکلایەنە و بڕاوەی نواندووە بەرامبەر ئەو داوایەی لێی کراوە. ئینجا تۆ بڵێی حەزرەتی یوسف مەبەستی کێ بێت کاتێك دەڵێت "ربي"؟ یان ئەوەتا مەبەستی لە خوای گەورەیە. چونکە لای وایە چوونە نێو گوناهەوە، نکووڵی کردن و بەدنمەکی

نواندنە بەرامبەر بەو هەموو بەخشایشانەی کە پەروەردگاری پێی بەخشیوە. خۆ ئاشکراشە کە بەدنمەك و بێوەفاکان هەرگیز بە سەرفرازی ناگەن. یان مەبەستی لە هاوسەری ئافرەتەکەیە، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا هێمایەکە بۆ ئەو وتەیەی کە هاوسەری ئافرەتەکە پێشتر وتبووی: ﴿أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ﴾ "بەجوانی ئاگات لێی بێت!" هەر لە ڕاستیشدا هاوسەری ئافرەتەکە چاکەی گەورەی لەگەڵ یوسفدا کردبوو. جا ئیتر لە بەرامبەر هەموو ئەم چاکانەدا یوسف چۆن دەیتوانی بەدنمەکی بکات؟!

یەکێکی تر لەو خاڵە گرنگانەی کە پێویستە لێرەدا سەرنجی بدرێت، ئەوەیە کە هەڵهاتنی حەزرەتی یوسف لە گوناهـ، هەرگیز لەبەر ئەو چاکە و بەخشایشانە نەبووە کە خاوەنەکەی یاخود خوای گەورە هەیانبووە بۆی. بەڵکو ئەمە، تەنها یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی بابەتەکە و دابەزینە ئاستی تێگەیشتنی ئافرەتەکەیە. ئەگینا هۆکاری هەڵهاتنی حەزرەتی یوسف لەگوناهـ، هەر لە یەکەم ڕستەدا کە لە زاری دێتەدەر خۆی حەشارداوە: "مَعَاذَ ٱللَّهِ - پەنا دەگرم بە خوا!" کەواتە هۆکاری هەڵهاتنی لە گوناهـ، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ترس و ڕێز و شکۆمەندیی خوای گەورەوە هەیە. تەقوای پەسەندیش هەر ئەمەیە.

لە هەمان کاتدا حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ) بەئاگا بوو لەوەی کە گوناهـ چ ئەنجامێك بەرهەم دەهێنێت. گوناهـ ستەمە، تێپەڕاندنی سنورێکی دیاریکراو و چوونە ناو بازنەیەکی خراپەکێشەوەیە. ئەنجامەکەشی خەسارەتمەندیی هەردوو دنیایە.

شایانی باسە ئەو ئایەتەی کە بووەتە مایەی هەڵە تێگەیشتن و هەڵە باسکردنی حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ)، ئەو ئایەتەیە کە ڕاستەوخۆ دوای ئەم ئایەتە دێت:
﴿وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦ﴾ (یوسف : ٢٤)

بەرلەوەی بچینە سەر واتای ئایەتەکە، وای بە باش دەزانم کە هەڵوێستە لەسەر چەند وشەیەك بکەین؛ ئەو وشەیەی کە لە ئایەتەکەدا بووەتە تەوەرەی هەڵە تێگەیشتن، بریتیە لە وشەی "هَمَّ".

وشەی "هَمَّ" کرداری ڕابردووە. لە ڕاستیدا ئەم وشەیە واتای جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت. بۆیە پێویستە بەگوێرەی حاڵەتی بکەر (فاعل)ی ناو ڕستەکە، یەکێك لە واتاکانی هەڵبژێرین. لە زانستی زمانەوانیشدا یاسایەك هەیە دەڵێت: (ئەگەر بەڵگەیەکی پێچەوانە یاخود نەگونجاوییەك لەگەڵ بابەتەکەدا لە ئارادا نەبێت) ئەوا واتای ڕاستەقینە و سەرەکی وشە، ئەو واتایەیە کە لە یەکەم ڕیزدایە. بەدوور لە جیاوازییە ناوچەییەکان، ڕاو بۆچوونی پسپۆڕانی زمانەوانی لەم بوارەدا جێی بایەخە. بەراییترین مانای وشەی "هَمَّ" کە لە فەرهەنگەکاندا بەرچاومان دەکەوێت، بریتییە لە "أَقْلَقَ" و "حَزِنَ". "أَقْلَقَ" بە واتای: نائارامیی دەروونی، دڵەکوتێ و بێ ئۆقرەیی، بە حەسرەتەوە سووتان، سکاڵاکردن و کڕوزانەوە دێت.

جا کاتێك ئەم کردارە دەدرێتە پاڵ زولەیخا، ئەم واتایانە دەگەیەنێت: "زولەیخا لەتاو یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) ئۆقرەی لێبڕا و ئاگری تێبەربوو، کەوتە تەنگانەوە و نوقمی دڵتەنگی بوو." بێگومان حەزرەتی یوسفیش (عَلَيْهِ السَّلَام) بەگوێرەی دنیاکەی خۆی نوقمی جۆرێك لە بێ ئۆقرەیی و خەمباری بووە. چونکە ئەو لەو ماڵەدا دەستبەسەرە. ئەگەر ڕاشی بکردایە، دیسانەوە دەگیرایەوە و دەهێنرایەوە. زیاد لەوەش، ئەم ئافرەتە دەسەڵاتی بەسەردا هەبوو. کەوابێ، وەك چۆن ئافرەتەکە لەتاو حەسرەت و سووتانی بۆ یوسف، خەم دایگرتبوو و ئارامی لێبڕابوو، حەزرەتی یوسفیش لەتاو عیصمەت و عیففەتی خۆی ئارامی لێبڕابوو. تا ئەو ساتەش کە پەروەردگاری بەڵگە و بورهانی پیشان دەدا، بەتەواویی نەیدەزانی کە لەژێر دڵنیایی و پارێزگاریدایە.

بەڵێ، خوای گەورە حەزرەتی یوسفی دەپاراست لەوەی پرژەی گوناهـ بەر دامێنی بکەوێت، بۆیە بە شورایەك لە بورهان و بەڵگە چواردەوری تەنیبوو. بەڵام تا ئەو کاتەی بەرِووی ئەمانەدا بەئاگا دەهاتەوە، تووشی جۆرێك لە ترس و سەغڵەتی و داچڵەکین دەبوو. پێم وایە ئەو لایەنەش کە پێویستە بەر لە هەموو شتێك لەسەری بوەستین، ئەم لایەنە بێت. بۆیە بە پێویستی دەزانم لە سۆنگەی ئەم تێروانینەوە جارێکی تر چاو بخشێنرێتەوە بەسەر ئەو تەفسیرانەدا کە قسەیان لەسەر ئەم بابەتە کردووە.

**دووەم:** زولەیخا بەردەوام لە هەوڵ و تەقەلا و پێداگریدا بوو. بەڵێ، ئەو ئامانجێکی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو؛ هەرچۆنێك بوو دەبووایە یوسف (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) بۆ ئەو بووایە، هەموو خەم و خەفەتەکەشی هەر ئەمە بوو. هەرواش بوو، ئەوەتا ئایەتێکی تر باسی حاڵەتەکەیمان بۆدەکات دەفەرموێت: ﴿ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾ (یوسف : ٣٠) "عەشق و ئەویندارییەکەی دڵی کون کون کردبوو." هەرچی دۆخەکەی حەزرەتی یوسفیشە (عَلَيۡهِ السَّلَامُ)، لە رێگەی ئەم ئایەتەوە پیشان دەدرێت: ﴿ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴾ (یوسف : ٢٤) "ئیتر بەم شێوەیە گوناهـ و تاوان و خراپەمان لێ بەدوورگرت. چونکە بەراستی ئەو لەو بەندانەمان بوو کە یەك پارچە بووبوو بە ئیخلاس." وِ بەم وشە عیففەت ئامێز و ئیحسان رِەهەندییانە باس دەکرێت.

دەستەواژەی "مُخۡلَص"یش کە لەئایەتەکەدا باسکراوە، گرنگی تایبەتیی خۆی هەیە. بەڵێ، "مُخۡلِص" هەیە و "مُخۡلَص"یش... حەزرەتی یوسف (عَلَيۡهِ السَّلَامُ) لەم دووەم دانەیەیان، واتە لەگرۆی موخلەصینە. هەموو پێغەمبەرێك موخلەصە.

موخلیص، واتە ئەو کەسەی ئیخلاسی هەیە. ئەم جۆرە مرۆڤە، هەر ئیشێك بکات لەپێناو خوای گەورەدا دەیکات و لە هەموو کار و کردەوەیەکیدا تەنها

ڕەزامەندی ئەوی مەبەستە. بەم پێیە، ئەو مرۆڤەی لەنێو پاکیزەیی و دڵسۆزیدا بەردەوام بەدوای بەخوا پەیوەست بوونەوەیە، پێی دەوترێت "مُخْلِص". بەڵام وەك دەبینین، جارێ لە قۆناغی گەڕاندایە و هێشتا بەدەم ڕێوەیە. بە دەربڕینە تەسەووفییەکە: لەپلەی "سَيْرٌ إِلَى الله"دایە. واتە، لە دەمی ڕۆیشتندایە بەرەو خوای گەورە. خەباتی بەدەستهێنانی ئیستیقامەت دەکات لە هەڵسوکەوت و کردارەکانیدا. بەڵام موخلەص؛ کەڵە پیاوێکە لە گشت خەم و دوودڵییەك ڕەخسیوە و لە لوتکەی ئیخلاسدا تەختی دامەزراندووە. موخلەص هەر لە زووەوە ئەو ڕێگایانەی تێپەڕاندووە کەوا موخلیص لە تێپەڕاندنیاندایە. بگرە ڕێبوارییەکەی بە "سَيْرٌ مِنَ الله" گەڕانەوەش لە لای خواوە تاجدار کردووە. جا بۆیە ئەو ساتمە و تەنگوچەڵەمانەی ئێمەومانان جاربەجار تێیان دەکەوین، ئەوان هەر ناشزانن چییە. حەزرەتی یوسفیش یەکێکە لەمانە. کەوابێ، ڕەفتار و بیرکردنەوەیەك کە تەنانەت لە موخلیصێکیش ناوەشێتەوە، چۆن و بە چ شێوەیەك ڕێی تێدەچێت لە موخلەصێکی وەك حەزرەتی یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) بوەشێتەوە؟

لە لایەکی ترەوە قورئانی پیرۆز لە ڕێگەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾ (یوسف : ٢٢) "جا پاداشتی موحسینان بەم شێوەیە دەدەینەوە." ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە حەزرەتی یوسف لە موحسینانە. ئێمەومانان لە ڕێی ئیمانەوە بەکردەوە و، لەڕێی کردەوەشەوە بە ئیمانی تەحقیقی دەگەین. لە کۆتایی ڕێشدا ئینجا ئەگەر بتوانین بەرز ببینەوە بۆ پلەی ئیحسان. ئەم کۆتا پلیکانەیەی کە لە قەوسی عرووجدا بۆ ئێمە تەقدیر کراوە، بۆ پێغەمبەرێك سەرەتای کار و یەکەمین هەنگاوی گەشتەکەیەتی. ئیحسان هەروەك لە فەرموودەی: "أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ"یشدا باسکراوە، "پەرستشی خوای گەورەیە وەك ئەوەی کە ببینی."[1] جا ئیتر ئەم قۆناغە، کە بۆ ئێمە دوایەمین

١ بخاري، الإيمان ٣٧، تفسير سورة (٣١) ٢؛ مسلم، الإيمان ٥، ٧.

سنوور و خاڵی ئاسۆیە، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ) هەر لە دەستپێکی کارەکەیاندا پێی بەهرەمەند کراون... ئەوان گەشتەکەیان لە خاڵێکەوە دەست پێکردووە کە لە ڕوویەکەوە بۆ ئێمە بە پایان دادەنرێت. بۆیە کاتێك هەڵدەستین بە لێکدانەوە و شیکاری بارودۆخی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَامُ)، وا پێویست دەکات کە هەمیشە لەم دیدگایەوە بۆ مەسەلەکان بڕوانین. بە پێچەوانەوە، ئەگەر لەگەڵ خۆمان بەراوردی بکەین و لەسەر خۆمان پێوانەیان بکەین، ئەوا بەردەوام دەکەوینە هەڵەوە و بە هیچ جۆرێك ناگەین بە حەقیقەتی پێغەمبەران.

زولەیخا و حەزرەتی یوسف هەریەکەیان مرۆڤی دوو دنیای تەواو جیاوازن. ئەوەتا یەکێکیان مرۆڤێکە لەتاو عەشقەکەی بەرچاوی گیراوە و ئیرادەی ئیفلیج بووە و لە دنیای هەستەکانیدا نقوم بووە. ئەوی دیکەشیان پێغەمبەرێکە چاوی بەڕووی جیهانەکانی ئەو دیودا کراوەتەوە و بە ڕازی ئیحسان گەیشتووە و بووەتە گەوهەر و کرۆکی ئیخلاس. بێگومان ئەویش هەردەم بەرەو دنیاکەی خۆی لە باڵەفڕێدایە.

وەك دەبینن، بۆ هەردووکیشیان "هَمَّ" بەکارهاتووە. بەڵام واتای ئەم وشەیە، بەگوێرەی مەبەست و ئامانجی هەریەکەیان لەوی تریان جیاوازە. بەڵێ، کاتێك قسە لەسەر واتای وشەی "هَمَّ" دەکەین، ئەوا پێویستە ڕەچاوی هیممەت و بنیادی فکری و پاشخانی زانستی و جیاوازیی کولتووری هەردوو بکەرەکە بکرێت و بەگوێرەی ئەمە واتا ببەخشرێتە وشەکە. جا لەو تابلۆیەشدا کە پاش کەمێکی تر دێتە کایەوە، جیاوازی نێوانیان بەڕوونی دەردەکەوت. یوسف (عَلَيْهِ السَّلَامُ) بەرەو عیصمەت و عیففەت هەڵدێت و زولەیخاش بەرەو شەهوەت و گوناه.. هەروەك بڵێی هەردووکیان لە پێشبڕکێدا بن. حەزرەتی یوسف هەڵدەهات و ئەوی تریش دوایکەوتبوو. ئەگەر لە حەزرەتی یوسفدا هێندەی گەردیلەیەك مەیل و ویست هەبووایە، ئاخر خۆ ڕاوەدونانێکی لەو جۆرە ڕووی نەدەدا! ئەمە مانای وایە کە بڕیار و نیاز و ئامانجی حەزرەتی یوسف تەواو جیاواز بووە. هەڵهاتنەکەشی هەر بەرەو ئەو ئامانجە باڵایە

بووه. جا خۆ کاتێکیش تەماشای ئەو مشتومڕە دەکەین کە لە نێوانیاندا ڕوویداوە، زۆر بە ڕوونی ئەم لایەنە دەردەکەوێت.

بەڵێ، حەزرەتی یوسف بە جۆرێك لەدەست زولەیخا هەڵدێت، وەختێ ئافرەتە لەدواوە ڕایدەکێشێت و دەیەوێت نەهێڵێت لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، کراسەکەی لەدواوە دەدڕێنێت. ڕێك لەو کاتەدا حەزرەتی یوسف دەرگاکە دەکاتەوە و دەردەپەڕێتە دەرەوە، ئافرەتەش بە دوایدا. ئیتر بەم ڕاوەدوونانەوە خۆیان لەبەردەم وەزیردا دەبیننەوە. لە وەها حاڵەتێکدا کە ئافرەتە لە پەشۆکاویدا نازانێت چی بڵێت و چی بکات، خێرا دەکەوێتە بەرگری کردن لە خۆی و بوختان هەڵبەستن بۆ حەزرەتی یوسف.. بەڵێ، دەکەوێتە بوختان هەڵبەستن. بەڵام نە خۆی باوەڕی بە قسەکانی خۆی دەکرد، نە مێردەکەشی. ئینجا لەو بەینەدا شایەتیش هەبوو. شایەتێك کە بەبێ دەنگییەکەی ڕەوانگۆترین وتاربێژانی بێدەنگ دەکرد، بەدڵنیاییەوە ئەو شایەتەش کراسە دڕێنراوەکەی حەزرەتی یوسف بوو. ئەمە وێڕای ئەوەی کە یەك لە خزمانی ئافرەتە یاخود منداڵێك کە تا ئەو کاتە زمانی نەپژابوو، واژۆی شایەتیی خۆی لەسەر ڕووداوەکە دەکات.

مەسەلەکە ڕوون و ئاشکرا بوو؛ حەزرەتی یوسف تاڵە موویەك چییە مەیلی بەلای گوناهدا نەچووبوو. چونکە کراسەکەی لەدواوە دڕابوو. خۆ ئەگەر نیازی شتێکی وای هەبووایە و ئافرەتەش لە حاڵەتی بەرگری کردندا بووایە لە خۆی، ئەوکات دەبوو دڕاویی کراسەکە لەپێشەوە بووایە. ئەوە بوو یوسف (عَلَيْهِ السَّلَام) هەر لەوێدا یەکێك لە بەڵگەکانی بینی. ئەوە بوو پەروەردگاری لەڕێی کراسێکی دڕاوەوە پاراستبووی و هەنگاوێکی تری بەرەو ئایندە پرشنگدارەکەی پێ هەڵنابوو.

جا ئیتر بەم شێوەیە، "هَمَّ"ەکەی حەزرەتی یوسف بەرەو ئامانج و ئەوینەکەی خۆی بووە و ئەوەی زولەیخاش بەرەو ئەوینەکەی خۆی. بەشێك لەو موفەسسیرانەی

که "هَمَّ"ی مرۆڤێك کەوا خەڵوەتکێشی خەڵوەتی ئیلاهییە و، پێغەمبەرێك کە هەمیشە بە هەستی چاودێری خوای گەورەوە دڵی لە لێداندایە، لەگەڵ "هَمَّ"ی ئافرەتێکدا، کە جگە لە شەهوەت و ئارەزووبازی چاوی هیچی دیکە نابینێت، بەیەك چاو تەماشا دەکەن و لە تای هەمان تەرازوودا کێشانەیان دەکەن و بیر و نیازی هەردووکیان لەنێو تەمومژ و چەرە دووکەڵی حەزە جەستەییەکاندا موتالا دەکەن، لە ڕاستیدا بەهۆی ئەوەی چاویان لە بینینی وەها لایەنێکی ناسك و هەستیار کەلا بووە، کەوتوونەتە نێو هەڵەیەکی گەورەوە. پێشم وایە هەموو ئەو ڕاڤە و لێکدانەوانەی کەوا پاڵپشتیان قورئان و سوننەت نییە و تەمغەی ئەو دوو سەرچاوە کەوسەرییەیان پێوە نییە، دەبێت جارێکی تر چاویان پێدا بخشێنرێتەوە. لەو باوەڕەدام ئەم چاو پیاخشاندنەوە و ڕاستکردنەوەیە، ڕۆحی ئەو کەڵەزانا دڵسۆزانەشمان شاد بکات کەوا بوونەتە قوربانی دەستی ئیسرائیلییات. چونکە مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت بەهۆی ئەم هەڵەیەیانەوە لە چ فەیز و بەرەکەتێکی مەعنەوی بێ بەش بوون!

بەڵێ، بەتەواوی دڵنیاییمانەوە دەڵێین کە: ئەوانەی دەیانەوێت پێغەمبەران وەك مرۆڤانی ئاسایی هەڵبسەنگێنن و بە تەرازووە سەرکەرەکانی خۆیان لە کێشانەیان بدەن، ئەوا با بزانن کە لە کەشی مەعنەوی و بۆن و بەرامەی ژیانبەخشی ئەو سەروەرانە بێ بەش دەبن.

سەفسەتەگەلێکی هاوشێوەی ئەوەی کە: حەزرەتی یوسف لە ناخی دڵیەوە بەنیاز بوو بەرەو داواکەی زوڵەیخا مل بنێ، کەچی لەو کاتەدا حەزرەتی یەعقوبی (عَلَیْهِ السَّلَام) بینی، "دەمی داچەقیبوو و بە سەرسامییەوە دەیڕوانییە یوسف." لە نموونەی ئەو بوختانانەن کە کتێبە شێوێنراوەکان بۆ پێغەمبەرانی هەڵدەبەستن و دەیانەوێت عیصمەتەکەیانی پێ عەیبدار بکەن. بۆیە پێویستە بە هەموو شێوەیەك لە سەرچاوەکانماندا بسڕێنەوە!..

عەبدولعەزیز دەبباغ کە یەکێکە لە ئەولیا گەورەکان، لە ڕاڤەی ئایەتی: ﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا ﴾ (یوسف : ٢٤)دا، "هَمَّ" بەم جۆرە لێکدەداتەوە: "زولەیخا بەگوێرەی خواستی بیر و بۆچوون و تەسەووری خۆی ڕاپەڕی، حەزرەتی یوسفیش (عَلَيْهِ السَّلَام) بە مەبەستی دەست پێهەڵگرتنی زولەیخا لەم کارە، ڕاپەڕی. ڕەنگە بەنیاز بووبێ لێی بدات یان دەستی لێ بەرزبکاتەوە." ئەمە دەڵێت و لەم گۆشەیەوە وشەی "هَمَّ" لێك دەداتەوە.[1] شایانی باسە شنەی شەماڵی ئیلاهی، ئاسۆی نەخوێندەواریی ئەم زاتەی ڕۆشن کردووەتەوە و چەندین گەوهەرە پەیڤی تری بەسەر زاردا هێناوە.

ئاخر چۆن دەکرا شتێکی جیاواز لەمە، سەبارەت بە بەژن و باڵایەکی وەك حەزرەتی یوسف بێت بە خەیاڵدا، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەوەڵامی ئەوانەدا کە پێیان وت: "تۆ کەریمیت. واتە: میهرەبان و بەخشندە و خانەدان و بەڕێزیت." حەزرەتی یوسفی بە نموونە هێنایەوە و فەرمووی:

إِنَّ الْكَرِيمَ بْنَ الْكَرِيمِ بْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِ اللهِ

واتە: "کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریم، یوسفی کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم (خليل اللّٰه)یە."[2] حەزرەتی ئیبراهیم باپیرەگەورەی و، ئیسحاق باپیری و یەعقوبیش باوکیەتی. ئیدی یوسف، کەریمی کوڕی کەریمێکی ئاوایە... پێغەمبەری خواش بەم دەربڕینانەی، حەزرەتی یوسفی لە پلەیەکی وادا نیشان دەدا، کە ئێمە تەنانەت بە خەیاڵیش نایگەینێ.

ئاخر ئەگەر کەسانێکی سادە و ساکاری وەك ئێمە کە نەك هەر لە کاکڵە و

---

١ عبدالعزيز الدباغ، الإبريز ل٢١٢.
٢ بخاري، الأنبياء ١٨-١٩، مناقب ١٣؛ ترمذي، تفسير (١٢) ١.

پوختەی بوون نین، بەڵکو بگرە لە خڵتەکەشین، بیرمان بەلای گوناهێکی لەو جۆرەدا نەچێت، دەی دانانی ئەگەری ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرە پاکداوێنە مەزنە تەنازوولی بۆ شتی وا کردبێت، جگە لە سەفسەتەیەکی دوور لە ژیری و جاڕی دەست لەکارکێشانەوەی ئەقڵ و مەنتیق، چ شتێکی ترە؟! نە ئەقڵ و نە نەقڵیش هیچ کامیان شتی وایان پێ قبووڵ نییە.

پێغەمبەرێك، وەختێ ئاشووفتەیی ژنان ڕووی لە زیاد بوون کرد و بازیی لە خشتەبردنیان چووە ڕەهەندێکی ترەوە، ڕووی کردە پەروەردگار و وتی: "پەروەردگارا، من زیندانم بەلاوە خۆشترە لەوەی ئەوان بانگم دەکەن بۆی."[1] ئەمەی وت و ژینی خۆشی و زەوق و سەفای کۆشکی بەجێهێشت و لەپێناو عیففەت و داوێن پاکییەکەیدا بە ژیانی بۆگەن و پڕ چەرمەسەری بەندیخانە ڕازی بوو. جا ئایا چوونە ژێر باری نزیکەی نۆ ساڵ ژیانی پڕ مەینەتی و ناخۆشی بەس تەنها لەبەر عیففەت و عیصمەتەکەی، بەس نییە بۆ سەلماندنی عیصمەتەکەی؟ لەو لاشەوە ئافرەتانێك کە لە بەرامبەر جوانی و قەشەنگیی ئەم لاوە داوێنپاکەدا لەهۆش خۆ چووبوون و دەستی خۆیان بڕیبوو.[2] ئافرەتانێك کە بەمەبەستی خولقاندنی دۆخێکی دژوار بۆی، سەوداسەری و ئەوینی زولەیخایان بۆی بڵاوکردبووەوە و لەپێناو نزیك بوونەوە لێی، ڕێگەی لە خشتەبردن نەمابوو تاقی نەکەنەوە.[3] کەچی هەموو جارێك ئەم گەنجە ئیمان گرانێتییەیان لە بەرامبەر خۆیاندا دەدیتەوە و بابی فلسێکیش بێت نەیانتوانی مەیلی لێ بستێنن.

ئیتر ئەو پێغەمبەرە مەزنەش کەوتە دوعا کردن و لەپەروەردگاری پاڕایەوە تاوەکو کۆمەکی بکات نەکەوێتە ناو ئەو بازنە خراپەکێشەوە. پەروەردگاریشی

١ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ٣٣.
٢ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ٣١.
٣ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ٣٠.

پاڕانەوەکەی گیراکرد و لە زینداندا زامنی پارێزراویی کرد. لەپاش ئەویش دەرگای زیندانەکان هەروا بەکراوەیی مانەوە بۆ دەردمەندانی هەموو سەردەم و قۆناغەکان و، بەندیخانەکان بۆ خزمەتگوزارانی ئیمان و قورئان و کارگوزارانی حەقیقەت بوون بە "مەدرەسەی یوسفیە".[1]

ئەوەندە بەتەنگ عیففەتەکەیەوە بوو، ئەوەبوو ئەو ڕۆژەی هەواڵیان دایێ و پێیان وت: "ئیدی سەربەستیت، ئازاد بوویت لە زیندان!" ئەو پێداگری کرد و وتی: "هەتاوەکو داوێنپاکیم بۆ هەموان ئاشکرا نەبێت، لە زیندان ناچمە دەر."[2] داوێنپاکیی شتێك بوو و سەلماندنیشی شتێکی تر.. هەردووکیشیان لە ڕوانگەی ئەو ئەرکەی کە لە ئاییندەدا ڕایدەپەڕاند، ڕۆڵی زۆر گرنگ و بەرچاویان دەگێڕا. ئەوەبوو لە زیندان نەچووە دەر.. زولەیخاش لە جێیەکدا و بە ئامادەبوونی هەموان دانی نا بە تاوانەکەیدا. دواتریش باسی ئەوەی کرد کە حەزرەتی یوسف چ هێما و نموونەیەکی باڵای داوێنپاکییە.[3]

جا ئیتر لە کاتێکدا کە تەنانەت زولەیخاش دان بە تاوانەکەیدا دەنێت و عیصمەتی ئەو ڕادەگەیەنێت، دەبێت چی بەوانە بوترێت کە هێشتا هەر بوختان بۆ ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزە هەڵدەبەستن؟ ڕاستییەکەی منیش نازانم...

### ج) ...ئینجا عیصمەتی سەروەرمان (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)

هەموو پێغەمبەران مەعصومن. سەروەری پێغەمبەرانیش، مەعصومی سەروو مەعصومانە. ئاخر چونکە ئەو سوڵتان و سەرداری پێغەمبەران و مەبەستی مەزنی بەدیهێنانی گشت بوونەوەرانە. بەڵێ، چامەی نبووەت تەنها سەروا(قافیە)یەکی

١ بڕوانە: وتەکان، پەراوێزیمەقامی دووهەمی وتەی سیازدەهەم.
٢ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ٥٠.
٣ بڕوانە: سورەتی یوسف، ئایەتی ٥١.

مابوو بخرێته سەری. خوای گەورەش (جَلَّ جَلَالُهُ) هەرە خۆشەویستەکەی خۆیی وەك دوا سەروای ئەو چامەیە بەدیهێنا. تا ئەو کاتە، تاوسێك نەبوو لە ئاسمانی پێغەمبەرایەتیدا لە پەروازدا بێت. ئەو هات و بوو بە تاوسی ئەو ئاسمانە. هەر پێغەمبەرێك بۆ کات و شوێنێکی دیاریکراو نێرراوە.. کەچی سنووری کاتی ئەو، ئەبەد موددەت و، چێوەی شوێنەکەشی سەرانسەری گەردوونە. دوێنراوەکانیشی تێکڕای بوونەوەرانن بەجاریَ.[1]

بەڵێ، هیچ کام لە پێغەمبەران بەوێنەی ئەو، بە وەها شێوەیەکی گشتگیر و هەمەلایەن حەقیقەتی بوونیان ڕاڤە نەکردووە و لێی نەدواون. پێویستیشی نەکردووە لێی بدوێن، چونکە ئەرکی سەرشانی ئەوان نەبووە. ئینجا ئەوەشی بچێتە سەر کە لەو سەردەمانەدا هێشتا زانستەکان نەدۆزرابوونەوە و چنراوی بوونیش ڕیشاڵ ڕیشاڵ شیتەڵ نەکرابووەوە. هەموو ئەمانە لەسەردەمی حەزرەتی موحەممەد (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)دا دەهاتنە گۆڕێ... هەرواش بوو. بەڵێ، هیچ کام لەو فەرمایشتانەی فەرموونی، لەگەڵ زانستی ڕاست و دۆزینەوە ڕاستەکاندا دژیەك دەرنەچوون.

پێغەمبەرانی تریش هەریەکەیان ئەستێرەیەکی نووربەخشانە بۆ خۆی. بەڵام کە چاویان بە خۆر کەوت، پرشنگ و ڕووناکی خۆیان پێچایەوە و لە سینەیاندا شاردیانەوە. چونکە ئەو نوورەی هاتبوو، خۆری خۆران و یەکەمین هەوێنی بوون و خاوەنی نووری ڕاستەقینە بوو. بوصەیری چەند لەسەر زاری شیرینە کە دەڵێت:

فَإِنَّهُ شَمْسُ فَضْلٍ هُمْ كَوَاكِبُهَا يُظْهِرْنَ أَنْوَارَهَا لِلنَّاسِ فِي الظُّلَمِ

ئەو خۆری فەضلە، ئەوان هەسارەی

تیشکی بۆ خەڵك پەخش دەکەنەوە، دەمی تاریکی

بەڵێ، ئەو سەروەرە مەعصومی مەعصومانە. هەر بۆیە عیصمەتەکەشی

[1] بخاري، تيمم ١؛ مسلم، مساجد ٣.

لەسەروو هەموو عیصمەت و، عیففەتەکەشی لەسەروو هەموو عیففەتەکانەوەیە.

ئەوەتا دەبینین تەنانەت سەرسەختترین نەیارەکانیشی دەستەپاچە بوون لە دۆزینەوەی تاکە وشەیەك کە عیففەت و عیصمەتی ئەو ئازیزەی پێ عەیبدار بکەن و نەیانتوانیوە لەم ڕووەوە بچووکترین تانە و تەشەری لێ بدەن. هەتا دنیاش دنیایە هەر ناتوانن، چونکە ئەو کۆتەڵەی عیففەت و کەلووی عیصمەتە. ئاخر چۆن دەکرا خەیاڵی ئەوە بکرێت ئەو پێغەمبەرە ئازیزە چمکی تۆزاویی و دامەنی پریشك پرژاو بوویێت، لە کاتێکدا ئەو، پوختە و پاڵفتەی پاکیزەییە و بە "مُصْطَفَى"[1]یەتی بەدیهێنراوە!

دوژمنەکانی هەموو جۆرە بوختانێکیان بۆ هەڵبەست. ئەوەتا پێیان دەوت "مەجنون".[1] ڕاستیەکەی لە ڕوویەکیشەوە ئەو مەجنون و دێوانەی حەق بوو.. لەم پێناوەشدا هەرچییەکی هەبوو هەڕاجی کردبوو. کێش بیویستایە دەیتوانی تاڵانی بکات. هەرچی دەسکەوتی ئەم کارەشە، شادبوون بوو بە بەهەشت و دیتنی جەمال الله[1]...

ئینجا دەیانوت جادووگەرە..[2] بەڵێ، تەنانەت کەللەڕەقترین مرۆڤەکانیش لە حوزووری ئەودا دەتوانەوە و هەرچی کوفری ناو ناخیانە لە بناغەوە هەڵدەتەکی. جا بۆ مەگەر لە ژمارە دێن ئەوانەی کەوتنە نێو ئەفسوونی ئەوەوە و لەڕێی ئەودا سەر و ماڵیان بەخت کرد. ئیدی ئەو بێباوەڕانەی کە ژێرییان دابەزیبووە چاویان، شتێکیان بۆ نەمابووەوە بیڵێن و چلێکیان دەست نەدەکەوت کەودەنی خۆیانی لێ گیربکەن. بۆیە سەریان کردبووە وڕێنە کردن و دڵنەوایی خۆیان لە سەفسەتەدا دەبینییەوە و دەیانوت: "هەموو ئەم پەروانانە بە ئاتەشی جادوو دەسووڕێنەوە."

---

1 بڕوانە: سورەتی الحجر، ئایەتی ٦؛ سورەتی الصافات، ئایەتی ٣٦، سورەتی الدخان، ئایەتی ١٤؛ سورەتی القلم، ئایەتی ٥١.
2 بڕوانە: سورەتی یونس، ئایەتی ٢؛ سورەتی ص، ئایەتی ٤.

کەچی لە ڕاستیدا ئەوەی ئەوانی پەروانەئاسا خستبووە سووڕانەوە، هێزی ئیمان و جیلوەی کەماڵ و کێشەنیی جەماڵ بوو.

هەر بەو دەمهەڵبەستانەی سەرەوە نەوەستان، بەڵکو زیاد لەوەش ڕۆیشتن و بوختانی کاهینیشیان دایە پاڵی.[1] ئەی ئەوە نییە لە جێی خۆی دانیشتووە و هەواڵی هەموو ئەو شتانە دەدات کە تاوەکو ڕۆژی قیامەت ڕوون دەدەن! ئاخر ئەوان هەتا ئەو ڕۆژەش هەر لە کاهینەکانەوە ئەو جۆرە قسانەیان بیستبوو. لە کاتێکدا ئەگەر کەمێك سەرنجیان بدایە، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی ئەو سەروەرە لەو کاهینانە جیابکەنەوە کە قسە و گوفتاریان پڕ درۆ و دەلەسە بوو. بەڵێ، سەروەرمان هەمیشە ڕاستی دەوت و تەنها هەواڵی ئەو شتانەی دەدا کە دەیبینین، نەك شتانی تر.

ئینجا ئەگەر ئەو -حاشا- دێوانە بێت، مانای وایە شتێك نییە لە دنیادا ناوی ژیری بێت. شتانێکی ناڕەوا و دوور لە ڕاستی وەك کەهانەت و جادوو، تەنانەت بە خەونیشیدا گوزەریان نەکردووە. ئاخر خەونەکانیشی بەوێنەی ژیانی، جددی و ڕاستەقینە بوون. ئەو سروە پیرۆزانەی لە قەدپاڵە ڕوو بە جیهانە ئەو دیوییەکانی ژیانیەوە شنەیان دەهات، بەشێکیان لە پەیامەکەی پێکدەهێنا.[2]

بەڵێ، ئەوە بوو هەموو ئەو قسە پڕ زرق و باقانەیان بەخەرج دا کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ ژیری و مەنتیق و داوەریدا یەك نەدەهاتنەوە. بەڵام هیچیان زاتی ئەوەیان نەکرد تاکە وشەیەکیش لەسەر عیصمەت و عیففەتی ئەو سەروەرە بڵێن. چونکە تەنها دەم کردنەوە لەم بابەتەدا بەس بوو بۆ ڕیسواکردنی خاوەنەکەی. دۆستیش و دوژمنیش ئەمەیان زۆر باش دەزانی.

---

١ مسلم، فضائل الصحابة ١٣٢؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٧/١، ١٧٤/٥؛ إبن كثير، البداية والنهاية ٦٢/٣.
٢ بخاري، تعبير ١-٥؛ مسلم، رؤيا ٦-٩.

تاوەکو ئێستا هەزاران کەس و بە سەدان هەزار کتێب باسیان لەو پێغەمبەرە نازدارە کردووە. ئینجا وەك چۆن لەنێویشیاندا چەندین پەروانەی دەوری ئەو مەشخەڵەی تێدایە. ئاوەها، ئەو شەمشەمەکوێرانەشی تێدایە کە چاویان بە ڕووناکی هەڵنایەت. بەڵام ئەوەی جێی تێڕامانە ئەوەیە کە تەواوی ئەم مرۆڤانە، بە جیاوازی بیر و بۆچوون و تەنانەت ئایینیشیانەوە، لە خاڵێکدا یەکیان گرتووەتەوە. ئەو خاڵەش، خاڵی تەسدیق و داننانە بە عیففەت و عیصمەتی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

لە ڕوویەکەوە ئێمەش پەروانەی ئەو مەشخەڵی نوورەین. ئەوەتا چی قسە و گوفتارمان هەیە، هەمووی‌مان کردووەتە باڵاگەردانی عیففەت و عیصمەتی ئەو سەروەرە و هەر بە دەوری ئەو تەوەرەیەدا دەیهێنین و دەیبەین. واش نەزانن ئەمە قەدرشوناسی و پێزانینی ئەو پێغەمبەرە پێشەوایەیە، بەڵکو هاوشێوەی ماف و واجب و ستایشی گشتی، تێگەیشتن و تێگەیاندنی جەبرییە. لێرەدا شتێك هەیە بێ دانپیانان و بیرخستنەوەی پێم خۆش نییە بەسەریدا تێ بپەڕم: خوێنەرانی هێژای ئەم دێڕانە، نەکەن لە دوتوێی دەربڕینەکانی مندا بەدووی ئەو زاتە و عیففەتەکەیدا بگەڕێن! با چاوساغ و ڕابەری ڕاستەقینەتان لەم بابەتەدا؛ سەرچاوەکانی سەلەفی صالح و ویژدانە پاك و بێگەرد و سازگارەکانی ئەوان بێت. ئەو ویژدانەی کە هەمیشە حەق تەعالای تێدا دەبینرێت. ئەو نوێنەرە هەرە پاکیزەیەی حەقیش، مەگەر تەنها لەڕێی ئەم ویژدانانەوە بناسرێت.

هاودەم لەگەڵ ناخ و دەروونمان، ویژدانەکانیشمان تەختی ئەبەدیی ئەوینی ئەون. ئەوە چ تەختێکی پایەبەرزی قەدر بڵندە وا بووەتە سەرەوتگای سوڵتانی پێغەمبەران (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ). ئیدی ئێرە ئەو شوێنەیە کە تیایدا گوفتار بۆ من دەبێتە تاڵی بەم[1] و ئاوازی نەسرەوتی ڕۆژانێك.. شتانێك لە ناخمدا دەژەنێت. چ

[1] ئەو تاڵەی تار و عود و ئامێرە مۆسیقییە ژێدارەکانی ترە کە ئاوازی پڕ و درشت و ئەستوور

بکەم بەدەست خۆم نییە، هەرکات ئەم تاڵە ڕیشەی دەردمەندیی بەردەکەوێت، زارم بە چریکەی ئەم وشانە دەخاتە گۆ:

ئەی نەبی مەعصوم، وەك چۆن چواردە سەدە لەمەوبەر دەرکەوتیت، ئاوا جارێکی تر خۆتمان پیشان بدەوە. وەك چۆن دنیای ڕەشڕەنگی نەفامیت ڕووناك کردەوە، ئاواش سەرێك لەم مەملەکەتەی ئێمە بدە.. بەڵێ، سەرێك بدە و شەوگاری نووتەکە چاوی ئێمەش پرشنگ ڕێزان بکە. چی دەبێ، ئەسپەکەت تاوبدە و ڕوویەك لەم وڵاتەی ئێمەش بکە. بڕوا بکە سوارچاکانی تازە پێگەیشتووی ڕووناکی، چیدی تەنها جێت ناهێڵن. تاکە بزەیەکی تۆ، تەنها ئاماژەیەك لە تۆوە، بەسە بۆ ئەوەی سەر و ماڵیان بخەنە مشتیانەوە و بیدەن بەدەم باوە.

## ١. بەشێك لە بەئاگاهێنانەوەکانی قورئان تایبەت بە سەروەرمان

لە قورئانی پیرۆزدا هەندێك بەئاگاهێنانەوە هەیە کە ڕاستەوخۆ ڕوویان لە پێغەمبەری خوایە (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ). ئەم بەئاگاهێنانەوانە، لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەون کە سازگاریی مەعصومیەت و بێگوناهیی ئەو سەروەرە بشێوێنن. دووریش نییە هەندێ کەس وا بیربکەنەوە و بڵێن: "باشە ئەگەر هەڵەیەك لە ئارادا نەبێت، ئیتر چ پێویست بە ئاگادارکردنەوە دەکات؟!" ئەمە لە کاتێکدا وەك چەندین جاری تریش دووپاتمان کردووەتەوە، ئەم ئاگادارکردنەوانە هەرگیز دەرەنجامی گوناه و هەڵە نەبوون، بەڵکو لەوانەیە پێغەمبەری خوا لە هەندێ لە ئیجتیهادەکانیدا لە کاتێکدا جوانترین و چاکترین وەستابێت، ئەو چوویێت جوان و چاکی هەڵبژاردبێت. ئەمەش بە هاوشانی کەسێکی وەك ئەو نەبینرابێت کە هەمیشە نمایندەی جوانترین و چاکترینە، بۆیە هۆشیاری دراوەتێ و وەبیری هێنراوەتەوە.

---

دەردەکات.

ئەمە هەروەك ئاگاداركردنەوەی ئێمە وایە كاتێك دەستبەرداری ئاوی كانیاو دەبین و بە ئیجتیهادی خۆمان دەچین ئاوێك بەكاردێنین كە بەو ئەندازەیە پاك و سازگار نییە. بەڵێ، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ السَّلَام) دەكرێ لەسەر ئەوە ئاگادار كردنەوەیان بدرێتێ كە تا ئاوی كەوسەر وەستابێت، دروست نییە ئاوی زەمزەم بخۆنەوە. ئێمەومانان ئەگەر پێمان بخزێت و پەنا بە خوا بەرەو كەندەڵانی دۆزەخ تل ببینەوە، سەرزەنشت دەكرێین. كەچی ئەوان، ڕەنگە هەمان ئەو سەرزەنشتەی ئێمەیان لەبەر جێگۆڕكەیەك ئاراستە بكرێت لەو كاتەدا كە لە ئاسمانەكاندا لە پەروازدان. لەبەر ئەوە، بە هیچ شێوەیەك دروست نییە پێغەمبەران بەگوێرەی دنیای خۆمان هەڵبسەنگێنین و بەو شێوەیە بڕیاریان لەسەر بدەین. پێغەمبەرانێك كە لە كۆشكدا پێشوازییان لێكراوە و شەرەفمەندی حوزوور بوون. ئیتر چۆن دەكرێ ئەمانە و، كەسانێك كە لە دەرەوە ماونەتەوە، بگرە هەر نەیانتوانیوە نزیك دەروازەی باخچەی كۆشكەكەش ببنەوە، بە یەكچاو تەماشا بكرێن و لە هەمان تادا كێشانەیان بكرێت. ئەوەی دەرەوە تەنانەت زەردەخەنەكەشی سەدەقەیە. كەچی لەوانەیە زەردەخەنەی ئەوەی وا لە حوزووردا بە نادروست دابنرێت. بەڵێ پێوەر و تەرازووەكان تەواو جیاوازن. بۆیە وا پێویست دەكات لەو ڕوانگەیەوە بڕوانینە ئەو بەئاگاهێنانەوانەی كە قورئانی پیرۆز ئاراستەی پێغەمبەری خوای كردوون.

باشە ئەی ئەو ئاگاداركردنەوانە چین؟ بۆچی ئاراستەی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) كراون؟ ئێستاش با پێكەوە بچینە خزمەت دانە بە دانەی ئەم لایەنانە و، لە هەر یەكێكیشیاندا ڕووی گەشی ئاوڕدانەوەی پەرستایشی ژێر ڕووخساری ئەو گوفتارە ڕەنگ ئاگادارییانە و، پاداشت و فەزیلەتی ئەو كردەوانە بەچاوی خۆمان ببینین كە وەك گوناه دێنە پێش چاو. ئینجا لە كۆتاییشدا ڕوو بەو نازدارە بڵێین: "لە عیصمەت و عیففەتیشدا بێ هاوتایت و وێنەت نییە." و ئەمجارەشیان لە ڕوانگەی عیصمەتەوە جاڕی پێغەمبەرایەتییەكەی بدەین بە گوێی هەموو جیهاندا.

## ٢. ئاگاداركردنەوەكانى قورئان و ڕازى پشت پەردە

## دیلەكانى بەدر

ئەم ئایەتەی كە بە بۆنەی دیلەكانی جەنگی بەدرەوە دابەزیوە، وەك ئاگاداركردنەوەیەك دەردەكەوێت بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) . ئایەتەكە دەفەرموێت:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ۞ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۞ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (الأنفال : ٦٧-٦٩)

"بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە دیلی هەبێت، تا ئەو كاتەی بەتەواوی پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا. ئێوە (ئەی ئیمانداران، بە دەستدانە كۆكردنەوەی غەنیمەت بەرلەوەی پشتی دوژمن بشكێنن و، دەستگیركردنی دیل لەپێناو فیدیەدا) ماڵ و شمەكی كاتیی دنیاتان دەوێ، لەكاتێكدا خوای گەورە دەیەوێت ئاخیرەت بەدەست بهێنن (كە هەتاهەتاییە بۆتان). خوای گەورە عەزیز (باڵادەستە بەسەر هەموو شتێكدا) و حەكیمە (خاوەنی دانستی ڕەهایە لە هەموو حوكم و كاروبارە ڕەببانییەكانیدا). خۆ ئەگەر پێشتر لە لایەن خوای گەورەوە حوكمێك نەدرابایە، ئەوا لەسەر ئەو شتانەی وەرتان گرتن، بێ هیچ گومانێك سزایەكی گەورەتان بەردەكەوت. (بەڵام لەبەر ئەوەی حوكمێكی وا دراوە) كەوابوو بخۆن لەو شتانەی دەستان كەوتووە، بە چاكی و بە حەڵاڵی. لە خوا بترسن. بەڕاستی ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە."

پێغەمبەر نابێت دیلی هەبێت. پێغەمبەرانی پێشووش نەیان بووە. جا مادەم خاوەن دیل نەبووە، دەی كەواتە چی لەو دیلانە بكردایە؟

هەتا ئەو کاتەی پێغەمبەر پێی لە زەوی جێگیر دەکرد و لەسەر پێی خۆی ڕادەوەستا و بێ کۆمەکی و پشتیوانی کەس لەڕووی بیر و بانگەوازەوە خۆی دەسەلماند و گوزارشتی لەخۆی دەکرد، نەدەبوو کارێکی وا بکات. واتە؛ با لەبەرامبەر فیدیەشدا بووایە، نەدەبوو دیلەکانی ئازاد بکردایە. بەڵکو دەتوانرا ئەمە بکرێتە هۆکارێك بۆ هەستانەوەی موسوڵمانان و خێراکردنی گەیشتنیان بە پێگەی شایستە لەنێو هاوسەنگیەکاندا و ڕێخۆشکردنێك بۆ بوونە هێزێکی کارای ناوچەکە.. جا خۆ خواستی سروشتە ناوازەکەی تۆش هەر بەم ئاڕاستەیە بوو. چونکە تاقە خولیا و سەوداسەری تۆ لەم دنیایەدا، بەرپاکردنی دین و دینداری بوو. هەست و بیری هاوەڵانیشت هەر ئەمەیە. بەڵێ، ڕەفتارێك لە ئارادایە؛ قسە لەسەر ئەوەیە کە دەکرا ئەم ڕەفتارە باشتریش بێت. واتە ئەگەر ئەو کارەی ئێوە پێی هەستان "حسن"، واتە باش بێت، ئەوا بزانە کە "أحسن"، واتە باشتریش هەیە. دەی خوای گەورەش (جَلَّ جَلَالُهُ) ئەوەی دەوێت.

خۆ ئەگەر نوسراوێکی پێشینە، یان حوکمێك سەبارەت بەوەی کە سەرزەنشتتان ناکەم، یاخود چەسپاندنێکی قەدەریی تایبەت بەوەی کە لەسەر ئەو کردەوەیەیان سزایان نادەم، نەبووایە؛ ئەوا لەوانەبوو سزایەك بەرۆکی بگرتنایە. بەڵام لەبەر نەبوونی وەها نووسراو و حوکم و چەسپاندنێك، ئیدی شتێك لە گۆڕێدا نییە ناوی سزا بێت.

بە تێکشکاندنی دوژمن لە بەدردا، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) ئاوێکی فێنکی کرد بەسەر دڵ و دەروونی باوەڕداراندا. ئەمە وەك بڵێی بەس بوو بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە پانزە ساڵییەی کە گڕی لە ناخیان بەردابوو. چونکە لە ماوەی ئەو پانزە ساڵەدا، ستەم و ئازار و تاڵییەك نەما بە دەست بێباوەڕانەوە نەیچێژن. پێش هەموو شتێك لەو مەککەیەی کە هێندەی گیانی خۆیان خۆشیان دەویست، شاربەدەر کرابوون، ئیتر ئەوانیش پەنایان بردبووە بەر مەدینە. کەچی دڵی

موشریکانی مەککە بەوەش ئاوی نەخواردبووەوە و لە نیشتیمانە تازەکەشیان هەر بەرۆکیان بەرنەدەدان. لەولاشەوە باوەڕداران دانیان بەخۆیاندا دەگرت و بەرپەرچیان نەدەدانەوە. هەتاوەکو جەنگی بەدریش، بێباوەڕان هەرچیەکیان بەرامبەر موسوڵمانان بکردایە، قەدەغە بوو موسوڵمانان بەرپەرچی کردارییان بدەنەوە.

بەرامبەر جوێن فرۆش و شەڕ ورووژێن،

گەرەکە دەست و زوبانێ نەبزوێن

بەرامبەر دڵ ڕەنجێن و هەست ڕووشێن،

گەرەکە سینەییێ ساف و بژوێن

ئەمەیان کردبووە دروشمیان و لە چوارچێوەی ئەم پێوەرەدا هەڵسوکەوتیان دەکرد.

دەی ئیتر وا ئێستا خوای باڵادەست مۆڵەتی داون.[1] موسوڵمانانیش دەیانتوانی لەمەودوا بە هێز وەڵامیان بدەنەوە.. هەر هیچ نەبێ دەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن. بەدر یەکەم ڕووبەڕووبوونەوە بوو. لەم جەنگەدا موسوڵمانان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و چەندین جەنگاوەریشیان لە دوژمن بەدیل گرت. لە هەمان کاتدا، ئەمە یەکەم جار بوو کە ڕووداوێکی لەو جۆرە ڕوویدات. بۆیە بەوێنەی سەرجەم ئەو بابەتانەی کە وەحی ڕوونکردنەوەی لەبارەیانەوە نەدابوو، پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) لەسەر نەریتی خۆی، سەبارەت بەم بابەتە ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد. بڕیاری ڕاوێژیش دیاری دەکرد چی لە دیلەکان بکرێت.

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانرێت کە پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِالصَّلَاةُوَالسَّلَامُ) بە حوکمی حاڵەتی ڕۆحی خۆی و ئەو ڕەوشتە موحەممەدییەی کە قورئانی پیرۆز فێری

---

١ بڕوانە: سورەتی الحج، ئایەتی ٣٩.

کردبوو، لایەنگری ئەوەبوو کە لە دیلەکان خۆشبن. چونکە تا ئەو کاتە قورئانی پیرۆز هەر پێی فەرمووبوو:

﴿ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴾ (الحجر : ٨٥) "دەی ئێستاکە چاوپۆشی بکە و لێبوردەیی بنوێنە." هەروەها: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ ﴾ (النحل : ١٢٥) "بە حیکمەت و ئامۆژگاری جوان بانگەواز بۆ ڕێبازی پەروەردگارت بکە." و بەرەو ئەم ڕێیە ئاراستەی کردبوو.

لێبووردەیی لە پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بووبووە بەشێك لە کەسایەتییەکەی و سروشتی ڕەنگدار کردبوو. بەجۆرێکی وا، کە هەرگیز ناکرێت بەبێ ئەم هەستە بیر لەو پێشەوا نازدارە بکەینەوە. ئاخر چۆن شتی وا دەبێت لە کاتێکدا قورئان ستایشی دەکرد و پێی دەفەرموو: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ (القلم : ٤) "تۆ لەسەر بەرزترین و بڵندترین ئەخلاق و خووڕەوشتی." هەر کەسەو پشکێکی دیاریکراوی هەیە لە ڕەوشت. کەچی ئەو، میراتگری ڕەوشتی هەمەکی (الأخلاق الكلية)یە. ئاخر چونکە ئەو سەروەرە لە ترۆپکی ڕەوشتاوی بووندایە بە ڕەوشتی پەروەردگار. ئەو ڕەوشتەی کە لە هەناوی دێڕ و لاپەڕە و سورەتەکانی قورئانەوە هەڵقوڵاوە. نموونەی بەرچاو و زیندووش کە لە هەموو ڕوویەکەوە بەرجەستەکاری وەها ئەخلاق و ڕەوشتێك بێت، حەزرەتی موحەممەدە (لێزمەی صەلات و سەلام و ڕەحمەتی پەروەردگاری بەسەردا ببارێت).[1] جا با یاران جەم بن و لە چاویلکەی ئەم ڕووداوەی خوارەوەوە تەماشای ڕۆحیەتی لێخۆشبوون و لێبووردەیی ئەو ئازیزە بکەن: لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا، ئەو کەسانەی کە تا ئەو ڕۆژە جگە لە زمانی ئازار و ئەشکەنجە و خوێنڕشتن بەهیچ زوبانێکی تر لەگەڵی نەدوابوون، ئەم هات و لە کاسەی کەسایەتییە میهرەبانەکەیدا شەربەتاوی لێخۆشبوونی بەدەمەوە کردن و پێی فەرموون: ﴿ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ ﴾

١ مسلم، مسافرين ١٣٩؛ أبو داود، تطوع ٢٦.

(یوسف : ٩٢) "ئەمڕۆ ئیتر سەرزەنشتتان لەسەر نییە." بە دواشیدا لێبووردنی گشتی بۆ ڕاگەیاندن.[1]

باری ڕۆحی و بۆچوونی خۆی بەردەوام لەگەڵ لێبووردندا بوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕاوێژ لەسەر بابەتەکە دەکات. سەرەتا ڕاوێژی بە حەزرەتی ئەبوبەکر (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) کرد، ئەویش بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمانە قەوم و قیلە و کەسی خۆتن. ئەگەرچی خراپەیەك نەماوە دەرهەق بە تۆ و موسوڵمانان ئەنجامی نەدەن، بەڵام ئەگەر تۆ ڕێی لێبووردەیی بگریتە بەر و لێیان خۆشبیت و لە گەردنیان نەدەیت و ئازادیان بکەیت، ئەوا دڵیان بەدەست دەهێنیت و دەبیتە هۆکاری هیدایەتیان. ڕای من بە ئاڕاستەی لێخۆشبوونیانە."

ئەمجار پێغەمبەری خوا ڕاوێژ بە حەزرەتی عومەر (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەکات. ئەویش ئەم وەڵامەی دەداتەوە: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دیلانەی ئێستا لەبەردەستماندان، لە گەورە پیاوان و سەرانی مەککەن. ئەگەر ئەمانە بکوژین، ئەوا جارێکی تر کوفر ناتوانێت پشتی ڕاست بکاتەوە و بەرامبەرمان بوەستێتەوە. بۆیە وا دەبینم کە پێویستە بکوژرێن. تەنانەت هەر موسوڵمانەو خزم و نزیکێکی خۆیی بدەرێ با ئەو خۆی بیکوژێت. ئەوە عەقیل، با عەلی (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) بیکوژێت.. ئەوە عەبدوررەحمان، با ئەبوبەکری باوکی (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ) بیکوژێت. فڵانە کەسیش بدە بە من، خزمی خۆمە و خۆم دەیکوژم."[2]

بیر و بۆچوونەکان ڕوون بوونەوە. صدیق لایەنگری ئازادکردنی دیلەکان و فارووقیش لایەنگری کوشتنیان بوو. بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) سەرەتا ڕوو دەکاتە حەزرەتی ئەبوبەکر و پاشانیش حەزرەتی عومەر، ئەوجا دەفەرموێت:

---

١ إبن هشام، السيرة النبوية ٧٤/٥؛ بيهقي، السنن الكبرى ١١٨/٩؛ إبن كثير، البداية والنهاية ٣٠١/٤.

٢ مسلم، جهاد ٥٨؛ أحمد بن حنبل؛ المسند ٣٢/١-٣٣.

وَإِنَّ مَثَلَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ كَمَثَلِ إِبْرَاهِيمَ (عَلَيْهِ السَّلَامُ) قَالَ: فَمَنْ تَبِعَنِي فَإِنَّهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ. وَمَثَلُكَ يَا أَبَا بَكْرٍ كَمَثَلِ عِيسَى (عَلَيْهِ السَّلَامُ) قَالَ: إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ

"ئەی ئەبوبەکر! تۆ ڕێك لە باوەگەورەم، حەزرەتی ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەچیت (ئەوەبوو گەلەکەی هەموو خراپەیەکیان بەرامبەر کرد، تەنانەت خستیشیانە ناو ئاگرەوە. کەچی ئەو دەستەکانی بەرزکردبووەوە و) کەوتبووە پاڕانەوە و دەیفەرموو:

﴿ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (إبراهيم : ٣٦)

'پەروەردگارا هەرکێ شوێن من بکەوێت و گوێڕایەڵیم بکات ئەوە لە منە، هەرکێش لێم یاخی بێت و ڕووم لێ وەرگێڕێت (ئەوا من چی بڵێم) هەرخۆت غەفوور و ڕەحیمیت.'

هەروەها تۆ لە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَامُ)یش دەچیت. (ئەوەبوو گەلەکەی هەموو جۆرە ئازار و ناڕەحەتییەکیان پێ ڕەوا بینی. کەچی ئەو دوعای دەکرد و دەیفەرموو):

﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾

(المائدة : ١١٨)

'پەروەردگارا، ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بەڕاستی ئەوان بەندەی خۆتن. خۆ ئەگەر لێشیان خۆشبیت، ئەوا بەڕاستی هەر خۆت خوایەکی باڵادەست و خاوەن دانستی ڕەهایت.'"[١]

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هەمان ئەم قسانەی دووبارە

١ أحمد بن حنبل، المسند ٣٨٣/١؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٥٩/٧؛ بيهقي، السنن الكبرى ٣٢١/٦.

دەکردەوە و دەیفەرموو: ''لەسەر حەوز دەبینم کۆمەڵە خەڵکانێك کە بەرەو ئەویَ دێن، وەك چۆن وشتران لە ئاو خواردنەوە دەکرێن و وەدەر دەنرێن، ئاوا ئەوانیش وەدەر دەنرێن. منیش دەڵێم: أُصَیْحَابِي أُصَیْحَابِي 'هاوەڵانم، هاوەڵانم!' و لە خودا دەپاڕێمەوە. ئەو کات پێم دەوترێت: لَا تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ 'تۆ نازانی ئەمانە پاش تۆ چیان کردووە.' ئیتر منیش چی بڵێم، وەك بەندەی صاڵح، عیسا (عَلَیْهِ السَّلَامُ) دەڵێم: 'ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بەڕاستی ئەوان بەندەی خۆتن، خۆ ئەگەر لێشیان خۆشبیت، ئەوە بەڕاستی هەر خۆت غەفور و ڕەحیمیت.'''[1]

حەزرەتی ئەبوبەکر یەکەمین شاگردی پێغەمبەر خوایە. بیروڕا و پێکهاتەی ڕێك وەکو پێغەمبەری خوایە. ئەم لەیەکچوونە ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەتا لە بڕیارەکانیشیدا هەستی پێدەکرێت.

پاشان پێغەمبەری خوا ڕوو دەکاتە حەزرەتی عومەر و بە دوو پێغەمبەرە ئولولعەزمەکەی تری دەچوێنێت: وَإِنَّ مَثَلَكَ يَا عُمَرُ كَمَثَلِ نُوحٍ قَالَ: رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً ''ئەی عومەر! تۆش وەکو نوح (عَلَیْهِ السَّلَامُ) وایت، کە فەرمووبووی:

﴿ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ (نوح : ٢٦)

'پەروەردگارا هیچ کەس لە بێباوەڕان لەسەر زەویدا مەهێڵە.'

لەهەمان کاتدا لە موسا (عَلَیْهِ السَّلَامُ)یش دەچیت، ئەوەبوو ئەویش فەرمووبووی:

﴿ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾ (یونس : ٨٨)

'پەروەردگارا، سەروەت و سامانی فیرعەون و دارودەستەکەی تەفروتونا

---

[1] بخاري، تفسیر (٥) ١٤؛ مسلم، طهارة ٣٧، فضائل ٤٠.

بکە و کوێری بکەرەوە، دڵیان بگوشە، چونکە ئەوانە تاوەکو سزای بەئێش و ئازار نەبینن ئیمان ناهێنن.''[1]

جێی باسە ئەم دوو پێغەمبەرە هەردووکیان لە بەرامبەر چەندین ئازار و ئەشکەنجەی هۆز و نەتەوە و دوژمنانی تری خوادا تا توانیبوویان ئارامیان گرتبوو. بەڵام کاتێك بۆیان دەرکەوتبوو کەوا سەرسەختی و مل نەدانیان ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبێ و سنوورێك بۆ چەوساندنەوە و زوڵم و زۆریان نییە، ئیتر ئەوانیش بەو شێوازەی کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، کەوتبوونە پاڕانەوە لە خوای گەورە. ئەو دوو نوێنەرە مەزنەی کە هەوێنیان لەگەڵ سروە جەلالییەکاندا شێلرابوو و، بۆ دوو دەستەی سەرگەردانی وا ڕەوانە کرابوون کە شایستەی تەجەللی جەلالی بوون، ئەگەر بەو نیازەوە دوعایان کردبێت کە خوای گەورە باوکانی کوفر کە جگە لە زیان بۆ زیندووان و مردووان کەڵکی دییان نەمابوو، لەناو بەرێت و بێ باوکە کوفرزەدە جێماوەکانی پاش خۆشیان لە سایەی چاودێری دینی خوادا پێ بگەیەنن، ئەوا کارێکی گەلێك خێرداریان کردووە. هەر بۆیە وەك جێبەجێ کردنێك بۆ ئەو بڕیاری "قەهر"ە کە هەر لە ئەزەلدا فەرمووبووی، خوای گەورە لە "لایزال"دا بە دوعا و خواستی پێغەمبەرێك ئەو مردووانەی لەناو برد کە لە ڕێی تەقدیر و شایستەبوونەوە لەناوی دەبردن.

لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بە نەرمونیانی و لێبووردەیی خۆی کە لە سروشتی ڕەفتار و کانگای ڕەوشتە بەرزەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، بڕیاری دا. ئەمە لە هەمان کاتدا واتای بڕیاردان بوو بە ئاڕاستەی بۆچوونەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر. ئەوە بڕیار درا کە: ''با نەیانکوژین، سا بەڵکو ئیسلام بناسن و بە ژیانی ڕاستەقینە شاد ببن.''

[1] أحمد بن حنبل، المسند ٣٨٣/١؛ إبن أبي شيبة، المصنف ٣٥٩/٧؛ بيهقي، السنن الكبرى ٣٢١/٦.

ئێستاش با پاشماوەی بەسەرهاتەکە لە حەزرەتی عومەرەوە ببیستین: ''لە کۆتاییدا بڕیار درا. ئەوە بوو من بە ئیشێك ئەوێم جێهێشت. ڕۆژی دواتر کە چوومەوە، چی ببینم؟ دەبینم پێغەمبەری خوا و ئەبوبەکر بەکوڵ دەگرین. خۆم پێ نەگیرا و پرسیم: 'لەبەر چی دەگرین؟' لەوەدا نەبوون وەڵامم بدەنەوە. تا دەهات زیاتر دەگریان. منیش پێداگریم کرد و وتم: 'ئاخر ئەگەر شتێك هەیە با منیش لەگەڵتان بگریم.' ئەوجا ئایەتی ٦٧ و ٦٨ و ٦٩ی سورەتی "الأنفال"یان بۆ خوێندمەوە.

جا ئیتر ئەو ئایەتە بەئاگاهێنەرەوانەی کە وەك گلەیی و سەرزەنشت دەبینران، بەم بۆنەیەوە دابەزیبوون..[1] لە ڕاستیدا خوای گەورە توانست و بەهرەی ئیجتیهاد کردنی پێ بەخشیبوو. ئەویش لە لایەن خۆیەوە ئیجتیهادی کردبوو و "جوان و چاك"ی پێکابوو. بەڵام خوای میهرەبان "جوان و چاك"ی بە شیاوی ئەو "جوانترین و چاکترین" بەندەیەی خۆی نەدەبینی و وەك بڵێی پێی دەفەرموو: ''ئەوەی شایان و شیاوی تۆ بوو؛ بەدەستهێنانی "جوانترین و چاکترین" بوو.'' جا لەبەر ئەوەی دڵی چووبوو بەلای "جوان و چاك"دا نەك "جوانترین و چاکترین"، بۆیە پەروەردگاری هۆشیاریی دەدایێ. دەنا شتێك نەبوو ناوی هەڵە یان گوناه بێت. چونکە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) بەردەوام بەنێو جوان و چاکەکاندا دەهات و دەچوو.

بەڵێ، سەرەتا پێویستە ئاوا لە مەسەلەکە تێبگەین. ئەوجا دواتر سەرنجی شێوازی دەربڕینی ناو ئایەتەکە بدەین تاوەکو بۆمان ڕوون ببێتەوە کە دەربڕینەکان چەندە دەم بەخەندە و شیرین گوفتار و نەرمونیانن لەبەرامبەر ئەو نازدارەدا.

ئەمەش پەیامی ئاگادارییە نەرمونیانەکەیە: ﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ (الأنفال : ٦٨) ''ئەگەر لە تۆمارێکی قەدەریدا وەها

١ مسلم، جهاد ٥٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٣١-٣٣.

بەڕێوەچوونی ئەم کارە و سوود وەرگرتنی ئێوە لەو غەنیمەتانەی بەدەستی دێنن نەنووسرایە، ئەوا سزایەکی سەخت بەرۆکی دەگرتن.“

لە زمانی عەرەبیدا دەستەواژەی "لَوْلَا" بە واتای: اِمتناعُ الشَّيءِ لوجُودِ غَيرِهِ ”نەبوونی شتێك بەهۆی بوونی شتێکی ترەوە.“ دێت. پێویستە لێرەدا بەوردی سەرنج لە واتای ئایەتەکە بدەین. مەبەست لە ”ئەگەر نوسراوێکی پێشینە نەبووایە“ ئەوەیە کە لە ئەزەلدا ئەم حوکمە دراوە. بەگوێرەی ئەم حوکمە؛ غەنیمەت بەدەست دەهێنن و سوودیشی لێ وەردەگرن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وەها حوکمێك کە لە ئەزەلدا بڕیاری لەسەر دراوە، لە "لایزال"دا بوونێکی دەرەکی (وجوودی خاریجی)[1] کراوە بەبەردا و هاتووەتە بوونەوە.

کەوابێ، خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) غەنیمەت و دیلەکانی -دیلیش بە غەنیمەت دادەنرێت- لە پاش ئەو ئیجتیهادەش حەرام نەدەکرد. بەڵام هەموو شتەکان لەسەر هێڵی تاقیکردنەوەیەك ڕێیان دەکرد. وەك لە مەسەلەکەی حەزرەتی ئادەمدا ڕوویدا، ڕووداوێك کە پاشتر ڕوویدەدا، بەر لە وەختی خۆی هێنرابووە پێش و بە ڕەچاوکردنی ئەو وەرزە، لە بری باشترین، باش ئەنجام درابوو. واتە دوا بەدوای جەنگی بەدر ئەمە خۆی هەروا دەبوو. پێم وایە حوکمی ناو ئەم ئایەتەش پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکات:

﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾ (محمد : ٤)

---

[1] بوونی دەرەکی: هەموو بەدیهێنراوان سەرەتا لە بازنەی زانستی خوای گەورەدان. واتە بوونێکی زانستی‌یان هەیە. بەڵام کاتێك توانست پەیوەندییان پێوە دەکات، لە جیهانی پەنهان (عالم الغيب)ەوە، دێنە جیهانی بینراو (عالم الشهادة) و بوونێکی دەرەکییان لەبەر دەکرێت.

"کاتێك ڕووبەڕووی کافران دەبنەوە لە جەنگدا، بێنە دەست لێیان و لە گەردنیان بدەن. جا کە لە کۆتاییدا سەرکەوتن بەسەریاندا، بە دیل بیانگرن. کاتێکیش جەنگ تەواو دەبێت، یان بێ بەرامبەر و هەروا، یاخود لە بەرامبەر فیدیەدا ئازادیان بکەن. خۆ ئەگەر خوای گەورە بیویستایە، ئەوا دەیتوانی بە جۆرێکی دیکەش تۆڵەیان لێ بکاتەوە. جا کە ئەمە وایە، لەبەر ئەوەیە کە هەندێکتان بە هەندێکی ترتان تاقی بکاتەوە. خوای گەورە هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەوانە بە زایە نادات کە لە پێناو خوادا کوژراون." هەر دەڵێی سەروەرمان لەو ساتەوەختەدا هەستی بەم حوکمە کردووە کە خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) دواتر پێی ڕادەگەیاند. بەڵام لەبەر ئەوەی ڕاگەیاندنی ئەم حوکمە دواتر بوو، بۆیە پێشخستن و هێنانەپێشی کارێکی باش و، چاوەڕێ کردنیشی باشترین بوو.

لە لایەکی ترەوە، کاتێك سەروەرمان باسی ئەو پێنج شتەمان بۆ دەکات کە نەدراون بە هیچ کەسێکی دیکە و تەنها تایبەت بە خۆی کراون، باس لە حەڵاڵ کردنی غەنیمەتیش دەکات.[1] ئەو غەنیمەتەی کە تا جەنگی بەدر حەڵاڵ نەبوو و بۆ پێغەمبەرانی پێشوویش بە حەڵاڵ دانەدەنرا، ئەو ڕۆژە بۆ موسوڵمانان دەبوو بە حەڵاڵ. جا ئیتر ڕێك لە عەرەفەی ئەم کارەدا، ئاگادارکردنەوەیەکی وا هات بۆ پێغەمبەرمان، کە لە ڕووکەشدا وەك سەرزەنشت و گلەیی دەردەکەوت. لەپاڵ ئەم لایەنەدا، لایەنێکی تریش کە جێی تێڕامانە؛ هاتنی حوکمەکەیە لەسەر شێوەی ئیجتیهادەکەی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). لە بڕیارێکی وادا کە چ پێکان و چ نەپێکانیشی هەر خێرە و خولگەی پاداشتە، خۆ نەدەکرا پێغەمبەری خوا کە بە ڕەوشتی خوایی پێگەیشتبوو و ڕاستەوخۆ لە لایەن خوای گەورە خۆیەوە پەروەردە کرابوو، بە جۆرێکی تر بڕیار بدات.. بەڵێ نەدەکرا، ئاخر چونکە میلی ڕەوشتی گشتی ئەو، هەمیشە ئەو خاڵەی پیشان دەدا کە ئیجتیهادی تێدا کردووە. جا ئیتر

---

١ بخاري، تيمم ١، صلاة؛ مسلم، مساجد ٣.

ئەوەبوو ئەو حوکمەش کە دواتر هات، هەر لەسەر شێوەی ئیجتیهادەکەی ئەو هات.

جێی باسە کە حەڵاڵ بوونی غەنیمەت لە ڕێگەی دەقە ئاینییەکانەوە جێگیر و چەسپاوە. لە هەمان کاتیشدا نابێتە ڕێگر لەبەردەم ئیخلاس و گیانی خۆیەکلایی کردنەوە و، ئەوەیش کە جیهاد لە پێناوی خوادایە. جا ئەگەر پاش بەرەنگاربوونەوەی دوژمن و دەستەویەخە جەنگان لەگەڵیدا، دەستگرتن بەسەر ماڵ و داراییەکانیاندا، دوژمن لاواز و موسوڵمانانیش بەهێز و مەچەك ئەستوور بکات، ئیتر بۆچی ببێتە ڕێگر؟! ئەمە جگە لەوەی بەدەستهێنانی غەنیمەت، ڕوویەکی هاندەر و شەوق بزوێنیشی هەیە بۆ ئەوانەی کە وا نەگەیشتوونەتە پلەیەکی تەواو لە ئیخلاسدا. بە جۆرێك، ئەوانەی بەردەوام لە تێکۆشاندان و موجاهەدە دەکەن، دەتوانن لەم ڕێیەوە بژێوی ژیانی خۆیان دەستەبەر بکەن، بەو مەرجەی نەیکەنە ئامانج و مەبەستیان. ئەوەش هەیە کە هیچ کەس زۆری لێ ناکرێت بۆ وەرگرتنی غەنیمەت. کێ پێی خۆشە دەتوانێت وەك عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) بکات و بڵێت: "خۆ من لەپێناو بەدەستهێنانی غەنیمەتدا موسوڵمان نەبووم."[١] ئەوەندە هەیە کە ناکرێت وەها خۆبەخشی و فیداکارییەك لە هەموو کەس چاوەڕێ بکرێت. بیرمان نەچێت، فیداکاری داوا ناکرێت، بەڵکو ئەنجام دەدرێت.

لەگەڵ دانانی خاڵی کۆتایی ئەم باسەدا، پێم خۆشە جارێکی تر لایەنێکتان وەبیر بێنمەوە کە لە بابەتی دەستبردنی حەزرەتی ئادەم (عليه السلام) بۆ میوە قەدەغەکراوەکەدا عەرزم کردبوون: چۆن خوای گەورە لەڕێی ئەو میوە قەدەغەکراوەی کە دواتر هەر موباحی دەکرد، حەزرەتی ئادەمی تاقی کردەوە، وای بۆ دەچم کە لەم بابەتی غەنیمەتەشدا هەمان شت لە ئارادا بێت. ئەو غەنیمەتەی کە لە داهاتوودا موباح دەبوو، ڕاستەوخۆ دوای جەنگی بەدر، بوو بە هۆکاری تاقیکردنەوە. ئینجا دواتر حوکمە سەرەکییەکانی تایبەت بەم بابەتە ڕاگەیەنران. دیسانەوە لێرەشدا شتێك

١ أحمد بن حنبل، المسند ١٩٧/٤.

نییه ناوی گوناه بێت. چونکه هەر هەنگاوێك کە نراوە، هەر کارێك کە کراوە، لە بنەڕەتدا پڕ بە پێستی حوکمەکە بووە. تەنها ئەوەندە هەیە کە سەرنج بۆ لای ئەو حەزەی نێو سروشتی مرۆڤ ڕاکێشراوە کە بۆ ماڵی دنیا هەیەتی و، داوا کراوە دەرفەتی نەدرێ پێی لێ ڕابکێشێت و لە سنووری خۆی دەربچێت.

بێگومان ئەم وانە و بەئاگاهێنانەوەیە ڕووی لە تەواوی موسوڵمانانە. کاتێکیش دێینە سەر باسی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ)، ئەوا نە لەپێش ئەوە و نە لەپاش ئەوەش تۆزقاڵێك مەیلی بەلای دنیادا نەبووە. ئاگادارکردنەوەکە لە کەسایەتی پێغەمبەری خوادا کە مەیلی دنیای تێدا نییە، ئاراستەی هەموو لایەك کراوە. تاوەکو هەم پەندی لێ وەربگرن، هەم دڵیشیان نەڕەنجێت. دواجار دەشتوانین لێرەدا چەندین ئاماژە و سەرەداوی گرنگ بەدەست بهێنین سەبارەت بە ڕادەی ئەو هەستیارییەی کە لە شێوازی پەروەردەی ئیلاهیدا بەرامبەر بە دوێنراو دەنوێنرێت.

## ڕووداوی تەبووك

تەبووك مەشقێکی سەربازییە لە بەرگی جەنگدا و هەڵمەتێکی دەستپێشخەرانەی سەرکوتکردنی ڕۆمەکانە کە موسوڵمانان ئامادەکارییەکی جەنگیی نائاساییان بۆ کرد، بەڵام بێ ئەوەی جەنگ ڕوو بدات، گەڕانەوە. لە ڕاستیدا موسوڵمانان بەو نیازەوە کەوتنەڕێ کە ڕووبەڕووی جەنگێکی سەخت ببنەوە. بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەئاشکرا موسوڵمانانی بۆ جیهاد بانگ کرد و لەنێو ئامادەسازییەکی گشتی جەنگیدا بەڕێکەوتن. بەڵام لەم نێوەندەدا هەندێ کەس هاتن پۆزشیان هێنایەوە و مۆڵەتیان لە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خواست. ئەویش مۆڵەتی دان. ئەمانیش لەبەر ئەوەی مۆڵەتیان پێ درابوو، لە جەنگەکەدا بەشدارییان نەدەکرد. جا ئیدی، ئەو دووەم ئایەتەش کە لە ڕواڵەتدا ماهییەتێکی

ئاگاداركەرەوەی بۆ پێغەمبەری خوا لەخۆگرتووە، بەم بۆنەیەوە دابەزیوە. ئایەتەكە بەم جۆرە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەدوێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ (التوبة : ٤٣) "ئەی پێغەمبەری خودا لێبووردە، بۆچی مۆڵەتت پێدان؟ هەتاوەكو ئەوانەت بۆ دەركەوتایە كە ڕاست دەكەن و ڕاستگۆن، درۆزنەكانیشت بناسیایە." ئەگەر بێت و ڕستەی "عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ"ی ناو ئایەتەكە بەو شێوەیە وەربگێڕێت كە بەرامبەرە بە واتای "خودا لێت خۆش بێت"، ئەوا بۆی هەیە ختوورەی ئەنجامدانی گوناهێك بە مێشكی مرۆڤدا بهێنێت. وەها لێكدانەوەیەكیش چەندە ناقۆڵا بێت، ئەوەندەش دوور لە وردبینییە. بە بڕوای ئێمە، وەرگێڕانی ئەو ئایەتە لەسەر شێوەی "دەك لێبووراو بیت" یان "دەك بەهرەمەندی لێبووردن بیت" یاخود وەك ئەوەی لە ڕاڤەی ئایەتەكەدا وتمان "خودا لێبووردە"، ڕەنگە زیاتر لەگەڵ ئەو ووردەكاریی و ستایشكارییەدا بگونجێت كە لە ئایەتەكەدا بەرامبەر پێغەمبەری خوا (عَلَيۡهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ڕەچاو كراوە.

یەكەم: دەستپێكردنی ئایەتەكە بەم ڕستەیە، بە هەموو شێوەیەك دڵدانەوەی پێغەمبەری خوایە لە لایەن خوای گەورەوە. دووەم: ئەو ڕستەیەی وا دەردەكەوێت ئاگاداركەرەوە بێت، جێهێڵراوە بۆ دواتر. ئیتر بەم شێوەیە، بە بانگەوازێك دەستكراوە بە گوفتار، لە هەموو لایەكیەوە دەمی بەگوڵی زەردەخەنە پشكوتووە. بۆیە دەبینین زۆرێك لە موفەسیران و پسپۆڕانی زمانەوانی وا لەم ئایەتە تێگەیشتوون كە ستایش و ڕێزلێنانێك بێت لە لایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيۡهِ).[1]

وەك چۆن باوكێكی پڕ سۆز و بەزەیی، لە ڕوانگەی دەربڕینی سۆز و بەزەییەكەیەوە كاتێك دەیەوێت گوێچكەی ڕۆڵەكەی ڕابكێشێت كە لە گیانی خۆی

---

١ بڕوانە: الرازي، مفاتيح الغيب ١٦/٧٣-٧٤؛ قرطبي، الجامع لأحكام القرءان ٨/ ١٥٤؛ سيد قطب، في ضلال القرءان ٣/١٦٦٢.

خۆشتری دەوێت، دەبینی بە وریاییەوە مامەڵە دەکات بۆ ئەوەی ئازاری گوێچکەی نەدات، تەنانەت بۆ ئەوەی ڕۆڵەکەی وا نەزانێت کە سزایە، زەردەخەنەشی بەڕوودا دەبارێنێت، هەر بەو جۆرە، لێرەشدا لەژێر لێزمەی زەردەخەنەکانی ڕەحمەتدا، ئاوڕدانەوەیەکی پڕ ڕەحمەتی بەڕواڵەت ئاگادارکەرەوەی لەم جۆرە هەست پێدەکرێت. بۆیە دەتوانین بڵێین بەهیچ شێوەیەك لەم دەربڕینەدا هیچ جۆرە سەرزەنشتێك ئاڕاستەی پێغەمبەرمان نەکراوە.

پێدەچێت لە ئایەتەکەدا ویسترابێت ئەم خاڵانە وەبیر سەروەرمان بهێنرێتەوە:

ئەوەی هات، مۆڵەتی وەرگرت و ڕۆیشت. تۆیش هیچت نەوت. دەزانیت کە لەنێو ئەوانەی مۆڵەتیان خواست، کۆمەڵە دووڕوویەکیشی تێدا بوو کە یەکبوونی ڕواڵەت و ناخیان بەدەست نەهێناوە. ڕاستە ئەمانە لە ڕواڵەتدا بە موسڵمان دەبینرێن، بەڵام دەروونیان بووەتە مۆڵگەی هەموو جۆرە فیتنە و خراپەکارییەك. دەی بۆچی مۆڵەتت دان؟ هەتاوەکو دووبارە و چەند بارە (ئەم واتایە لە پێکهاتەی ڕستەکەوە هەڵدەگۆزین کە ڕستەیەکی فیعلی (الجملة الفعلية)یە و نوێ بوونەوە دەگەیەنێت.) ئەو مەردە سەرڕاستانەی کە ڕاستگۆیی و صەداقەتی خۆیانیان بۆ سەلماندوویت، لەو دووڕووانە جیابوویوونایەتەوە کە گوفتاریان درۆ و پەیمانیان تەڵەکە و دەروونیشیان پڕە لە ناپاکی. جا ئیتر ئەو کات تۆیش تەواوی ئەو دووڕووانەت بۆ دەردەکەوت. چونکە هەر خۆت لە دوتووێی وتەکانتدا: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ "دووڕوو کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، کە بەڵێنیشی دا نایباتە سەر، کە شتێکیشی پێ سپێررا ناپاکی تێدا دەکات."[1] چوارچێوەی ئەوانت کێشابوو. دەی ئێستا کاتی ئەوەبوو کە یەکە بە یەکەیان بناسیت. خۆ ئەو هەر دەیزانی ئەو کەسانە کێن. بەڵام لێبووردەیی و نەرمونیانییەکەی تەنها کەمێك ئەمەیان دواخست.

---

١ بخاري، الإيمان ٢٤، شهادات ٢٨، وصايا ٨، لباس ٦٩؛ مسلم، الإيمان ١٠٧-١١٠.

وەك بینیتان، گوفتارەکە تەنها یادخستنەوەی تێدایە و بە هیچ جۆرێك سەرزەنشتی تێدا نییە. نەك هەر سەرزەنشتی تێدا نییە، بەڵکو تەنانەت بەگەورە ڕاگرتن و تەقدیر و ستایشیشی لێ دەخوێنرێتەوە. جێی خۆیەتی ئەو خاڵەش دووپات بکەینەوە کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەڕێی ئەم ئایەتەوە جارێکی دی بۆ لای جوانترین و چاکترین ڕێنموونی دەکرێت. چونکە ئەو نەك لە جوان، بەڵکو لە جوانترین دێت.

زەمەخشەری دەڵێت: "لە جێیەکدا باس لە لێخۆشبوون کرابێت، لەو جێیەدا گوناهیش هەیە."[1] بەڵام فەخرەدینی ڕازی بە هیچ جۆرێك بۆچوونێکی لەم جۆرەی بەلاوە پەسەند نییە و، دەڵێت: "ڕەنگە بۆ کەسانێکی وەك ئێمە لە شوێنێکدا باسی لێخۆشبوون کرابێت، لەو شوێنەدا گوناهیش بوونی هەبێت، بەڵام لێخۆشبوون بۆ پێغەمبەران، تەنها واتای ئاوڕلێدانەوەی میهرەبانی و بەسەرکردنەوەی پەروەردگار دەگەیەنێت."[2] جا مادەم وایە، کەواتە ئەم ئایەتە لەسەرەتاوە تا کۆتایی یەکپارچە ستایش و پێزانینە بۆ پێغەمبەری پێشەوامان (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

هەر وەك لەسەریشەوە ئاماژەمان پێدا، پێغەمبەری سەروەرمان خاوەن فەتانەتی ئەعظەمە. بۆیە زۆر باش دەزانێت چ شتێك چی لێدێت و چ کارێکیش بە چ شێوازێك ئەنجام دەدرێت. بەگوێرەی ئەو فەتانەتە لێرەشدا جێگرەوەیەك خراوەتە بەردەم سەروەرمان. ئەویش ئەوە بوو کە: هەتا ئەو کاتەی بە تەواوی مانا دووڕووەکان لە موسوڵمانەکان جیادەبوونەوە، نەدەبوو مۆڵەت بدرایە.. تاوەکو دووڕووەکان ئەمە نەکەن بە پاساو و وای پیشان بدەن کە مۆڵەتیان وەرگرتووە، ئەوجا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەربچن. چونکە ئەگەر پێغەمبەری خواش مۆڵەتی نەدانایە، ئەوان هەر جیا دەبوونەوە و دەڕۆیشتن، نیتر ئەو کات دووڕوویيەکەیان وەك ڕۆژی ڕووناك بۆ هەموو لایەك دەردەکەوت، بەڵێ، ویستی خوای گەورە بەم ئاڕاستەیە بوو. ئەوەی

---

١ زمخشري، كشاف ٢/١٥٣-١٥٤.

٢ الرازي، مفاتيح الغيب ١٦/٧٣-٧٤.

لە سەرووەریشمان داواکرابوو، هەڵوێستێکی لەم جۆرە بوو. ڕاستە خوای باڵادەست دووڕووەکانی بە خۆشەویستەکەی دەناساند و لە هەموو شتێك ئاگاداری دەکردەوە، بەڵام دەشکرا بەم شێوەیە بناسرێنەوە و لە قافا بگیرێن.

بۆیە لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆزەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم مۆڵەت دانەی هەلێکی لەم جۆرەی لەکیس چووبوو... ئیتر ئەویش بۆ خۆی چین چین لێبووردەیی و لێخۆشبوونی پەخش دەکرد.

لە ڕاستیدا ئەم هەڵسوکەوتە یەکێك بوو لە دەرکەوتەکانی ڕەوشتە گشتییەکەی، کە هەر لەو چاوەڕوان دەکرا و هەر لەویشدا نومایان دەبوو. ئەوەتالە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا کارێکی وای نەکردووە ببێتە مایەی هەڵماڵینی پەردەی سەر ڕووی هیچ کەسێك. هەڵە کەسییەکانی ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی خاوەنەکەی نەکردووە، بەڵکو لەنێو کۆمەڵدا و بەبێ ناوهێنان و بە جۆرە ئاخاوتنێك کە بە لای ئەوانی ترەوە ناڕوون و بە لای ئەو کەسەی هەڵەکەی کردووە ڕوون و ئاشکرا بێت دواوە و لەسەر بنەمای "تەنبیهـ" و "ئیعلام" بارەکەی ڕوون کردووەتەوە. بەڵێ، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) هەردەم بەم شێوەیە ڕەفتاری کردووە و چەندین نموونەی زۆر و زەبەندەش ئەم ڕاستییە وەك ڕۆژی ڕووناك دەسەلمێنن. لە سایەی ئەم شێوازە ناوازەیەشدا هەڵەکە ڕاست دەکرایەوە و خاوەنەکەشی نەدەڕەنجێنرا. ئیتر ئا ئەمە بوو ئاکاری پێغەمبەری سەرووەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). هەرووەك چۆن هەر کەسەو سروشت و کەسایەتییەکەی چۆن بخوازێت ئاوا ڕەفتار دەکات، ئەو سەرووەرەش بەگوێرەی داخوازی ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزەکانی ڕەفتاری دەکرد. هیچ پێغەمبەرێك پەردەی لەسەر هەڵەی بەرامبەرەکەی لانەدەدا و هەرگیز زەمینەسازی نەدەکرد بۆ لەناوچوونی. وێڕای ئەوەی ئاگاداری هەڵە و کەموکورتی بەرامبەرەکەشی بوو، کەچی هەرگیز نەیدەدایەوە بەڕووی خاوەنەکەیدا و بیری لەوە نەدەکردەوە تەریقی بکاتەوە.

بۆ نموونە: ڕەنگە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَامُ) یەکە بە یەکەی دووڕووەکان و ئەو کەسەشی ناسیبێت کە سەرکردایەتی دەکردن. بەڵام هیچ کات ئەم حاڵەتەی ئاشکرا نەکرد. نەك ئاشکرای نەکردن، بگرە هەمان مامەڵەی موسوڵمانانی دیکەی لەگەڵ دەکردن. تەنانەت جارێکیان یەکێك لە دووڕووەکان دێت و پەشیمانی خۆی دەردەبڕێت. ئەم کەسە دووڕوویيەکەی ناخی بەتەواوی سڕابووەوە و بووبووە ئیماندارێکی دڵسۆز. جا پاش ئەوەی ئەم کەسە پەشیمانیی خۆی دەردەبڕێت بە پێغەمبەری خوا دەڵێت: "ئەی پێغەمبەری خوا! چەندین کەسی هاوشێوەی من هەن، ناویانت پێ بڵێم؟" سەرداری هەردوو جیهان لەسەر هەمان بنەمای خۆی وەڵامی دایەوە و فەرمووی: "نەخێر، هەروەك چۆن تۆ هاتیتە لامان و داوای لێخۆشبوونمان بۆ کردیت، بە هەمان شێوە داوای لێ خۆشبوون بۆ ئەوانەش دەکەین کە پاش تۆ دێن، ئەو کەسەشی کە پێداگری لەسەر گوناهەکانی دەکات، حەواڵەی پەروەردگاری دەکەین و پەردەی نێوانمان لەگەڵ کەسدا نادڕین."[١]

بەڵێ، پەردەی نێوانیانی نەدەدڕاند و نەیدەهێنانە حوزووری خۆی تا شەرمەزاریان بکات. عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول دوژمنی سەرسەختی سەروەرمان بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە خۆی بە موسوڵمان پیشان دەدا. پێغەمبەری خواش دەیویست هەمیشە بەو شێوەیە بیبینێت کە پێوەی دەبینرا. تا دواچرکەش هیچ ئومێدی لێ نەبڕی. بەڵام خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) لە هیدایەت بێ بەشی کردبوو و بە دووڕوویی دەمرد. جا کاتێك کەوتە سەر پێخەفی مەرگ، بۆ ئەوەی ئەم تۆمەتی نیفاقە لەسەرخۆی لابدات، کوڕەکەی نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا تا داوای کراسەکەی لێ بکات. مەبەستی ئەوەبوو خەڵکی بڵێن: "خۆ ئەگەر دووڕوو بووایە، ئەوا پێغەمبەری خوا کراسەکەی خۆی نەدەدایە." پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە هەموان باشتر ئەمەی دەزانی. کەچی سەرباری ئەمەش، دیسانەوە

١ طبراني، المجمع الكبير ٥/٤.

پەردەی نێوانیانی نەدڕاند و کراسەکەی داکەند و بۆی نارد. تەنانەت لە نوێژی جەنازەکەشیدا بەشداربوو.[1] چونکە هەم کوڕەکەی و هەم کچەکەشی موسوڵمانی ڕاست و باش بوون. بۆیە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەبەر خاتری ئەوان هەموو بەدڕەفتارییەکانی ئەو دووڕووەی لە سینەیدا ناشت.

هەر سەبارەت بەم بابەتە و بەمەبەستی بەرچاوڕوونی زیاتر، ئەم نموونە بچووکەشتان عەرز دەکەم: یەکێك لە هاوەڵان کۆیلەکەیی دەفرۆشت. بەڵام دەیویست "وەلاء"ەکەی هەر لای خۆی بمێنێتەوە. ئەمە لە حاڵێکدا بەگوێرەی ئیسلام کێ ئەو کۆیلەیەی ئازاد بکردایە، وەلائەکەشی دەبووە هی ئەو کەسە. جا کە هەڵوێستی دین ئەمە بێت، ئیتر هەر شتێکی تری پێچەوانەی ئەمە، تاوان بوو. پێدەچێت ئەو هاوەڵە بەرێزە تا ئەوکاتە حوکمی شەرعیی ئەو بابەتەی نەزانیبێت، بۆیە داوایەکی لەو جۆرەی کردووە. زۆری نەبرد هەواڵەکە گەیشتە سەروەرمان. پێغەمبەری خوا دیسان خودی ئەو کەسەی نەکردە ئامانج. بەڵکو چووە سەر مینبەر و حوکمی شەرعیی ئەم بابەتەی بۆ خەڵکەکە بەگشتی ڕوون کردەوە. لە کۆتاییشدا فەرمووی: اَلْوَلَاءُ لِمَنْ أَعْتَقَ "وەلاء بۆ ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکات."[2]

هاودەم لەگەڵ نیشاندانی سەدەها نموونەی هاوشێوەی ئەمە، دەتوانین بڵێین کە: پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) وەك یەکێك لە داخوازییەکانی ڕەوشتە بەرزەکەی، تاوانی هیچ تاوانبارێکی نەداوەتەوە بەچاویدا و هیچ کەسێکیشی بەهۆی گوناهەکانیەوە تەریق نەکردووەتەوە.

جا ئیتر لەم مەسەلەی مۆڵەت پێدانەشدا، دووبارە ئەم ئاکارەی ڕۆڵی بینی. لەپێناو ئەوەی پەردەیان لەڕوو هەڵنەماڵێت، نییەتە ڕاستەقینەکەیانی نەداوەتەوە بەچاویاندا و مۆڵەتی هەموو ئەوانەی داوە کە هاتبوون بۆ مۆڵەت خواستن. بەڵێ،

---

١ بخاري، جنائز ٢٣؛ مسلم، فضائل الصحابة ٢٥.

٢ بخاري، صلاة ٧٠؛ مسلم عتق ٥-١٥.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) زۆر سینە فراوان بوو. ئەو پێغەمبەرێکی پایەبەرزی ئەوتۆ بوو کە جێ درەوشانەوەی ڕازی ئایەتی ﴿ أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴾ (الشرح : ١) "سینەتمان نەکردەوە و فراوانیمان نەبەخشیە ڕۆحت؟" بوو. ئەوەتا لە بابەتێکدا کە دووڕووان کەسایەتی و ناخی خۆیان تێدا خستەڕوو و درۆیان کرد، ئەو سەروەرە دێت و پەردەیەك دادەداتەوە بەسەر درۆکانیاندا و ڕەوشتی پێغەمبەرانەیان پیشان دەدات. بەڵێ، ئەمە ئەو پێغەمبەرە پایەبەرز و شکۆبڵندەیە کە وا قورئان و تەورات و ئینجیل وەك بلێی پێشبڕکێیانە بۆ قسەکردن لەسەر بەرزی و بڵندیی قەدر و شکۆکەی.

## سورەتی "عَبَسَ"

بەشێکی تری باسەکەمان سورەتی " عَبَسَ "یە. لە یەکەم ڕوانیندا وا دەردەکەوێت کە سورەتی "عَبَسَ" ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ سەروەرمان و گلەیی لێدەکات. بەر لەوەی بچینە نێو شیکاری بابەتەکەوە، پێمان باشە لەو ڕووەوە کە لای هەموان زانراوە، ئەو بەسەرهاتە بگێڕینەوە کە بووەتە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە. پاشانیش بە سەرنج ڕاکێشان بۆ لای ئەو واتایانەی کە ئایەتەکە ئاماژەیان بۆ دەکات، پیشانی بدەین کە چۆن لە بابەتێکدا کە دەویسترێت مەعصومیەتی پێغەمبەری پێشەوامانی پێ لەکەدار بکرێت، مەعصومیەتەکەی هەروەك خۆری ناوجەرگەی ئاسمان دەدرەوشێتەوە.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەگەڵ گەورەپیاوانی قورەیشی وەك عوتبە و ئەبوجەهل دانیشتبوو و بانگەوازی ئیسلامی پێ ڕادەگەیاندن. ڕێك لەو کاتەدا کە هەموو سەرنجی خۆی دابووە بابەتەکە و شتانێکی بۆ باس دەکردن؛ عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتووم (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کە نابینا بوو، خۆی کرد بە ژووردا و بە

پێغەمبەری خوای وت: أرشدني يا رسول اللهِ "ئەی پێغەمبەری خوا، ڕێنموێنیم بکە." پاش ئەوەی چەند جارێك ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەری خوا ڕووی گرژکرد و پشتی تێکرد... پاشان چووەوە سەر ئەو بابەتەی کە کەمێك پێشتر قسەی لەسەر دەکرد...[1] جا ئیتر ئەو چەند دێڕەی سەرەوە، پوختەی ئەو هۆکاری دابەزینەیە کە بە شێوەیەکی گشتی لەم بارەیەوە باس دەکرێت.

ئەگەر بێت و بابەتەکە بەدەوری ئەم تەوەرەی تێڕوانینەدا تاووتوێ بکەین، ئەوا دەڵێین: خۆ ئەگەر ئەو هاوەڵەی کە هات، نابیناش نەبووایە و ڕۆشنایی لە چاوانیدا هەبووایە، دیسانەوە ئەم هەڵسوکەوتەی پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) نەدەبووە تەوەرەی ئاگادارکردنەوەی ئیلاهی. بەڵام لەبەر ئەوەی کەسی هاتوو نابینا بوو، بۆیە دەبووایە سەروەریشمان چاوپۆشی لێ بکردایە. هەر بۆیە ڕووگرژکردن و ڕوو وەرگێڕانی بووە مایەی ئاگادارکردنەوەکە.

ئەمە ئەو حوکمەیە کە لەم ڕوانینە ڕواڵەتبینەوە پێی دەگەین. خۆ ئەگەر کەمێك بە چاوی وردبینییەوە لە ئایەتەکە بکۆڵینەوە، ئەوا ڕووەکەی تری حەقیقەتیش دەردەکەوێت و تێدەگەین کە چەندە پەلە کراوە لەو بڕیارەی پێشوودا.

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە هەموو کۆڕ و مەجلیسێك -هەریەکەو بەگوێرەی خۆی- شێواز و ئادابی تایبەت بە خۆی هەیە. بەم پێیە، نابێت چوونە حوزوور و سەردانی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) وەك چوونە سەردانی هەر کەسێکی تری ئاسایی بێت و هەستان و دانیشتنیشُ وەك هەستان و دانیشتن بێت لە تەك هەر کەسێکی دیکەدا. ئەوەتا دەبینین لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیشدا ئادابی ئەم سەردان و چوونە حوزوورە فێری موسوڵمانان کراوە. چ کاتێك سەردانی پێغەمبەری خوا دەکرێت، چەندێك لە خزمەتیدا دەمێنرێتەوە،[2] ئاستی

١ ترمذي، تفسير (٧٠) ١؛ طبري، جامع البيان ٥١/٥٠.
٢ بڕوانە: سورەتی الأحزاب، ئایەتی ٥٣.

دەنگ و شێوازی قسەکردن دەبێت چۆن بێت،[1] هەموو ئەمانە لە لایەن خوای گەورە خۆیەوە فێری باوەڕداران دەکرا.

لەپاش ئەنجامدانی عەقدی حوزوور، هەمان شت بەسەر ئادابی چوونە حوزووری خوای گەورەشدا دەچەسپێت. تێ نەپەڕین بە بەردەم کەسێکدا کە نوێژ دەکات، نموونەیەکی جوانی ئەمەیە. کاتێك باوەڕدارێك لە حوزووری خوای باڵادەستدا دەوەستێت بۆ نوێژ، گەر بێت و کەسێکی تر ئەو حووزوورە تێك بدات و بە بەردەمیدا بڕوات، ئەوا بە گوێرەی مەزهەبی حەنەفی، ئەو کەسە ئاگادار دەکرێتەوە. بەگوێرەی هەندێك لە مەزهەبەکانی تریش، هەوڵ دەدرێت ڕێگە بە تێپەڕبوونی نەدرێت. تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە هەر سووربوو لەسەر ئەوەی کە تێبپەڕێت، ڕێگە دراوە مستێکیش لە سنگی بدرێت.[2]

ئاخر نوێژخوێن لە حوزووری سوڵتانی سوڵتانانندایە و لەگەڵ ئەو زاتەدا لە ئاخاوتندایە. جا ئەگەر چوونە نێوان دوو کەسەوە کە لە ئاخاوتندابن بە کارێکی پێچەوانەی ئەدەب هەژمار بکرێت، دەی ئیتر ئێوە خۆتان داوەری بکەن کە چ کارێکی پێچەوانەی ئەدەبە گەر بچیتە نێوان بەندە و پەروەردگاریەوە. هەر لەبەر ئەم خاڵەیە کە پێغەمبەری سەروەرمان دەفەرموێت: "ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژخوێنێکدا دەڕوات ئەگەر بیزانیایە چ تاوانێکی ئەنجام داوە، ئەوا چل ساڵ چاوەڕێی دەکرد و بە بەردەمی ئەو کەسەدا تێ نەدەپەڕی."[3] هەروەك چۆن ئامادەبوون لە حزووری سووڵتانی سوڵتانەکان، خوای باڵادەستدا، ڕێسا و ئادابی خۆی هەیە، هەر بەوجۆرە، ئامادەبوون لە حوزووری یاوەری ئەو سوڵتانەشدا ڕێسای تایبەت خۆی هەیە.

جا ئایا سەروەرمان لەو کاتەدا سەرقاڵی چی بوو؟ لە هەوڵی خاڵی کردنەوەی

---

١ بڕوانە: سورەتی الحجرات، ئایەتی ٢-٥.
٢ بڕوانە: جزيري، المذاهب الأربعة ١/٢٧٢-٢٧٣.
٣ بخاري، صلاة ١٠١؛ مسلم، صلاة ٢٦١.

ئیلهامەکانی دەروونیدا بوو بەنێو ویژدانی دوو کەسی دڵ ڕەقدا. ئەوێك کە تا بڵێی لە بابەتی هیدایەتی مرۆڤەکاندا بەپەرۆش بوو. کاتێك قورئانی پیرۆز لەم بابەتەدا باسی ئەومان بۆ دەکات، دەستەواژەی "خۆت مەکوژە"[1] بەکاردەهێنێت. بەڵێ وابوو، کە کەسێکی بێ ئیمانی دەبینی، بە جۆرێك دڵتەنگ و غەمگین دەبوو، وەخت بوو وەك مۆم بتوێتەوە. ئیدی ڕێك لەم کاتەدا کە لە کەشێکی ئاوەهادا سەرگەرمی وتووێژە، یەکێك دێت و خۆی دەکات بە قسەدا و دۆخەکە بارگاوی دەکات و بابەتەکە پەرت دەکات و دەبێتە مایەی تێکدانی ڕەوتی دیدارەکە! خۆ ئەگەر ئەو کەسە پاساوێکی ڕەوای هەبووبێت لەبەر ئەوەی کە نابینایە، ئەوا سەروەرمان لە حاڵێکدا ئەگەر ڕووشی گرژ کردبێت و پشتیشی تێ کردبێت، (دەڵێم ئەگەر وا بێت) بەلایەنی کەمەوە دە پاساوی ڕەوای هەبووە. کەوابێ، بە هەڵە دانانی ڕەفتارێکی لەم جۆرە لە وەها زەمینەیەکی ڕەوادا -مەبەستمان لەوانەیە کە دەیانەوێت لەم ڕێگەیەوە تانە و تەشەر لە پێغەمبەری خوا بدەن- نەك هەر هەڵەیە، بەڵکو ڕەزاگرانترین هەڵەیە.

جا ئەگەر ڕووداوەکە بەم شێوەیە ڕووی دابێت، ئەوا وەڵام و چارەسەرەکەی ئەمەیە... ماوەتەوە بڵێین؛ لە دوێنێوە تا ئەمڕۆ ئەم ڕووداوە لە هیچ کام لەو سەرچاوە باوەڕ پێ کراوانەی فەرموودەدا کە لە بەردەستماندان، وەك بوخاری و موسلیم و تیرمیذی و ئەبو داود و نەسائی و ئیبن ماجە و موسنەدی ئەحمدی کوڕی حەنبەل و موستەدرەکی حاکم بەو شێوەیە باس نەکراوە کە لە تەفسیرەکاندا باس کراوە و سیناریۆی بۆ داڕێژراوە. یەك لە قارەمانەکانی ئەو سیناریۆیەی لە تەفسیرەکاندا هاتووە سەروەرمان و ئەوی تریشیان ئیبن ئوم مەکتومە. دوو ڕۆڵبینی لاوەکیش هەن: ئەبوجەهل و عوتبە. ئەمە لە حاڵێکدا کە تەفسیرنووسە لێکۆڵەرەکان سەبارەت بە ناسنامەی ئەو کەسەی هاتووەتە خزمەت پێغەمبەری خوا،

---

[1] بڕوانە: سورەتی الكهف، ئایەتی ٦؛ سورەتی الشعراء، ئایەتی ٣/٢٦.

چەندین ناوی جۆراوجۆریان هێناوە. تەنانەت هێشتا ئەوەش یەکلایی نەبووەتەوە کە ئایا ئەو کەسەی هاتووە هەر لە ڕاستیدا نابینا بووە یاخود ئەمە مەجازێکە؟ بۆیە وا پێویست دەکات بازنەی بۆچوونەکان بەکراوەیی جێبهێڵین.

هەر بە بۆنەی ئەم ڕووداوەوە جگە لە ئیبن ئوم مەکتوم (رضيَ اللهُ عَنْهُ) باس لە حەوت کەسی تریش دەکرێت کە تێکڕا دەبنە هەشت کەس. لەم نێوەندەشدا هیچ هۆکارێك لەبەردەستدا نییە کە تای پەسەند دان بەلای ئیبن ئوم مەکتومدا پارسەنگ بکات، یاخود وا بکات کە بەناچاری ئەو بخرێتە ئەو شوێنەوە. تەنانەت پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دووجار ئەم هاوەڵە پایەبەرزەی -کە لە یەکەمین دەستەی موسوڵمانانە- لە شوێنی خۆی لە مەدینە وەك جێگر داناوە. ئەگەرێکی بەهێزیش هەیە کە لە قادسیەدا شەهید بووبێت. ئەمە سەرباری ئەوەی کە لە سەری دایکە خەدیجەمانەوە (رضيَ اللهُ عَنْها) خزمایەتییەکیشی لەگەڵ سەروەرماندا هەبووە. بەڵێ، ئیبن ئوم مەکتوم کوڕی خاڵی دایکە خەدیجەمان بوو.[1] لەبەر ئەوە ئامادەبوونی لەو مەجلیسەدا حاڵەتێکی ئاسایی بووە و شتێك نەبووە لە ئارادا وا بکات وەك بێگانە تەماشا بکرێت یاخود دەوروبەرەکەیی پێی قەڵس ببێت. ئینجا مادەم سەرباری نابینایییەکەشی وەکالەتی پێغەمبەری خوای گرتووەتە دەست، کەواتە کەسێکە هەستان و دانیشتنی خۆی دەزانێت.. بۆیە دەبێت ئیبن ئوم مەکتوم (رضيَ اللهُ عَنْهُ) کۆتا ناو بێت لەنێو ناوەکانی تردا کە خەیاڵمان بەلایدا بچێت.

کێ دەزانێت، لەوانەشە ئەو نابینایە یەکێك بووبێت لە مونافیقان و پێغەمبەری خواش ئاگاداری نیفاقەکەی بووبێت. ئینجا لەبەر ئەوەی دڵسۆز نەبووە لە داواکردنی ئیرشاددا و ڕێگریشی کردووە لە ئیرشادێك کە لەو کاتەدا بەڕێوە دەچوو، بۆیە پێغەمبەری خوا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) دەموچاوی داوە بەیەکدا و ڕووی لێ وەرگێڕاوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا تا بڵێی ڕەفتارێکی ئاساییە. لەگەڵ ئەوەشدا،

١ إبن حجر، الإصابة ٤/٦٠٠-٦٠١.

کاتێك گوزارشت لەم بۆچوونە دەکەین، بەو چاوەوە تەماشای ڕووداوەکە ناکەین کە کتومت ئاوەها ڕووی دابێت. بەڵێ، بانگەشەی شتێکی لەو جۆرە ناکەین. بە هەرحاڵ لە ڕوانگەی دروستیی ڕیوایەتی ڕووداوەکەوە، بۆچوونی ئەوانەی ئیبن ئوم مەکتومیان بە قارەمانی ڕووداوەکە داناوە، هیچی لەو بۆچوونە زیاتر نییە کە ئێمە لە ڕێی ئەم لێکدانەوەیەوە خستمانە ڕوو. کەوابێ، بە ڕەچاوکردنی بنەماکانی هزر و بیر، وا پێویست دەکات بە چاوێکی یەکسانەوە بڕوانینە هەردوو لێکدانەوەکە.

لایەنێکی تریش کە جێی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە کە:

هەندێك لە تەفسیرنووسان لەبری پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)، وەلیدی کوڕی موغیرە بە بکەری هەردوو کرداری "عَبَسَ وَتَولى" دادەنێن. شایانی باسە کرداری "عَبَسَ" لە قورئانی پیرۆزدا لە دوو جێدا هاتووە. یەکێکیان کرداری "عَبَسَ"ی ناو ئەم سورەتەیە. ئەوەی تریشیان ئەو کرداری "عَبَسَ"یەیە کە لە سورەتی "المُدَّثِر"دا هاتووە.[1] دەی ئێستا سەرنج بدەن: قورئانی پیرۆز لە سورەتی "المُدَّثِر"دا ئەم وشەیەی بۆ کافرێك بەکار هێناوە. جا ئەو کافرە وەلیدی بن موغیرە بێت یان هەر کەسێکی تر. ئاخر ئەگەر قورئانی پیرۆز لە جێیەکدا دەربڕینی "ڕووی گرژکرد"ی بۆ کافر بەکارهێنابێت، چۆن لە جێیەکی تردا بۆ پێغەمبەری خوای بەکار دەهێنێت؟! ئەو پێغەمبەری خوایەی کە هەمیشە دەم بەخەندە بووە و هەرگیز زەردەخەنە لە لێوانی نەتۆراوە.[2]

کرداری "تَوَلَّىٰ"ش هەر هەمان شتە. ئەوەتا قورئانی پیرۆز ئەم دەستەواژەیە بۆ فیرعەون بەکاردەهێنێت و دەفەرموێت: "فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ".[3] ڕاستە ئەم کردارە تەنها بۆ فیرعەون بەکار نەهاتووە. بەڵام ئەم شێوازە لە دەربڕینی قورئان، هەردەم

---

١ بڕوانە: سورەتی المدثر، ئایەتی ٢٢.
٢ ترمذي، مناقب ١٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ٤/١٩٠-١٩١.
٣ بڕوانە: سورەتی طه، ئایەتی ٦٠.

مەبەستی فیرعەونەکان بووە و بۆ فیرعەنەکان بەکارهاتووە.[1]

ئاخر چۆن ڕێی تێدەچێت قورئانی پیرۆز لە ڕێی دوو کرداری یەك بەدوای یەکی ئاواوە باسی خۆشەویستی خوا بکات و ئەم کردارانای بداتە پاڵ؟ هەمدیسانەوە چۆن ڕێی تێدەچێت هەمان ئەو مێزەرەی لەسەری کافرێکی پێچاوە، بێت و لەسەری ئەو سەروەرەی بپێچێت؟

وا دەزانم پێویست بکات مافی ئەگەرێکیش بەوانە بدرێت کە پاڵپشتی ئەم بۆچوونەی دوایی دەکەن. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە، بکەری هەردوو کرداری "عَبَسَ" و "تَولی" سەروەرمان نییە، بەڵکو ئەو کافرەیە کە چاوی بەڕووی حەقیقەتدا کوێربووە. وەك کوێر هاتووە و لە بەرامبەر سەروەرماندا ڕووی گرژ کردووە، پاشانیش لێی داوە و ڕۆیشتووە. لە حاڵێکدا ئەگەر "تەرجیحدەر"ی عیصمەتی پێغەمبەران بەهەند وەربگیرێت، ئەوا دەکرێت بەم بۆچوونەش بوترێت: "ئەگەری هەیە وا بێت." ڕاستییەکەی لە ڕوانگەی ڕیوایەتیشەوە ڕیوایەتێك شك نابەم کە ئەم بۆچوونە هەڵبوەشێنێتەوە. ئینجا دوای ئەوەش کە واتا لەگەڵ سیاق و سیباقەکەیدا گونجا، ئیتر هیچ هۆکارێك نامێنێتەوە وا بکات واتایەکی لەو جۆرە مەبەست نەبووبێت.

مەبەستیشمان لە خستنە ڕووی ئەو شتانەی کە بە "مُحقَّق" و "مُحتَمل" ناوبران، ئەوەیە کە: لە بەرامبەر ئەو بۆچوونانەدا کە بە قسەکردنێکی ڕواڵەتبینانە دەربارەی ئەو ئایەتانەی کە بەناوی گلەیی و ئاگادارکردنەوەوە بۆ پێغەمبەری نازدارمان (صَلَّىَ اللهُعَلَيهِوَسَلَّمْ) نازڵ بوون و، بەدەم کوتین لە سەرچاوەیەکی گرنگی دین؛ دەیانەوێت ئەو پاڵپشتە ئیلاهییە بە هیچ دابنێن و پێگەی پێغەمبەرایەتی لەبەرچاوی عاشقانی ڕێبازەکەی و ئەوانەی بەوپەڕی باوەڕەوە دەستیان بە بەرنامەکەیەوە گرتووە، بێ

[1] بڕوانە: سورەتی البقرة، ئایەتی ٢٠٥؛ سورەتی طه، ئایەتی ٤٨؛ سورەتی النجم، ئایەتی ٣٣؛ سورەتی المعارج، ئایەتی ١٧؛ سورەتی الغاشیة، ئایەتی ٢٣؛ سورەتی اللیل، ئایەتی ١٦؛ سورەتی العلق، ئایەتی ١٣.

بنەما و لەرزۆك و جێگرەوەدار پیشان بدەن، دەبێت ئێمە جارێکی تر قودسییەتی ئەو سەرچاوەیە بەگوێی هەموو لایەکدا بدەین. گەرنا، باوەڕداران بەو قەدر و قیمەتەوە کە پێغەمبەرەکەیان لەلای پەروەردگاری هەیەتی زۆر چاك دەیناسن.

بەڵێ، ئەو مرۆڤێکی بێ وێنە بوو. خوای باڵادەست (جَلَّ جَلَالُهُ) لە ڕەهەندێکی تەواو جیاوازدا گفتوگۆ و ئاخاوتنی لەگەڵیدا هەبوو. خوای گەورە وەحی بۆ دەنارد و ئەویش ئەو پەیامە ئیلاهییەی وەردەگرت و ڕای دەگەیاند. پەروەردگار هەمیشە ئەم تایبەتمەندی و ئەمنییەت و عیصمەتەی ئەوی دەپاراست. جا بۆیە پێویستە وەك قەرزێك، وەك حەق و واجبێك لەسەرمان، یان هەر هیچ نەبێت وەکو وەفایەکی سەرشانمان، ئێمەش بیپارێزین. هۆکاری سەرەکی ئەم جۆش و خرۆش و نەسرەوتنەشمان هەر ئەمەیە. مەگەر چەندە زۆرن ئەو خاوەن ناسنامە نادیارە ناوخۆیی و دەرەکی و پەنهان و ئاشکرایانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەیانەوێت ئەو بەژنە باڵایە وەك هەر کەسێکی تری ئاسایی هەڵبسەنگێنن و بیخەنە بەر نەشتەری ڕەخنە.. بۆیە باوەڕمان وایە کە پێویستە عیصمەت و عیففەتی ئەو سەروەرە لە شەرەف و نامووسی خۆمان بەرزتر ڕابگرین و تا دەتوانین بیپارێزین و بەرگری لێ بکەین.

بەڵام دەشزانین کە هێز و توانامان سنووردارە. بەڵێ، هێز و توانامان بەشی ئەوە ناکات کە لە هەموو ئاستەکاندا لەگەڵ ئەو دوژمنانەی دین و ئیمان کە لە هەوڵی پشێوی نانەوەدان بەدەوری پێغەمبەری خوادا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) و، ئەوانەش کەوا هۆشیارانە یان بێ ئاگایانە بوونەتە داردەستیان، بکەوینە مشتومڕ و بەرپەرچیان بدەینەوە. بەڵێ، ئەو هێز و توانایەمان نییە. چونکە کاری ئەوان ڕووخاندنە، هی ئێمەش بنیات نان. ئەوان هێزی زەبەلاحی میدیای جیهانی بەکاردەهێنن، ئێمەش هۆکارگەلێکی بچووکی ڕاگەیاندن. بەڵام لە سەر ئاستی ژیری و زانست، وەك چۆن لە هەموو سەردەم و قۆناغێکدا شکستیان خواردووە، لەمەودواش هەر هەمان

چارەنووس بەشیان دەبێت. ئاخر چونکە ئەو کارەی ئەوان دەستیان داوەتێ، جیاوازی نییە لەگەڵ ئەوەی بەری خۆر بەبێژنگ بگریت. ئەگەرچی نەشتوانین وەڵامی یەکە بە یەکەی گومانەکانیان بدەینەوە... کە لە بنەڕەتدا مەرجیش نییە ئەمە بکەین. بەڵام گەورەکانمان زۆر بەجوانی و پوختی گوزارشتیان لەم جۆرە حاڵەتانە کردووە و وتویانە: "خۆ ئەگەر هەر شتێ بوەڕێ و منیش بەردێکی تێبگرم، ئەوکات بەرد لەسەر زەویدا نامێنێت." دەی ئێمەش جارێکی دی هەمان شت دووبارە دەکەینەوە.

لێرەدا بابەتێکی گرنگی تر هەیە، بێ یادخستنەوەی پێم خۆش نییە بەسەریدا تێ بپەڕین. لە ڕاستیدا، ئەو بابەتەی لێرەدا دەمانەوێت باسی بکەین، دووبارە بەوێنەی میلی قیبلەنما و، وەك میلێکی هەستیاری سەرنەکەر پەنجە بۆ ئەو زاتە ڕادەکێشێت و ئەو پیشان دەدات.

پێغەمبەری سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلامُهُ عَلَيْهِ) بە جۆرێکی وا هەواڵی لە جیهانەکانی ئەودیو پەردەی غەیب داوە و ڕووداوەکانی داهاتووی بۆ باس کردووین، هەر دەڵێیت ئەمڕۆمانی دیوە و لەم ڕۆژگارەدا ژیاوە. نەوەتا لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: "لە ئاخیرزەماندا دوکەڵێك پەیدا دەبێت، ئەم دوکەڵە کافرەکان دەکوژێت و باوەڕدارانیش توشی هەڵامەت دەکات."[1] ئەو فەلسەفە ماددییەی کە حەق و حەقیقەت قبووڵ ناکات، لە ڕووی ڕۆحیانەت و مەعنەویاتەوە مرۆڤی دنیای کوفر و ئیلحادی کوشت و، گومان و دوودڵیشی خستە نێو موسڵمانانەوە. جا ئیتر حاڵ و ماهییەتی ئەوانەی کەوا ئەمڕۆ دەست بە دەسڕ و خەریکی لووت سڕینن، بریتیە لەمە.

جا ئێستا دەپرسم: ئایا دەکرا بەشێوەیەکی لەمە جوانتر وێنای باری نالەباری

---

١ إبن أبي حاتم، التفسير ٤٠٦/٧-٤٠٧؛ الطبري، جامع البيان ١١/٢٥-١١٤.

مرۆڤی ئەم سەردەمە بکرێت کە لەبەر عەرەبی نەزانی و ناشارەزایی لە وردەکارییەکانی زماندا لە هەوڵی داپۆشینی ئەم نەزانییەیدایە بە فرووفێڵ و لەبەر خۆیەوە کەوتووەتە وڕێنە کردن و قسەی بێ بنەمای هاوشێوەی: "ئێمە تەفسیرمان بەسە، ئیتر چ پێویست بە فەرمودە دەکات؟" دەبڕزکێنێت..! ئەم مەسەلەیە ئەوەندەش ئاسان نییە کە دەبینرێت. ئەم سیناریۆی کوفرەی کە بە ئەبوجەهل و عوتبە و شەیبەکان دەستی پێکردووە و لەڕێی خۆرهەڵاتناسە ڕۆژئاواییەکانەوە هەوڵدراوە بەردەوامیی پێبدرێت و... بە گۆڵدزیەرەکان گوایا بەرگێکی زانستییانەی کراوە بە بەردا و.... لە ڕێگەی ڤۆڵتێرەکانیشەوە بە شانۆ کراوە... لە کۆمەڵە دنیایەکی تردا بەرهەم دەهێنرێت و ڕۆڵەکەشی بە بەری ڕۆڵەی سەرشەقامەکانی ناو خۆمان دەدورن. ئینجا هەر ئەوەندەی خوێندیان بەگوێیاندا و پێیان وتن: "ئادەی سەرێك دەرکەن و خۆتان بنوێنن!" ئیتر ئەمانیش چ بەهۆی نەزانییەوە بێت یان سەودایی ناوبانگ و دوو سێ فلس کە خراوەتە دەستیان، دەست لەسەرسنگ بۆ بەجێهێنانی ئەم فەرمانە هەڵدەستن بەگێڕانی ڕۆڵی خۆیان لەم سیناریۆ قێزەونەدا. "ئێمە قورئانمان بەسە. تەرجومە هەموو شتێکی بڕاندووەتەوە، ئیدی چ پێویست بە عەرەبی زانین دەکات؟ ئەوەتا ئینسان تەنها بە موتاڵاکردنی تەرجومەش دەتوانێت ببێت بە موجتەهید." ئەم قسەیە و زۆرێکی تری هاوشێوەی ئەمە، تەنها یەك دوو بڕگەی بچکۆلانەی نمایشکراوی سیناریۆیەکی ئامادەکراوی گەورەیە و، چەند قسەیەکە خراوەتە سەر دەمی یەك دوو ڕۆڵبینی ئەم نمایشە. بە دڵنیاییەوە بە دواشیدا دنیای زەبەلاحی کوفر زەمینەپشکنیی خۆی دەکات و بارودۆخەکە هەڵدەسەنگێنێت. خۆ هەر ئەوەندەی زەمینەی لەباریان دیتەوە -دەك نەی بیننەوە إنشاء الله- ئەوا باش بزانن کە قسەکانیان لە سنووری ئەو قسانەدا نامێنێتەوە کەوا ئەمڕۆ دەیکەن.

بۆیە لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە زیندوو کردنەوەی ئەو ڕێز و ئەدەبەیە کە هاوەڵە بەڕێزەکان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نواندوویانە.

جا بۆ ئەوەی ئەم خاڵە وەك شعوورێکی زیندوو لە ناخماندا ڕەگ دابکوتێت و ببێتە بەشێکی دانەبڕاوی سروشتمان، ئەوا پێویستە زۆر بە باشی شارەزای عیصمەت و ئەمنیەتی پێغەمبەری خوا ببین و بەشێوەیەك لە دەروونماندا جێی بکەینەوە، گەردیلەیەك ئەگەری پێچەوانەی ئەوە نەیەت بە مێشکماندا.

ئەوەتا هاوەڵان دەفەرموون: "کاتێك گوێبیستی پێغەمبەری خوا دەبووین، ئەوەندە بە وردی و سەرنجەوە گوێمان ڕادەگرت، دەتوت باڵندە لەسەر سەرمان نیشتووەتەوە و ناجووڵێین نەبادا بفڕێت."[1] قسەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر و حەزرەتی عومەر (رضي الله عنهما) لە حوزووری پێغەمبەری خوادا (عليه ألف صلاة وسلام) زۆر دیاریکراو و سنووردارە. ئاخر چونکە ئەوان دەیانزانی لە حوزووری پێغەمبەرێکدان کە بە وەحی پاڵپشتی دەکرێت. گوێگرتن لەو، وەك گوێگرتن وایە لە موتەکەلیمی ئەزەلی. چونکە ئەو وەحییەی دەهات، لە ڕێگەی ئەو ویژدانە بێگەرد و دەروونە سازگارەیەوە وەك چۆن بە پاکی و سافی هاتبوو ئاواش بەو شێوەیە پەخش دەبووەوە. هەر بۆیە ئەوانەی دەیانناسی، تەنها ئەوەندەیان پێ دەکرا. ئەو قسانەی لەپاڵ سوڵتانی پەیڤ و گوفتاردا دەکرێت، هی هەرکێ بێت، زیادەڕۆییە. جا ئەو کاتەی ئێمەش گەیشتینە ئاستی تێگەیشتنی هاوەڵان، هەمان شت دەکەینەوە و تەنها گوێبیستی ئەو نازدارە و وتە پڕ لەعل و گەوهەرەکانی دەبین... ئیتر لەم ڕێیەوە هەوڵ دەدەین چارەی دەردەسەرییەکانمان بدۆزینەوە.

لە لایەکی ترەوە، بێ ڕێزی نواندن بەرامبەر بە فەرمایشتە شیرینەکانی و نکوڵی کردنی سوننەتە پاك و بێگەردەکەی پردێکی درێژەوەبووە بەرەو کوفر. ئەوانەش کەوا هاتوچۆی سەر ئەو پردەیان کردووەتە نەریت و سەرگەرمی گەڕانن تیایدا، ئەمرۆش نەبێت سبەی، لە ڕێچکە و بازنەی حەزرەتی موحەممەد (صلى الله عليه وعلى آله وصحبه وسلم) دەپچڕێن و پەیوەندی دەکەن بە ڕیزی ئەبوجەهلەکانەوە.

---

١ بخاري، جهاد ٣٧؛ أبو داود، الطب ١.

له ڕاستیدا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر مەترسیدارە. ڕێگەچارەی ڕزگاربوونیش لێی، ناسینی پێغەمبەری خوایە بە هەموو لایەنەکانیەوە، یەکێکیش لە گرنگترین لایەنەکانی، بە دڵنیاییەوە مەعصومییەتەکەیەتی. دینیش بە هەموو لایەنەکانیەوە هەر دەڵێی لەگەڵ مەعصومیەتی ئەو سەروەرەدا ئاوێتە بووە. کردنەوەی هەر کەلێنێك لەوێدا، بە واتای دەستدانە گەورەترین کاولکاری دێت لە دیندا. هەربۆیە بە پێویستمان زانی کە بە بایەخ و هەستیارییەوە هەڵوێستە لەسەر ئەم بابەتە بکەین.

## تەکلیفی سەقیفییەکان

یەکێکی تریش لەو ئایەتانەی کە وا دەردەکەوێت ئاگادارکردنەوە بێت بۆ سەروەرمان، بریتییە لەم ئایەتە:

﴿ وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ ۖ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ۝ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ۝ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾ (الإسراء : ٧٣-٧٥)

"موشریك و بێباوەڕان هەوڵ و تەقەلای ئەوە دەدەن لەو وەحییە دوورت بخەنەوە کە بۆمان ناردوویت و شتێکی ترمان بەدەمەوە هەڵبەستیت. گوایا ئەوکات دەتکەنە دۆست و هاوەڵی خۆیان. خۆ ئەگەر ئێمە پایەدار و دامەزراومان نەکردیتایە، ئەوا بەڕاستی با کەمێکیش بێت، نزیك بوو بەلایاندا مەیل بکەیت. جا ئیتر ئەو کات سزای چەندەها قاتی ژیان و مردنیشمان پێ دەچەشتیت. پاشان کەسیشت دەست نەدەکەوت فریات بکەویت و لە دەست ئێمە ڕزگارت بکات."

هۆزی سەقیف لە بەرامبەر موسڵمان بوونیاندا داوای ئیمتیازاتیان لە سەروەرمان دەکرد. بۆ ئەم مەبەستە سەردانی پێغەمبەریان کرد و داوای ئەوەیان لێکرد کە لە جێبەجێ کردنی هەندێك لە ئەرکە ئایینیەکان بیانبەخشێت. خۆ ئەگەر هات و کەسانێکیش نارەزایی خۆیان لە ئاست ئاوەها جیاکارییەکدا دەربڕی، ئەوا (بەگوێرەی ئەو پێشنیارە کەودەن و منداڵانەیەی خستبوویانە بەردەستی) سەروەرمان دەیوت: "خوای گەورە بەم شێوەیە فەرمانی پێکردووم."[1] جا ئیتر ئایەتە پیرۆزەکانی سەرەوە، بارودۆخی سەیر و سەمەرەی ئەوان و، هەڵوێستی یەکلایی و نەگۆڕی پێغەمبەری خوا (صَلَّیَاللّٰهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە بەرامبەر داواکارییەکەیاندا دەخاتەڕوو. بۆیە ئێمەش جەخت دەکەینەوە و دەڵێین کە -وەك هەموو ئایەتەکانی دی- لەم ئایەتەشدا تاکە دەربڕینێك، تاکە خاڵێك نییە بێگوناهی و عیصمەتی سەروەرمان لەکەدار بکات.

ئەوان بە خەیاڵ پڵاویی و هەرزەبیریی خۆیان وایان دانابوو پێغەمبەری خوا لەخشتە بەرن. ئەم نادانانەی کە هەر نەیاندەزانی وەحی و نبووەتیش چییە، لە ڕێگەی ئەو سیناریۆیانەوە کە خەیاڵکردی خۆیانبوو، کەوتبوونە خەیاڵ قەپاندن و دەیانوت: ئەگەر کەسێك ئەوەندە تاسەمەند بێت بۆ هیدایەتی خەڵکی و بەتەنگ موسوڵمان بوونیانەوە بێ، هەڵبەتە لەپای موسوڵمانبوونی ئێمەشەدا دەست نانێت بەڕووی داخوازییەکەمانەوە و ناڵێت "نەخێر". بۆیە وایان دەزانی کە پێغەمبەری خوا بەخاتری موسوڵمان بوونیان لە بەشێك لە ئەرکە ئاینییەکان دەیانبوورێت.

ئەمە نیاز و چاوەڕوانیی ئەوان بوو. هەرچی پێغەمبەری خواشە (عَلَيْهِالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) سازشێکی لەم جۆرە نەك بە مێشکیدا نەدەهات، بەڵکو بۆ ساتێکیش لە ئاسمانی ئەندێشەیدا چەخماخەی نەداوە، هەرگیزیش نەیدەدا. ئاخر ئایین یەکەیەکی هەمەکیی یەککگرتووە. هەرگیز بواری ئەوەی تێدا نییە پەرت و دابەش بکرێت و

1 إبن هشام، السيرة النبوية ٢٢٢/٥؛ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٣١٢/١-٣١٣.

پاشانیش ناوی ئایینی لێ بنرێت. سەروەرمان یەکەم ڕۆژی پێغەمبەرایەتییەکەی چی بە دوێنراوەکانی وتبێت، کۆتا ڕۆژیش هەر هەمان شتی وتووە. ئەو سەررێبواری شارێی ئیستیقامەت بوو. ئیسلامیش هەر بۆ ئەوە هاتووە تا مرۆڤەکان بەرەو ئیستیقامەت کێش بکات. بۆیە مەحاڵە دژیەکی و ڕێساگەلێکی تێدا بێت کە حوکمی یەکدی هەڵبوەشێننەوە. ئەوە با لەولاوە بوەستێ کە بۆچوونێکی لەم جۆرە، نە لە نزیك و نە لە دوور پەیوەندی بە زانست و مەنتیق و ژیرییەوە نییە.

ئاخر جەنابتان سەرنج بدەن: نەك حەزرەتی فەخری عالەم، بگرە تەنانەت صدیقی ئەکبەر (حەزرەتی ئەبوبەکر)یش داخوازییەکی لەو جۆرەی ڕەت کردووەتەوە. ئەوەبوو لە ڕووداوی هەڵگەڕاوەکاندا جەنگی بەرامبەر ئەوانە ڕاگەیاند کە دەیانوت نوێژ دەکەین بەڵام زەکات نادەین.[1] لەمەوە دەگەینە ئەوەی کە لەم ئایەتەدا شتێك نییە بە ناوی هەڵەوە درابێتە پاڵ سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْه)، بەڵکو ئەوەی لە ئایەتەکەدا باس کراوە، وەهم و گومانی نەزۆکی کۆمەڵە ناکەس بەچەیەکە کە نزیك تا دوور پەیوەندی بە پێغەمبەری خواوە نییە، پێغەمبەری پێشەواشمان پاك و بێگەرد و بەرییە لەم وەهم و گومانانەیان.

ئایەتی دووەمیش کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴾ (الإسراء : ٧٤)ماناکەی ئەمەیە: "ئەگەر ئێمە تۆمان هەروەك کەژە مەزن وسەرکەشەکان پتەو و جێگیر و ڕەگ داکوتاو نەکردایە و ڕێك وەك ئەو کەژانە، ڕەگت بەناو زەمینی حەقیقەتدا دانەکوتایە، ئەوا با کەمێکیش بێت، ڕەنگە مەیلت بەلای ئەواندا بچووایە."

لە ڕاستیدا ئەم وتەیە، کە لە چوارچێوە و هەلومەرجی گریمانەیەکی مەحاڵدا وتراوە، وا پێویست دەکات لە گۆشە نیگای دەرخستنی قەد و قامەتی بڵندی پێغەمبەری سەروەرمانەوە بۆی بڕوانرێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەری خوا

---

١ بخاري، الإعتصام ٢؛ مسلم، الإيمان ٣٢.

(عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەسەر زەمینەیەکی ئیمانیی ئەوەندە پتەو جێگیر بووە، شتێك نییە ناوی دارمانی زەمینی بێت لەو شوێنەی ئەوی لێیە.

خۆ ئەگەر -بە فەرزی مەحاڵ- ئەو سەروەرە کەسێك بووایە بە نبووەت سەرفراز نەکرابووایە و تەنها بیرمەند و بزاوتخوازێکی پەتی بووایە، ئەوا ئەو کات لەوانە بوو جۆرە چاوپۆشییەکی بەرژەوەندی خوازانەی بەڕووی هزر و بۆچوونەکەیاندا بنواندایە و هەوڵی دابایە وابەستەی خۆییان بکات. چونکە ئەم چەشنە خاڵە لاوازانە لە سروشتی مرۆڤدا بوونیان هەیە. بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) پێغەمبەرێکە کە لە هەموو چەشنە لاوازییەك پارێزراوە و هەمیشە لە هەوڵی وابەستەکردنی مرۆڤەکاندایە بە دینی خوای گەورەوە، نەوەك خۆی. جا بەو پێیەی ناکرێت قسە لەسەر دینداریی کەسێك بکرێت کە دینی بە هەموو بەش و وردەکارییەکانیەوە قبووڵ نییە، ئیدی بۆچی پێغەمبەری خوا سازشیان بۆ بکات و لەبەر خاتری ئەوان ئەحکامەکانی دین بگۆڕێت؟ ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەو تەنها نێرراوێکە و ئەرکی ڕاگەیاندنی ئەمر و نەهییەکانی خوای باڵادەستە. ئەوەی حوکم دەدات و فەرمان بە ئەمر و نەهییەکان دەکات، ڕاستەوخۆ خوای گەورە خۆیەتی (جَلَّ وَعَلَا).

هەروەها دەتوانین لە دەربڕینی: "لەوانەبوو مەیلت بەلایاندا بچووایە." ئەم واتایانەی خوارەوەش هەڵبگۆزین:

ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو نەکردایە و هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانتمان نەخستایەتە ژێر چاودێریی وەحییەوە و هاوشێوەی کەسانی دی، لە گەیاندنی دیندا تۆش ڕێگەی عەقڵ و مەنتیقت بگرتایەتە بەر، ئەوا لەوانەبوو تۆش بەم شێوەیە بیرت بکردایەتەوە و بتوتایە: با من ئێستا ئەمەیان لێ قبووڵ بکەم، دواتر وردە وردە گرووتینیان دەدەمە بەر و وایان لێ دەکەم ببنە باوەڕداری ڕاستەقینە...

بەڵێ، هەرگیزاو هەرگیز بیرکردنەوەیەکی لەم چەشنە بە مێشکتدا گوزەری نەکردووە. بەڵام دەبێت دڵنیابیت لەوەی کە مەیل نەچوونت بەلای وەها بیرکردنەوەیەکدا، لە سایەی دامەزراندن و جێگیرکردنی ئێمەوەیە. خۆ ئێمە بۆ تەنها ساتێکیش دەست بەردارت نەبووین تا تۆ مەیلت بەلای بۆچوونێکی وەهادا بچێت...

مانایەکی تریشی ئەمەیە: تۆ هەر بە فیترەت و سروشتی خۆت بەتەنگ هیدایەتی خەڵکییەوەیت. ئەوەتا بەس لەبەر ئەوەی باوەڕناهێنن، وەختە دەستت بچێتە گیانی خۆت...

تۆیەك کە سینەت بۆ هەموو کەس کراوەیە... ئەوە بەزەیی و شەفەقەتە فراوانەکەتە کە وا دەخوازێت سینەت بەڕووی ئەوانیشدا بکەیتەوە. ئیدی تۆش بە دڵ و سینەیەکی ئاوەها و سۆز و شەفەقەتێکی لەم جۆرەوە، لەپێناو هیدایەتیاندا داواکارییەکەیانت قبووڵ دەکرد و دەستت نەدەنا بەڕوویانەوە و بەدەستی خاڵی لە دەرگانەی هیدایەت نەتدەگەڕاندنەوە. بەڵام خۆ ئێمە لە سەرجەمی هەستەکانتدا ئیستیقامەت و هاوسەنگیمان پێبەخشیویت. بەم شێوەیەش لە زیادەڕەوی و کەمڕەوی پاراستوومانیت، بۆی هەبوو زیادەڕەوی لە شەفەقەتدا مەیلت بەلای ئەواندا ببزوێنێت، بەڵام لە سایەی پارێزگاریماندا مەیلت بەلایاندا نەبزوا. چونکە شەفەقەت و بەزەییەکەت دارای هاوسەنگییە. زۆر باش دەزانی کە "لە چ کاتێکدا و بە چ پێوەرێك و بەرامبەر بە کێ شەفەقەت دەنوێنرێت؟" هەر بۆیە ئەوە تۆنیت کە سازش بۆ هزرێکی گومڕایانەی وا بکەیت کە میهرەبانییەکەت پێش میهرەبانی ڕەهای پەروەردگار بخات...

وتەیەك هەیە کە دەدرێتە پاڵ مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی و تیایدا دەڵێت: "وەرە! وەرە! هەرچییەك هەیت وەرە!" ئەم وتەیەی مەولانا، لە ڕووی ماناوە دروستە و لە ڕوانگەی سەرچاوەکەشیەوە چۆڕاوگی فەیزی ئاکاری موحەممەدییە (صَلَّیَ اللّٰه

عَلَيْهِوَسَلَّمْ). ئاخر پێغەمبەری خوا خاوەن دڵێکی وەها بوو، بێ هەڵاواردنی هیچ کەس خوازیاری ئەوەبوو کە خۆری درەخشانی هیدایەت هەموو دڵ و دەروونەکان ڕووناك بکاتەوە. خۆ ئەگەر تەواوی مرۆڤانی سەر ڕووی زەمین موسڵمان بووبوونایە و تەنها یەك دوو کەس مابایەتەوە لە دەرەوەی ئەم پەیامە ئیلاهییەدا، ئەوا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِوَسَلَّمْ) لەپێناو بوونە هۆکاری هیدایەتی ئەوانەشدا ئۆقرەی لێ دەبڕا و، بەس بە خاتری ئەوەی یەك دوو شتیان پێ بگەیەنێت، بێ چاو تروکان شانی دەدایە بەر هەموو جۆرە قوربانیدانێك. بەڵێ، ئەو خاوەن بنیاتە دڵییەی کە هەروەك دەروازەکانی ئاسمان سینەی کراوەبوو بۆ هەموان، ئەگەر جێگیرکاری و پارێزگاریی خوایی نەبووایە، لەوانەبوو ئەوانەشی لە سینەی بگرتایە کە تەنها جارێك وتویانە "لَاإِلَهَإِلَّااللهُ" و، بیخستنایەتە ژێر باڵ و چاودێری خۆیەوە.. بەڵام خوای باڵادەست هاوسەنگی بەخشیبووە هەست و نەستەکانی و خستبوویە ژێر پاراستن و چاودێری زاتی مەزنی خۆیەوە.. ئیتر ئەویش لە سایەی ئەمەدا هەرگیز نەکەوتووەتە هەڵەوە.

بڕگەی 'کەمێك مەیلت بەلایاندا دەچوو"ش ئەوە ناگەیەنێت کە مەیلت بەلایاندا چووە. ئاخر لە کاتێکدا کە هیچ ڕووداوێك لە ئارادا نییە "مُمكِن" بکات بە "واقِع"، ئیتر گەڕان بەدوای خاڵێکی لاوازی لەم جۆرە لە کەسایەتی پێغەمبەری سەروەرماندا، بەدهزری نەبێت چییە؟

خوای باڵادەست هەر لە ئەزەلدا ئەوی دامەزراو کردووە و پاراستویەتی، ئیتر ئەویش لە "لا یزال"دا هەرگیز توشی خلیسکان نابێت. چونکە بوونی ئەو، ئاوێتەی حەق و حەقیقەت و، هەڵسوکەوتەکانی پەرچین ڕێژی وەحی و، دڵیشی سەرڕێژی ڕەزامەندی پەروەردگاری بوو. دەی ئیتر گریمانەی ئەوەی کە پاژنە پێی وەها سوڵتانی سوڵتانانێك کە تەختی لە ئاسمانەکاندا داناوە و سروەتگای ئەوێیە، پریشکی پێ خلیسکانی بەرکەوتبێ، یان نەزانینی ئەوەیە کە پریشك چییە، یاخود

نەزانینی ئەوەیە کە تەخت دانان لە ئاسمانەکاندا واتای چییە. چی بڵێم، هەر ئەوەندەم لەدەست دێت بڵێم خوای گەورە ئیستیقامەت بەم چەشنە بیرکردنەوە پەست و نەوییانەش ببەخشێت!

چ جای سیاقی ئایەتەکە، واتە ئەو ئایەتەی کە لە دوای ئەم ئایەتانەوە دێت، بەئاشکرا و هەروەك ڕۆژی ڕووناك دەری دەخات کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە هیچ شێوەیەك مەیلی بەلایاندا نەچووە: ﴿وَإِن كَادُواْ لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا ۖ وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَـٰفَكَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (الإسراء : ٧٦) "بۆ ئەوەی لە زێدی خۆت وەدەرت نێن، ئەوەندەی نەمابوو تەنگت پێ هەڵبچنن و دەربەدەرت بکەن. ئیدی لە وەها بارێکدا لە دوای تۆ ماوەیەکی کەم نەبێ، نەدەمانەوە (زوو بە زوو بە بەڵایەکی سەخت لە ناومان دەبردن."

## ڕەفتاری سەروەرمان بەرامبەر هەژاران

یەکێکی تریش لەو ئاوڕلێدانەوە پڕ ستایشانەی کە لە بەرگی ئاگادارکردنەوەدایە، ئەو ئایەتەیە کە بە بۆنەی یەکێك لە سەردانەکانی سەرانی قوڕەیشەوە نازڵ بووە. ئەوەبوو سەرانی قوڕەیش هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا و وتیان: "لە کۆڕ و دانیشتنەکانتدا ئا ئەو مسکێن و نەدار و کۆیلانە دادەنیشن. ناکرێت ئێمە لە هەمان کۆڕدا لەگەڵ ئەوان دابنیشین. جا یا ئەوەتا ڕۆژێکی تایبەتمان بۆ تەرخان بکە، یان کاتێك ئێمە دێین، ئەوان لای خۆت دوور بخەرەوە."[1] ئیتر ئەم ئایەتە پیرۆزە بە بۆنەی ئەم ڕووداوەوە دابەزی:

---

١ مسلم، فضائل الصحابة ٤٥؛ إبن ماجة، زهد ٧. (تەواوی دەقی فەرموودەکە لە إبن ماجەدا هەیە.)

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (الأنعام : ٥٢)

"نەکەیت ئەوانە دەربکەیت کە بەیانیان و ئێواران لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و مەبەستیشیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە، جا خۆ لێپرسینەوەی ئەوان لەسەر تۆ و لێپرسینەوەی تۆیش لەسەر ئەوان نییە تا ئەوەی بە دەرکردنیان بچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە."

هەروەها ئەم ئایەتەی سورەتی "الكهف"یش ئاماژە بە هەمان ناوەڕۆك دەكات و دەفەرموێ:

﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴾ (الكهف : ٢٨)

"ئارام بگرە و خۆڕاگربە لەگەڵ ئەو ئیماندارانەدا کەوا بەیانیان و دەمەو ئێواران تەنها بە مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو و شادبوون بە جەماڵی، پەروەردگاریان دەپەرستن و لێی دەپاڕێنەوە. ئینجا با لەبەر ئارەزوو کردنی زینەت و ڕازاوەیی ژیانی دنیا (وەك ئەوەی ئارەزووی پەسەنکرانی بانگەوازەکەت بکەیت لەلایەن خەڵکییەوە) چاوت لەوانەوە نەترازێتە سەر کەسانی دی و گوێ بۆ قسەی ئەوانە ڕامەگرە کەوا دڵیانمان لە یادی خۆمان غافڵ کردووە و شوێن هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوون و هەرچی کاروباریان هەیە هەمووی بێ سەروبەرەیی و لە سنوور دەرچوونە."

هەر لەو ساتەوەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَالسَّلَام) دەستی کرد بە ڕاگەیاندنی

بانگەوازەکەی، چەندین کەس تەسلیمی بوون و هاتنە ڕیزی بانگەوازەکەیەوە، زۆرینەی ئەوانەش لە هەژار و نەداران بوون. خۆ ئاشکرایشە کە ڕژێمی کوفری ئەو ڕۆژگارە، هەژاری و نەبوونی بە ناتەواوی و نەنگی دادەنا. ئەمە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە ئاینێکی وەهاوە هاتبوو کە پایەداری و سەروەری تەنها بەتەقوا و لەخوا ترسانەوە بەستبووەوە.[1] بەگوێرەی فێرکارییەکانی ئەم ئایینە، شتێك نەبوو ناوی سەروەری دەوڵەمەند بێت بەسەر هەژاردا.

ئەوەتا پێغەمبەری سەروەرمان فەرموویەتی: "بەهەشت تامەزرۆی چوار کەسە."[2] ئەو چوار کەسەش هەر هەموویان هەژار بوون. عەممار هەژار بوو.. سەلمان هەژار بوو.. میقداد هەژار بوو.. هەروەها حەزرەتی عەلیش (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)هەژار بوو. هەموو کەس تامەزرۆی بەهەشت بوو و بەهەشتیش تامەزرۆی ئەم مرۆڤانە. دەتوت بەس بۆ ئەوەی بە دیداریان شاد بێت، پەتی چاوەڕوانی لە گەردنی ڕۆژەکان بەستووە و ڕایان دەکێشێت. ئەوانێك کە دڵیان تەژی بوو لە ڕێزی پەروەردگار و شەو و ڕۆژ یادی ئەویان دەکرد و هەمیشە وەك ئەوەی لە حوزووریدا بن وەها دەژیان. ئاخر چۆن پێغەمبەری خوا ئەو کەسانەی لە خۆی دوور دەخستەوە، لە کاتێکدا خوای گەورە ئەوانی لەسەر نزیکی بەرنامەڕێژ کردبوو.

پێغەمبەرێك کە لە بەرامبەر هەڵوێستێکی ئەبوذەر بەرامبەر بە بیلال کە پێی وتبوو: "ئەی کوڕی ژنە ڕەشەکە!" ڕووی کردبووە ئەبوذەر و پێی فەرموویبوو: "تۆ کەسێکیت هێشتا شوێنەواری سەردەمی نەفامیت تێدا ماوە."[3] ئینجا دوای سەرزەنشت کردنی، بەم وتە نەمرانەی ئامۆژگاری کردبوو:

---

١ بڕوانە: سورەتی الحجرات، ئایەتی ١٣.

٢ طبراني، المعجم الكبير ٢١٥/٦؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ١٤٢/١؛ هيثمي، مجمع الزوائد ٣٠٧/٩.

٣ بخاري، الإيمان ٢٢، أدب ٤٤؛ مسلم، الأيمان ٣٨.

”ئەو کەسانەی لەژێر فەرمانتاندا کار دەکەن براتانن. خۆتان چی دەخۆن و چی دەپۆشن، هەر لەوەش دەرخواردی ئەوان بدەن و هەر لەوەش پۆشتەیان بکەن. هەروەها ئەرکێکیان بەسەردا مەدەن کە لە توانایاندا نەبێت. خۆ ئەگەر داشتان بەسەریاندا، ئەوا هاوکارییان بکەن.“[1]

پێغەمبەرێك کە باڵی خاکی بوون و لەخۆبووردەییەکەی بە زەویدا دەخشا. کێ بیویستایە دەیتوانی بێ هیچ جۆرە نارەحەتییەك بچێتە حوزووری. لە ڕاستیدا ئەمانە کۆمەڵە بنەمایەك بوون کە لە ڕۆحیەتی ئاینەکەیەوە هەڵقوڵابوون. ئەی مەگەر دەوڵەمەند و هەژار، کۆیلە و ئاغا، فەرمانده و خزمەتکاری باوەڕداران هەر هەموو لە هەمان مزگەوت و لە هەمان ڕیزدا لە تەك یەك ناوەستن بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی بەندایەتی؟ دەی کەوابێ، چۆن دەبێت پێغەمبەری پایەبەرز کە نوێنەری ئەم ئایینەیە، کۆمەڵە کەسانێك لە حوزووری خۆی دەربکات بەس تەنها لەبەر ئەوەی هەژارن؟ ئەی هەر خودی خۆی نەبوو دەیفەرموو: ”خوایە گیان، بە هەژاری بمژێنە و بە هەژاری بممرێنە و لەگەڵ هەژارانیشدا حەشرم بکە.“[2] جا ئایا ڕێی تێدەچێت کەسێك ئەمە قسەی بێت و لەولاشەوە خۆی هەستێت بە تەراکردنی دۆستە نەدارەکانی؟! نا.. نەخێر، هەزاران جار نەخێر، پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) هیچ هەژارێکی لە حوزووری خۆی وەدەرنەناوە و کەسیشی لە کۆڕی خۆی دوور نەخستووەتەوە... بۆ ساتێکیش بێت شتی وا میوانی ئەندێشەشی نەبووە.

هەرچۆنێك بێت، دواجار ئەو پێغەمبەر بوو. بە هەمان ئەندازە پەرۆش و چاوەڕوانی هیدایەتی هەمووان بوو. لە فەرموودەیەکی "حسن" یاخود "ضعیف"دا هاتووە کە بۆ موسوڵمان بوونی حەزرەتی عومەر (رضِيَ اللهُ عَنْهُ) نزای کردووە و

---

١ بخاري، الإيمان ٢٢، عتق ١٥؛ مسلم، الأيمان ٤٠.
٢ ترمذي، زهد ٣٧؛ إبن ماجة، زهد ٧.

پاراوەتەوە. تەنانەت لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە دوعای بۆ ئەبوجەهلیش کردووە کە خۆی ناوی عەمری کوڕی هیشام بوو.[1] دوعاکەش بەم جۆرە بووە: ”خودایە ئیسلام سەربەرز بکە بە خۆشەویستترینی ئەم دوو پیاوە لە لات: عەمری کوڕی هیشام یان عومەری کوڕی خەتتاب.“ هەروەها دوعای بۆ حەزرەتی عومەریش کردووە و فەرموویەتی: ”خودایە، ئیسلام پشت ئەستوور بکە بە موسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتتاب.“[2]

دوور نییە وەك چۆن خوای گەورە چەندین حەقیقەتی داهاتووی پیشانی خۆشەویستەکەی دابوو، ئاواش ئەو فتوحاتانەی پیشان دابێت کە لەسەر دەستی حەزرەتی عومەر دەهاتنە دی. جا ئیتر لەبەر ئەوەی سەروەریشمان ئەمەی زانیوە، دوعای کردووە کە هەرچی زووترە بێتە ناو ئیسلامەوە و تاجی موسوڵمانێتیی لەسەر بنێت. یاخود بە فیراسەتە ناوازەکەی خۆی، لە ڕووخساری حەزرەتی عومەردا ئەوەی خوێندووەتەوە کە دەروونی بەڕووی ئیسلامدا کراوەیە و هەر لەبەر ئەوەش دوعای بۆ کردووە.

موسوڵمان بوونی گەورە پیاوانی قوڕەیشیش گەورەترین ئارەزووی پێغەمبەری خوا بوو. چەندین جار لە ماڵی خۆیدا میوانداری کردوون و خوانی بۆ ڕازاندوونەتەوە و هەوڵی داوە بچێتە دڵ و دەروونیانەوە. بەڵام هەموو جارێك بە نەرێنی وەڵامی ئەم خواستەی دراوەتەوە. کێ دەزانێت ئەم بازی بەختە، چەند جار بەسەر هەریەك لە سەرانی قوڕەیشدا سووڕاوەتەوە، کێش دەزانێت دەبێت چەند جار ئەو بەدبەختانە ئەو نازدارەیان فەرامۆش کردبێت.

وا ئێستاش پێشنیاری چاوپێکەوتنێکی لەوانەوە پێ گەیشتووە. هەواڵیان بۆ ناردووە و دەڵێن: ”دەمانەوێت چاومان پێت بکەوێت.“ تۆ بڵێی هەر بەڕاستی

١ ترمذي، المناقب ١٧؛ أحمد بن حنبل، المسند ٩٥/٢.
٢ إبن ماجة، مقدمة ١١؛ الحكيم، مستدرك ٨٣/٣؛ بيهقي، السنن الكبرى ٣٧٠/٦.

نییەتی هاتنە ناو ئیسلامیان هەبووبێت؟ ئەگەرچی هێشتا ئەوە ڕوون نەبوو، بەڵام با ئەگەری لە سەدا یەکیش بێت، پێغەمبەری خوا هەر ئومێدی پێی بوو. وەك چۆن پەرۆشی خۆی پیشاندا بۆ موسوڵمان بوونی حەزرەتی عومەر و، ئەو ڕووداو و پێشهاتانەش کە بە هاتنە ناو ئیسلامی ئەوەوە هاتنە کایەوە، سەلمێنەری ئەو ڕاستییە بوون کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ) چەندە پێکاویەتی، ئاواش، ئەگەر ئەو کەسانە بهاتنایەتە ناو ئیسلامەوە، هەرچۆنێك بێ فتوحاتی ئیسلامی زۆر جیاوازتر دەبوو.!

ئەوەندە هەبوو کە داخوازییەکەیان پێچەوانەی ڕۆح و کاکڵەی ئیسلام بوو. بۆیە ڕەنگە پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لەبەر ئەوە بۆیان خەفەتبار و دڵتەنگ بووبێت کە وا بە پێشنیارێکی لەو جۆرەوە هاتبوونە لای. چونکە ئەو پێشنیارەی ناڕاستەی کرابوو، ناڕاستەی سەرجەم پێغەمبەرانی پێشووش کرابوو. چۆن ئەوان پێشنیارێکی ناوایان ڕەت کردبووەوە، پێغەمبەری خواش ئاوا ڕەتی دەکردەوە. بەڵام نەشیدەتوانی بەر بە دڵتەنگییەکەی بگرێت کە وا چۆن لەپای لووتبەرزی و خۆبەزلزانینێکی پووچی بێ مانادا، پاڵیان بەو هیدایەتەوە دەنا کە تاوەکو بەردەرگاکانیان هاتبوو. ئیتر لەوەدا بوو کە پێغەمبەری خوا بەم خەسارەتمەندییەیان دڵتەنگ بێت کە ئەم ئایەتە دابەزی. ئایەتەکە دڵنەوایی دەکرد و پێی دەفەرموو: "خۆ تۆ بەرپرسیار نیت لە لێپرسینەوەیان."

بڕیاری سەروەرمان بەو جۆرە بوو کە هەژار و نەداران لە تەك خۆی دوورنەخاتەوە. بەڵام ئەوەش هەبوو کە لەپێناو بە هیدایەت شادبوونی ئەوانی تریشدا بەدووی ڕێگە چارەیەکدا دەگەڕا. داخۆ لەم بڕیارەیدا پێکابوویێتی؟ یەکسەر ئایەت دادەبەزێت و هەواڵی ئەوەی پێ دەدا کە لە بڕیارەکەدا پێکاویەتی. ئاخر ئەو سوور بوو لەسەر وەلا نەنانی دۆستەکانی. ئایەتەکەش وەك پشتگیرییەك هات و پێی دەوت هەژاران لای خۆت دەرمەکە.

یادخستنەوەیەك

پێم خۆشە لێرەدا سەرنجتان بۆ لای لایەنێکی تریش کێش بکەم:

لە قورئانی پیرۆزدا بە سەدەها ئەمر هەیە کە دوێنراو تیایاندا پێغەمبەر (صَلَّی اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمْ) و تەواوی ئیماندارانە. ئەم ئەمر و نەهییانە دەستەواژەگەلێکن کە هەریەکەیان بۆ خۆی ڕاگەیەنەری حوکمێکن. ئەگینا کۆمەڵە دەستەواژەیەك نین هەواڵی ئەنجامدرانی پێچەوانەی ئەوەی وتراوە بگەیەنن. بۆ نموونە، قورئانی پیرۆز ڕوو دەکاتە سەروەرمان و پێی دەفەرموێت: "نوێژ بکە، ڕۆژوو بگرە، زەکات بدە" هەریەك لەم ڕستانە، ڕستەی داخوازین. هەر بۆیە دروست نییە بەو چاوەوە تەماشا بکرێن کە کۆمەڵە یادخستنەوەیەك بن و هۆشیاری بدەنە سەروەرمان لەمەڕ بەجێ نەهێنانی ئەو ئەرکانەدا. ڕێك وەکو ئەمە، قورئانی پیرۆز ڕووی گوفتاری کردووەتە پێغەمبەرمان و فەرموویەتی: "هەژاران وەدەر مەنێ!" بەڵام خۆ ئەمە هیچ کات بە واتای ئەوە نایەت کە: "ئەوە بۆچی هەژارانت دەرکرد، یاخود دەریان دەکەیت!" تا ئەوەی واتایەکی وا بدات بەدەستەوە کە پێچەوانەی عیصمەت و بێگەردیی پێغەمبەری سەردارمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَیْهِ) بێت. بە واتایەکی دی؛ خۆ نیشانەی هیچ هەڵسوکەوتێکی پێچەوانەی ئەم ئەمرە لە پێغەمبەری خودا نەبینراوە تاکو وا دابنرێت ئەمرەکە لەسەر بناغەی ئەو نیشانەیە هاتووە. کەوابێ ئەم فەرمانە، فەرمانێکە بۆ پشتڕاستکردنەوەی دروستی ئەو بڕیارە هاتووە کە سەروەرمان لە دڵی خۆیدا دابووی. لە هەمان کاتیشدا هەم فەتانەت و هەم عیصمەتی ئەو نازدارە دەدات بەگوێی گشت لایەکدا و پیشانی چاوە کوێرەکانیشی دەدات...

ئەو شتانەی وتمان، لە ئایەتەکەی سورەتی "الکهف"دا ڕوونتر دەردەکەوێت. چونکە خوای گەورە لەم ئایەتەدا بە سەرداری هەردوو جیهان دەفەرمووێ: "لەگەڵ ئەوانەدا کەوا بە شەو و ڕۆژ یادی پەروەردگاریان دەکەنەوە تۆش صەبر بگرە." صەبر بە واتای ڕەفتار نەگۆڕین دێت. جا گەر بە ئەندازەی گەردیلەیەك

گۆڕانکاری لە ڕەفتاردا ڕوویدا، ئەوا بزانە صەبر سەری خۆی هەڵگرتووە و باری کردووە. بۆ نموونە؛ کەسێك لە پەرستشەکاندا زۆر ئارامگرە، ئەستەمە لە ئەنجامدانی ئەرکی بەندایەتی داببڕێت و چەندێك بزانێت ئەوەندە پەرستش ئەنجام دەدات. دیسانەوە یەکێکی تر بەرامبەر بە موصیبەت صەبر دەگرێت و ئەو موصیبەتەی تووشی بووە، ڕەفتارگۆڕکێی تێدا ناهێنێتە مەیدان و بە جۆرێك هەڵسوکەوت دەکات وەك ئەوەی هەر هیچ ڕووی نەدابێت. صەبرگرتن بەرامبەر بە گوناهیش بە هەمان شێوەیە. ئەوەتا بۆ نەکەوتنە ناو گوناهەوە پێویست دەکات مرۆڤ لەسەر حاڵەتی پێشووی بەردەوام بێت. کەوابێت، کاتێك بە سەروەرمان دوترێت "صەبر بگرە"، مەبەست لێی ئەوەیە کە: "لەسەر ئەو حاڵەی تێیدایت و ئەو بڕیارەی داوتە بەردەوام بە." ئەمەش ئەوەمان پیشان دەدات کە یەکەم ڕەفتاری پێغەمبەرمان (عَلَيْهِ الْصَّلَاةُ وَسَلَام) ڕەفتارێکە مایەی ڕەزامەندی خوای باڵادەستە. چونکە صەبر، ناونیشانی نوێکردنەوەی ڕێڕەو نییە، بەڵکو ناونیشانی دامەزراویی و مانەوەیە لەسەر ئەو ڕاستە ڕێیەی مرۆڤ لەسەریەتی.

بەم پێیە، لێرەدا ڕێزلێنان و ستایشی پێغەمبەر گیان هەیە و مزگێنی ئەوەی تێدایە کە ئەو کارەی پێی هەستاوە، لە لایەن خوای گەورەوە (جَلَّ جَلَالُهُ) بە دروست بینراوە و هەر دەڵێی موژدەی ئەوەشی دەداتێ کە: "ڕوو مەکەرە ئەوانەی دڵیان وابەستەی ژیانی دنیایە. خۆ تۆ هەر خۆت ڕوویان تێ ناکەیت. چونکە ڕووکردنە ئەوان، ئاسۆی تۆ تەماوی دەکات. ئەمە لە کاتێکدا کە تۆ پاکترینی پاکانی و جێیەك نییە بۆ تەمومژ لە ئاسۆی تۆدا."

ئەو بەم شێوەیە. هەر بەم شێوەیەش ماوەتەوە و هەر بەم پاکێتییەشیەوە گەڕاوەتەوە حوزووری پەروەردگاری. لە بەرامبەر گوناهدا بە جۆرێك پارێزگاری لە ڕاسترەوی خۆی دەکرد، ئەو ڕۆژەی لەدایك بوو چەندە پاك و بێگەرد بوو، ئەو ڕۆژەی وەفاتیشی کرد هەر لەنێو هەمان پاکی و بێگەردیدا بوو.

## هاوسەرگیری سەروەرمان لەگەڵ حەزرەتی زەینەب

دوژمنانی کۆن و تازەی دین، هاوسەرگیری پێغەمبەری خوایان لەگەڵ دایکی ئیمانداران، حەزرەتی زەینەب (رضيَ اللهُ عَنْها) کردووە بە بنێشتە خۆشەی سەر دەمیان و هەردەم ویستویانە لەم ڕێیەوە بوختان بۆ پێغەمبەری ئازیزمان هەڵبەستن. بەڵام لە هەر جارێکیاندا پریشکی بوختانەکانیان بە ڕووخساری خۆیاندا پرژاوە و تەنانەت پرژەیەکیشی بەر دامێنی پاکی پێغەمبەری ئازیزمان (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەکەوتووە.

قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە باس لەم بەسەرهاتە دەکات و دەفەرموێت:

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِيٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِيٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْاْ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾

(الأحزاب : ٣٧)

"یادی ئەوە بکەرەوە وەختێ دەتوت بەو کەسەی خوای گەورە نیعمەتی (هیدایەت و بوونە صەحابی رسول الله)ی پێ بەخشیوە و تۆش (بە مامەڵەی جوان و ئازادکردنی لە کۆیلایەتی) چاکەت لەگەڵ کردووە: هاوسەرەکەت لای خۆت بهێڵەوە و دەرهەق بەو لە خوا بترسە! بەڵام کە ئەمەشت دەوت، ئەو ڕاستییەت لە ناختدا دەشاردەوە کە بەدڵنیاییەوە خوای گەورە ئاشکرای دەکرد. (بەم هۆیەوە) لە خەڵکی دەترسایت (نەوەك کاردانەوەیەکی وایان هەبێت کە زیان بە ئیمانیان بگەیەنێت)، لە کاتێکدا ئەوە هەر خوای باڵادەستە کە شایستەی لێترسانە. جا کاتێك زەید پەیوەندی هاوسەرایەتی بەو ئافرەتەوە بڕی، ئێمەش (زەینەب)مان لە تۆ مارەکرد، تا (چی دی) لە بابەتی هاوسەرگیری لەگەڵ هاوسەری بەناو کوڕانیدا، دڵتەنگی و ناڕەحەتی بۆ ئیمانداران دروست

نەبێت لە پاش ئەوەی کە بەناو کوڕانیان پەیوەندییان لەگەڵدا دەپچڕن. فەرمانی پەروەردگار هەمیشە و هەردەم جێبەجێ کراوە."

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) زەیدی (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) زۆر خۆشدەویست. چونکە لە نێو هەمواندا تەنها ئەوی کردبوو بە کوڕی خۆی. حەزرەتی زەید ئەوەندە لە پێغەمبەری خواوە نزیك بوو، خەڵکی وەك کوڕی ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوا تەماشایان دەکرد. بەڵێ، ئەو خۆی فیدای ڕێی رسول اللّٰه کردبوو، پێغەمبەری خواش لە لای خۆیەوە دەروازەکانی خۆشەویستی خۆی بۆ خستبووە سەرپشت.

زەید (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کۆیلەیەکی ئازادکراو بوو. سەروەرمان ئازادی کردبوو و کردبووی بە کوڕی خۆی.. بە گوێرەی نەریتی ئەو ڕۆژگارەش، لابردنی سیفەتی کۆیلایەتی لەسەر حەزرەتی زەید و سڕینەوەی لە زیهنەکاندا، کارێکی مەحاڵ بوو. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، دەتوت درمە و بە هەموو لایەکی کۆمەڵگەدا پەلی کێشاوە و بنیاتی کۆمەڵایەتی کرۆشتووە. تەنانەت ئەگەر کۆیلەیەك ئازادیش بکرایە، هێشتا هەر تامی ئازادی تەواوی نەدەچەشت و وەك هاوڵاتی پلە دوو لە قەڵەم دەدرا. ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو ئەم بیر و بۆچوونە لە ڕیشەوە هەڵبکێشرێت و کۆمەڵگەش لەم نەخۆشییە ڕزگار بکرێت. جا ئیتر ئەم بابەتەش کە بەقووڵی پێغەمبەری خوای بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، چاوەڕێی چارەسەرێك بوو...

بەڵام چارەسەری چاوەڕوانکراو، دەبووایە لە زەمینەی کرداریشدا پەسەند بکرایە و کۆمەڵگەش پێشوازی لێ بکردایە. بۆیە دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بە شێوازێکی تەواو جیاواز لەو کەسانە نزیك دەبووەوە کە مۆرکی کۆیلایەتی لە ناوچاوانیان درابوو.

ئازادی زۆر گرنگ بوو. بەڵام پاراستنی ئەو تایبەتمەندییە هەرە بەنرخە و دەست پێوەگرتنی گرنگتر بوو.. کەسێك نەتوانێت ئازادی هەڵبگرێت، چەندێکیش

به ئازادی شاد ببێت، هێشتا هەر ناتوانێت وەك کەسێکی ئازاد بژی. ئەمریکا نموونەیەکی زیندووی ئەمەیە. ئەوەبوو کاتێك کۆیلەکان ئازاد کران و چاویان بە سەربەستی هەڵهێنا، ئەم کێشەیە بەهەموو تاڵیەکییەوە سەری هەڵدا و چارەسەری ڕاستەقینە ساڵانێکی زۆری خایاند. ئەو ڕۆژە، ئەو مرۆڤانەی کە تا ئەو کاتە بە هەڵمژینی هەوای ئازادی ڕانەهاتبوون، سەرجەمی ئەو شتانەی بۆیان دابین کرابوو، فرۆشتیان و دووبارە گەڕانەوە بۆ لای گەورە و خاوەنەکانیان. هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە تا ئەو ڕۆژگارە، هەلومەرجەکان بەگوێرەی زەمینەی لەبار بۆ ئازادی ئامادە نەکرابوون. نە تاکەکان لە لایەنی ڕۆحییەوە بۆ ئەم ئیشە ئامادەبوون، نە کۆمەڵگەش. لەبەر ئەوە دەرەنجامی چاوەڕوانکراوی نەدا بەدەستەوە.

کەچی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) لە لایەکەوە ئەوانی لە ڕووی ڕۆحییەوە لەسەر هزری ئازاد و بزاوتی ئازادی ڕادەهێنا، لە لایەکی تریشەوە کۆمەڵگەی ئامادە دەکرد و هەوڵی دەدا هەریەك لەم تاکانە بکات بە بەشێکی دانەبڕاوی کۆمەڵگە. ئەوەتا هەر یەك لەوان هەتا دوێنێ وەك کەرەستەی ناوماڵ دەبینرا، کەچی وا ئەمڕۆ هەریەکەیان بووەتە ئەندامێکی کۆمەڵگەکەی.

سەروەرمان بەدوای ئەو دەرفەتەدا دەگەڕا کە دواگورزی خۆی لەو زیهنییەتە بۆگەنە بدات کە لە بێخی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەدا ڕەگی داکوتیبوو. ڕاستە ئەمە کارێکی زۆر سەخت و دژوار بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) -وەك هەموو کارەکانی تری- ئەم کارەشی زۆر بەئاسانی ڕادەپەڕاند.

ئەو ئازادارە وەك چۆن بۆ سەختترین بەرەکانی جەنگ سەرەتا خزمە نزیکەکانی خۆی پێش دەخست، لێرەشدا هەمان شتی ئەنجام دەدا. ئافرەتێکی خانەدانی ئەسڵزادەی وەك حەزرەتی زەینەب، کە دەیکردە کچی پووری خۆی و خوشکی عبداللّٰه ی کوڕی جەحش، دەکردە هاوسەری کۆیلەی ئازادکراو زەید (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ).

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) هاموشۆی بەرْدەوامی ئەم ماڵە خزمەی خۆی دەکرد، کە دەیکردە ماڵە پووری. لە هەمان کاتدا ئەندامانی ئەم خانەوادەیە چەندین ساڵ بوو چاوەڕوانی داخوازییەك بوون لە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمْ). ئاخر چوونە ڕیزی هاوسەرانی پێغەمبەرەوە گەورەترین خەونی هەموو ئافرەتێك بوو. هیچ نامۆییەکیش لەمەدا نەبوو.

هەروەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا، کاتێك سەروەرمان ویستی لە حەزرەتی سەودە (رضيَ اللهُ عَنْها) جیا ببێتەوە، ئەو کەڵەئافرەتە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و تکای لێ کرد. ئەوەبوو ڕەزامەندی خۆیشی نیشاندا لەسەر ئەوەی کە سەرەکەی خۆی بدات بە حەزرەتی عائیشە. هەروەها ئەوەشی درکاند کە تاکە ئاواتی کۆچ کردنە بۆ ئەو دنیا وەك هاوسەری پێغەمبەر. هەموو ئەمانە کۆمەڵە قوربانیدانێك بوون لە پێناو مانەوە لەژێر نیکاحی پێغەمبەری خوادا (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ).[1] حەزرەتی عومەریش بەدرێژایی تەمەنی لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدا بوو ببێتە خزمی ئەم ماڵە موبارەکە. ئەوەبوو بۆ ئەم مەبەستە چووە داخوازیی حەزرەتی فاطیمەی دایکمان (رضيَ اللهُ عَنْها). بەڵام کە پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خاتوو فاطیمەی لە حەزرەتی عەلی (رضيَ اللهُ عَنْهُ) مارەکرد، حەزرەتی عومەر چاوەڕێ کردنی ئوم کەلثومی کچی حەزرەتی عەلی بۆ مایەوە. ئەو وەختەی ئەم ئافرەتە موبارەکە لە حەزرەتی عومەر مارەکرا، هێشتا لە تەمەنی منداڵیدا بوو. بەڵام ئەمە، ئەو خەونەی حەزرەتی عومەر بوو (رضيَ اللهُ عَنْهُ) کە دەیویست ببێت بە خزمی پێغەمبەری سەروەرمان. بەڵێ، تاکە مەبەستی حەزرەتی عومەر ئەوە بوو ببێت بە خزمی پێغەمبەر (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ).[2]

زۆر شتێکی ئاساییە پوورێك بیەوێت کچەکەی خۆی بدات بە برازاکەی و

---

١ بخاري، نكاح ٤٨؛ مسلم، رضاع ٤٧.
٢ إبن سعد، الطبقات الكبرى ٤٦٣/٨؛ إبن حجر، الإصابة ٢٩٣/٨-٢٩٤.

چاوەڕوانییەکی وای هەبێت. ئەمە سەرباری ئەوەی کە حەزرەتی زەینەب (رضيَ اللهُ عَنْها) لە هەموو ڕوویەکەوە شایستەی ئەوە بوو ببێت بە خێزانی پێغەمبەر. ڕەنگە ئەویش سەروەرمانی ویستبێت...

ئەوەبوو پێغەمبەری خوا چوو بۆ ماڵی پووری و فەرمووی: "هاتووم بۆ داخوازی زەینەب." ئەندامانی خێزان لەتاو بیستنی ئەم قسەیە وەخت بوو لە خۆشیدا باڵ بگرن. کەواتە ئەمە ئەو ساتەیە کە ساڵەهایە چاوەڕێی دەکەن. ئەوەتا پێغەمبەری خوا بووەتە داخوازی زەینەبە خاتوونی کچیان. خاوەن فیراسەتی ئەعظەم یەکسەر دەرکی بەوە کرد کە ماڵی پووری بەهەڵە لە داخوازییەکەی تێگەیشتوون. بۆیە بۆی ڕاست کردنەوە و فەرمووی: "من هاتووم بۆ ئەوەی زەینەب بۆ زەید بخوازم." هەموویان لەجێی خۆیاندا سڕبوون. خۆ ئەگەر داواکار پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) نەبووایە، ئەوا بێ یەك و دوو داواکە ڕەت دەکرایەوە. بەڵام خۆ لەوەدا نەبوون دەست بنێن بەڕووی داوای پێغەمبەری خواوە. ئیتر ئەم هاوسەرگیرییە، تەنها لەبەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەری خوا بوو، قبووڵ کرا و بەنابەدڵی خێزانێك پێکهێنرا. ئەوەندە هەبوو ئەو ئامانجەی کە لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەویسترا بهێنرێتە دی، هێنرایە دی.

خاتوونی ماڵ، ئافرەتێکی ڕەسەن و خانەدان بوو. شێوازی پێگەیشتنیشی هەر بەو جۆرە بوو. هەرچی حەزرەتی زەیدیشە (رضيَ اللهُ عَنْهُ)، هەر چەندە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوو، بەڵام لە تێڕوانینی ئەو سەردەمەدا، ئەو هەر کۆیلەیەك بوو کە لە دواییدا ئازادی بەدەست هێنابوو. ئەو لە بنەماڵەیەکی ڕەسەنی خانەدان و ئەمیش لە بنەماڵەیەکی ئاسایی، ڕاستییەکەی هەروا ئاسان نەبوو دانوویان پێکەوە بکوڵێ. ڕاستتر بڵێین، حەزرەتی زەید بەو فیراسەتەی خۆی کە بەسەر جیهانی مەعنادا دەیڕوانی، خۆی بە هاوشانی ئەم ئافرەتە نەدەبینی. لە حەزرەتی زەینەبدا دڵ و دەروون و ئیرادەیەکی تەواو جیاواز بوونی هەبوو.. مرواریییەك بوو، دەسنیشانکراوی

ئەوە بوو بە خانەی نبووەتدا هەڵبواسرێت.

حەزرەتی زەید سەبارەت بەم بابەتە چەندین جار چووبووە خزمەت پێغەمبەری ئازیز و خواستی جیابوونەوەیی لە هاوسەرەکەی عەرزکردبوو. بەڵام هەموو جارێك سەروەرمان پێی دەفەرموو: "خێزانەکەت لای خۆت بهێڵەرەوە و لەخوا بترسە." و دەیناردەوە؛ سەروەرمان تاکە مەبەستێکی هەبوو؛ ئەویش ڕیشەکەن کردنی نەریتێکی سەردەمی نەفامی بوو لە ڕێگەی ئەم هاوسەرگیرییەوە. بەڵێ، پێغەمبەری پێشەوامان بەم نیازەوە دەستی دایە ئەم کارە و بوو بە هۆکاری پێکهێنانی ئەم خێزانە. بەڵام نائاسوودەیی ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر باڵی دەکێشا بەسەر ئەو خێزانەدا، تا ئیدی کار گەیشتە ئەوەی جیابوونەوە بێتە ئاراوە. ئەگەر چی ئەدگارەکانی جیابوونەوە لە ئاسۆدا بەدەریشکەوتبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە کردەیی ئەوەی سەلماند کە دەکرێ کۆیلەیەك لەگەڵ ئافرەتێکی ئەسڵ زادەدا هاوسەرگیری بکات. ئاخر پێغەمبەری خوا پێشەوا بوو، هەموو ئەو شتانەشی پێشەوا وتبوونی و دەیوتن، دەبووایە لەپێشدا بەسەر خۆی و نزیکەکانی خۆیدا جێبەجێی بکردنایە. بە ویست و دانەبەری خوای گەورە، ئەم کارەش هەروا بوو. بەڵام وا ئێستا لە ئاسۆی وەحیدا، نیشانە بەراییەکانی ئەو ڕووداوانە دەرکەوتبوون کە سەرەنجامیان دژوار و تاقەت پڕووکێن بوو.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لەرێی ئاگادارکردنەوەی خوای گەورەوە دەیزانی کە ڕۆژێك دێت حەزرەتی زەینەب (رضِيَ اللهُ عَنْها) دەبێتە خێزانی خۆی. بەڵام لەبەر ئەوەی فەرمان نەدرابوو بە ئاشکرا کردنی، بۆیە هەر لە ناخی خۆیدا گلی دەدایەوە. بە دەربڕینەکەی دایکی ئیمانداران، حەزرەتی عائیشە (رضِيَ اللهُ عَنْها): "خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا بیتوانیایە شتێك لەو وەحیە بشارێتەوە کە بۆی هاتووە، ئەوا ئەو ئایەتەی دەشاردەوە کە تایبەت بوو بەم هاوسەرگیرییە."[١] بەڵێ،

١ بخاري، توحيد ٢٢؛ مسلم، الإيمان ٢٨٨.

هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا لەگەڵ دایکی ئیمانداران حەزرەتی زەینەب تا ئەو ڕادەیە لەسەر سەروەرمان قورس بوو. بەڵام لە توانای کێدا بوو مارەییەك بداتە دواوە کە هەر لە ئەزەلدا بەسترابوو؟ ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: زَوَّجْنَٰكَهَا "ئەومان لەتۆ مارەکرد." ئەم نیکاحە ڕاستەوخۆ لە لایەن خوای باڵادەستەوە بەسترابوو، شایەتەکانیشی هاوڕازی بڵندی ئاسمانەکان بوون. لەڕێی ئەم نیکاحە گرانکەوتەیەشەوە، خوای تەبارەك وە تەعالا حوکمێکی تری فێر دەکردین: "بەناو کوڕان، وەك کوڕانی ڕاستەقینە نین. گەر هاتو لە هاوسەرەکانیان جیابوونەوە، ئەوا ڕێگە دراوە بەوانەی کە لە حوکمی باوکیاندان، هاوسەرەکانیان بخوازن." ئەمە لە کاتێکدا لەسەردەمی نەفامیدا بەناو کوڕان، هەر وەك ڕۆڵەی ڕاستەقینە لەقەڵەم دەدران و لە حاڵەتی مردن یاخود تەڵاقدانی هاوسەرەکانیاندا، ڕێ نەدەدرا هاوسەرگیری لەگەڵ خێزانەکانیاندا بکرێت. دەبووایە ئەم نەریتەنەفامییەش بڕووخایە، هەر دەشڕووخا. بەڵام دەتوت پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خۆی بەتەنها شانی دابووە بەر داروپەردووی زەبەلاحی ئەو وێرانەیە.

لە پایە گرنگەکانی ئەم تاقیکردنەوە سەختە:

تۆ چاوێك لە بەختی دایکە زەینەبمان (رضيَ اللهُ عَنْها) بکەن، کە چۆن بە هەردوو هاوسەرگیرییەکەی بووە مایەی تێکشکانی دوو هزری بۆگەن و ناڕەوای سەردەمی نەفامی.

لە هەندێك لە تەفسیرەکاندا ڕووداوێکی هەڵبەستراو دەگێڕێتەوە:

گوایا ڕۆژێکیان سەروەرمان چاوی بە دایکە زەینەبمان کەوتووە... هەم لە کاتێکدا کە نیکاحی حەزرەتی زەید بووە. ئیتر لە بەرامبەر جوانییەکەیدا سەروەرمان فەرموویەتی: سُبْحَانَكَ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ. حەزرەتی زەینەبیش گوێی لەمە بووە و (تا دوایی). ئەم چەشنە بیر و بۆچوون و وتە زرق و باقانە کە لە

هەناوی ئیسرائیلییاتەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەداخەوە شوێنکاری خۆیان لەسەر هەندێ لە زانایانی ئەهلی سوننەش جێ هێشتووە. یەکێ لەوانە کە ناوی ناهێنم، موفەسسیرێکی گەورەشە. کەچی لە تەفسیرەکەیدا جێی بۆ دەربڕینێکی ئەوەندە قێزەون خۆش کردووە، مەگەر دوژمنێکی دین بتوانێت بوختانێکی وەها نەگریس هەڵبەستێت: عَادَ زَيْدٌ إِلَى الْبَيْتِ فَاطَّلَعَ "هەر کە زەید گەڕایەوە ماڵەوە، چاوی بەم دیمەنەدا تەقی.(!)" من لە لایەن خۆمەوە وەك گوزارشت لەو ڕێزەی بۆ ئەو موفەسسیرەمانم هەیە، ناڵێم "دەك زمانت وشك بێت!" بەڵام ئەوەی بە باوەڕەوە و بەدەستی ئەنقەست ئەم قسەیە دەکات، هەرکێ هەیە با ببێت، شایانی ئەوەیە زمانی وشك بێت.

**یەکەم:** ئاخر خۆ ئەوە یەکەم جار نەبووە کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) حەزرەتی زەینەب (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) ببینێت... حەزرەتی زەینەب هەر لەپێش چاوی خۆیدا گەورە بووبوو.

**دووەم:** ئەگەر پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ الصَّلَاةِ وَأَتَمُّ التَّسْلِيمِ) لە ناخیدا هێندەی گەردیلەیەك مەیلی بەرامبەر حەزرەتی زەینەب هەبوایە، ئیتر چ پێویستی دەکرد لە حەزرەتی زەیدی مارەبکات، دەچوو ڕاستەوخۆ بۆ خۆیی دەخواست!

**سێیەم:** لەسەریشەوە ئاماژەمان پێدا کە هەموو ئەندامانی ئەو خێزانە لە ناخی دڵیانەوە حەزیان دەکرد حەزرەتی زەینەب ببێت بە خێزانی پێغەمبەری خوا. داخۆ دەبێ چی ڕێگر بووبێت لەوەی سەروەرمان حەزرەتی زەینەب بۆ خۆی بخوازێت، تا وا ویستی لەگەڵ زەید (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) هاوسەرگیری بکات و خۆی مارەی نەکرد؟!

لەمەوە دەگەینە ئەوەی کە هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەگەڵ دایکی ئیمانداران، حەزرەتی زەینەب (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) بەتەواوەتی جێبەجێ کردنی فەرمانێکی ئیلاهی بووە. خوای گەورە (جَلَّ جَلَالُهُ) فەرمانی فەرموو و

پێغەمبەری خواش بەدەم فەرمانەکەوە چوو. هەموو ئەو قسە هەڵبەستراوانەی تریش کە دەکرێن، ئەو سیناریۆیانەن کە لەلایەن ڤۆڵتێرەکانی دوێنێ و گۆڵدزیەرەکانی ئەم دواییانە و کێ و کێی ترەوە ئامادە کراون. جگە لە بوختان و درۆش چ مانایەکی تریان نییە. پێغەمبەری خوا ئەو پێغەمبەری خوایە و، زەینەب ئەو زەینەبە و، زەیدیش ئەو زەیدە دەبێ و ڕووداوێکی وا ڕوو دەدات! پەنا بەخوا! ئای ئەمە چ بوختانێکی ترسناك و، درۆیەکی شاخدار و، جەهالەتێکی قەتمەری و، دژ بەدینییەکی جەرگبڕە!

دەبێت بە داخ و پەژارەوە ئەوەش بڵێم کە لەمڕۆدا ئەم کەرەستە هەڵبەستراوانە لە لایەن ڕۆڵبینەکانی لای خۆشمانەوە کە خۆیان کردووەتە داردەستی ئەوان، بەکاردەهێنرێن. پێم وایە ئەوەی پاڵی پێوەناون بۆ دەست دانە کردە و ورتەیەکی ئاوەها نزم و بێ ئەرزش؛ بە تەواوەتی هەستی نەفس نزمی و گرێی دەروونی سوکێتی و پەستییە. دەی ئیتر ئێمە بڵێین چی، هیدایەت لە دەستی پەروەردگاردایە. دەسا داواکارین خوای گەورە هیدایەتی ئەوانیش بدات.

"هەموو پێغەمبەرێك مەعصومە، پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) مەعصومی مەعصومانە." بەڵێ، ئەوەبوو بەم بڕگەیە لە دەروازەی ئەم بەشەمان دا و لێرەوە کەوتینە ڕێ. لەم نێوەندەشدا هەوڵماندا لەڕێی چەندین نموونەی بەرجەستەوە، پاك و بێگەردی و دوور لە گوناهیی ئەو نازدارە پیشان بدەین. بەڵام دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە مەعصومیەتی ئەو سەروەرە نازدارە، زۆر لەسەروو و ئەودیوی ئەوەوەیە کە ئێمە توانیمان باسی بکەین. قەد و باڵای توانستمان چەندە، هەر ئەوەندەمان بۆ ڕەخسا لە خزمەت ئەم بابەتەدا بین.

ئەوەی تا ئێرە باسمان کرد، ڕاستەوخۆ پەیوەندیدار بوو بە عیصمەت و عیففەتی پێغەمبەرەوە (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ)، واتە بێ گوناهییەکەی. ئێستاش پێم خۆشە

لە گۆشەیەکی ترەوە درەوشانەوەی خۆری عیصمەتی ئەو نازدارە بخەینە بەرچاو. ئەوانەی دەخوازن لە سۆنگەی زوهد و تەقوا و ترسی خودا و هەستی بەندایەتی و تێڕوانینی بۆ عیبادەتەوە مەعصومیەتی سەرداری هەردوو جیهان، بەتەواوی ڕەهەند و لایەنەکانیەوە ببینن و دەرکی پێ بکەن و پاشان چارۆکەی خۆیان لە دەریای ناسینی ئەو نازدارەدا هەڵبکەن، ئەوا لەسەریان پێویستە ئەم لایەنانەی خوارەوە بەباشی بزانن. هەریەك لەو لایەنانەش بۆ خۆی ناونیشان و دیوێکی تری وابەستەیی ئەو سەروەرەیە بە پەروەردگاری جیهانەکانی ئەودیوەوە.

## د) لە خزمەت زوهد و تەقوای حەزرەتدا

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) زاهیدترینی زاهیدان بوو. ئەو وەرەعەی ئەو هەیبوو -کە زبرە واتاکەی بریتییە لە هەڵهاتن لەو شتانەی گوماناوین- هیچ مرۆڤێکی تر لەو ئاستەدا نەیبوو. هەموو جموجووڵ و ڕەفتارەکانیشی بەگوێرەی ئەم ڕاستەهێڵە ڕێکخستبوو، ئەوەندە لە خوا دەترسا، دەتوت ئێستا دڵی دەوەستێت.. هێندە هەستیار، هێندە هەست ناسك بوو، زۆر کەم بوون ئەو ساتانەی فرمێسك لە چاوانیەوە ڕێچکە نەبەستێت و دڵە گەورەکەی لە ترسی پەروەردگاری نەکەوێتە لەرزە. کاتێك دەهاتە جۆش، دەتوت دەریایە و شەپۆل ڕێژانیەتی، کە دەشسرەوت، وێنەی زەریایەکی بێ بنی دەنەخشاند.

جا بۆیە دابڕینی بەرگی مەیلی دنیاخوازی و ئارەزوومەندیی گوناه بەسەر مرۆڤێکدا کە هەموو ژیانی لەم چوارچێوەیەدا بەسەر بردووە، لە ڕێگەی بەهەڵە لێکدانەوەی ئەو چەند ئایەتەی لەسەرەوە عەرزمان کرد، بێ ڕێزییەکی گەورە و تەفرەدراوییەکی ترسناکە. خوای گەورە (عَزَّوَجَلَّ) ئەوی لە ئاسمانێکی بڵندیی وەهادا جێگیر کردووە، دەنگی حەپە حەپەکانی سەرزەوی، هەرگیز نایگەنێ. بۆ

ئێوە وا دەزانن لەکوێدایە تا ئەوەی دامێنی بە پرژە قوڕی ئەوان لەکەدار ببێت؟!
لە ڕاستیدا زوهد و تەقوا و لەخوا ترسان و ئەوپەڕی مامەڵەی هەستیارانەی لە بەرامبەر گوناهدا، هەرگیز لەگەڵ مەیلی ئەنجامدانی گوناهدا یەکناگرنەوە.

ئێستاش با بە شێوەیەکی گشتی ئاماژە بۆ ئەم ڕەهەند و لایەنانەی بکەین:

**یەکەم:** زوهد؛ بریتییە لەو حاڵەتەی کە ئەگەر سەرجەمی دنیاشت بدەنێ پێی خۆشحاڵ نەبیت. وە ئەگەر هەموو دنیاشت لەدەست بچێت، نیگەران نەبیت. ئەم حاڵەتە لە پێغەمبەری خوادا لە لوتکەدا بوو. ئەگەر هەموو ماڵی دنیا هی ئەو بووایە، هێندەی دۆزینەوەی دەنکە جۆیەك دڵخۆشی نەدەکرد. خۆ ئەگەر هەموو دنیاشی بەجارێك لەدەست بچووایە، دیسانەوە هێندەی لەدەستدانی دەنکە جۆیەك نیگەران نەدەبوو. بەڵێ، دنیای ئاوەها بە دڵ تەرك کردبوو. بەڵام ئەم تەرك و وازلێ هێنانە، هەرگیز تەرکێکی کەسبی، واتە دەستبەرداربوونی دنیا نەبووە لەڕووی بەدەستهێنان و هەوڵ و کۆششەوە. چونکە ئەوە پێغەمبەری خوا خۆیەتی کە مەنتیقیترین و باشترین ڕێگاکانی بەدەستهێنان و قازانجمان فێردەکات. هەرگیز ڕێشی تێناچێت ئەو نازدارە لە ڕووی بەدەستهێنان و هەوڵدانەوە وازی لە دنیا هێنابێت یاخود هانی خەڵکی دابێت بۆ وەها کارێك. وازهێنان لە دنیا دەبێت بە دڵ بێت. جوانترین بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەو دەوڵەتەی ئیسلامە کە هەر پێغەمبەری خوا (صَلَّىَ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) خۆی بنیاتی نا و لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین و بەهێزترین دەوڵەتەکانی جیهان. هەروەك بیرمەندێکی ڕۆژئاوایی دەڵێت، لەو دەوڵەتە مەزنەوە کە رسول اللّٰه دایمەزراند، دواتر بیست و پێنج دەوڵەتی تەواو دروست بوو، کە هەر یەکەیان بۆ خۆی لە ئاستی ئیمپراتۆریەتێکدا بووە. دەوڵەتی عوسمانییش تەنها یەکێکە لەوانە. بەڵێ، پێویستە تێڕوانینی بنەڕەتی بۆ زوهد و دنیانەویستی ئەمە بێت.

رسول الله (صَلَّىَاللهُتَعَالَىٰعَلَيْهِوَسَلَّمْ) هەر لەو ساتەوەی هەنگاوی ناوەتە نێو هەرێمی نوورینی پێغەمبەرایەتییەوە، هەتاوەکو ئەو ساتەی کە دنیا بە هەموو جوانی و زرق و برقیەوە لە ژێر پێیدا ڕاخرا، تۆسقاڵێك ڕەفتاری خۆی نەگۆڕی. تەنانەت ئەوەی هەیبوو لە ماڵی دنیا لە کاتی هاتنە دنیادا، کاتێ وەفاتی کرد، ئەوەیشی نەمابوو. چونکە ئەوەی هەیبوو و نەیبوو هەر هەمووی بەخشیبووەوە و لەڕێی خوادا خەرجی کردبوو. تۆ تەماشایەکی ئەو شتانە بکەن کە لەپاش خۆی جێی هێشتبوون: تەنها چەند بزنێك و ئەو ژووورە بچووکانەش کە خێزانە پاکەکانی تێیدا دەمانەوە. گەرچی ئەوانیش هەر بە ماڵی موسوڵمانان دادەنران، چونکە کاتێك دایکانی موسوڵمانان وەفاتیان کرد، هەموو ئەو ژوورانەش خرانە سەر مزگەوت. هەروەك لای گشت زیارەتکارانی ئەو شوێنە موبارەکە زانراوە، ئەم ژوورانە ڕووبەرێکی هێندە بەرتەسکیان گرتووە، لە سووچێکی مزگەوتەکەدا جێیان بووەتەوە.[١]

## ١. نوستنی لەسەر حەسیر

ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) چووە حوزووری پێغەمبەری خوا و بینی وا سەروەرمان لەسەر ئەو حەسیرەیە کە هەمیشە لەسەری ڕادەکشا. شوێنەواری حەسیرەکە لەسەر ڕوومەتی موبارەکی دەرچووبوو. لە سووچێکی ژوورەکەدا پێستەیەکی خۆشکراو و لە سووچێکی تریشدا توورەکەیەکی بچووك کە چەند مشتەجۆیەکی تێدا بوو. ئەمە هەموو ئەو شتانە بوو کە لە ژوورەکەی پێغەمبەری خوادا هەبوون. حەزرەتی عومەر لە ئاست ئەم دیمەنەدا خۆی پێنەگیرا و دایە پڕمەی گریان. کاتێك پێغەمبەرمان لە هۆکاری گریانەکەی پرسی، حەزرەتی عومەر بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "یا رسول الله، ئێستا کیسرا و پاشاکان لە کۆشك و تەلارەکانیاندا لەناو پێخەفی پەڕ و نەرمونۆڵدا نووستوون، کەچی تۆ

١ بخاري، فرائض ٣؛ إبن كثير، البداية والنهاية ٣٠٦/٥.

(که بوونەوەران لەبەر حورمەتی تۆ بەدیهێنراون) لەسەر حەسیرێکی ڕەق و تەق ڕاکشاویت و شوێنەواری حەسیرەکەش لەسەر ڕووخساری موبارەکت دەرکەوتووە. هەر لەبەر ئەمە گریام.“ لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری خوا بە حەزرەتی عومەر دەفەرموێت: ”ئەی عومەر، مەگەر ناتەوێت دنیا بۆ ئەوان و ئاخیرەتیش بۆ ئێمە بێت.“[1] لە ڕیوایەتێکی تریشدا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) دەفەرموێت:

مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اِسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا

”من چیم داوە لە دنیا. من لە دنیادا وەك ڕێبوارێکم. ڕێبوارێك، لەژێر سێبەری دارێکدا وچانی دابێت و پاشان ئەو شوێنەی جێهێشتبێت و ڕۆیشتبێت.“[2]

ئەو بە فەرمانبەرییەکەوە هاتبووە دنیا. گیانی ژیاندنەوەی بە بەر هەست و بیری مرۆڤەکاندا دەکرد. وەختێکیش ئەرکەکەی سەرشانی تەواو دەبوو، دنیای جێدەهێشت و دەڕۆیشت. گریمانەکردنی ئەوەی کە مرۆڤێکی ئاوا بێباك لە دنیا حەزی بە لای چەند شتێکی دنیاییدا جوولابێت، لە ڕاستیدا لەو شتانە نییە کە ژیریی مرۆڤ پێی قبووڵ بکرێت. بەڵێ، ئەو هەرگیز مەیلی دنیای نەبووە، هیچ کاتیش چاوڕۆکەی بەڕووی لاداندا هەڵنەداوە...

## ٢. هەستیاری لە بابەتی صەدەقەدا

لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە کە: شەوێکیان پێغەمبەری خوا (صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَسَلَّمَ) تا بەرەبەیان خەوی لێ نەکەوت، هەر تەپاوتلی دەکرد و ئاخ و هەناسەی هەڵدەکێشا، سەرلەبەیانی خێزانە بەڕێزەکەی لێی پرسی: ”ئەی پێغەمبەری خوا، ئەرێ

١ بخاري، تفسير (٦٦) ٢؛ مسلم، طلاق ٣١.
٢ ترمذي، زهد ٤٤؛ إبن ماجة، زهد ٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٠١/١.

ئەمشەو نارەحەت بوون، وا خەفەتتان دەخوارد و خەوتان زڕابوو؟" سەروەرمان لە وەڵامدا فەرمووی: "کاتێك جێگام ڕاخست، لەسەر زەویەکە خورمایەکم دۆزیەوە و خواردم. دوایی بیرم کەوتەوە خۆ ئێمە خورمای سەدەقە و زەکات لە ماڵمان دانراوە. تۆ بڵێی ئەو خورمایە لەوانە بووبێت! بۆیە تا بەرەبەیان هەر بیرم لەوە دەکردەوە و بە خەیاڵی ئەوەوە تەپاوتلم دەکرد و خەوم زڕابوو."[1]

زەکات و صەدەقە بۆ ئەو حەرام بوو. بەڵام دەکرا ئەو خورمایە، لەو خورمایانەش بێت کە بە دیاری بۆی هاتبوون. بگرە ئەم ئەگەرەیان لەوی تریان بەهێزتر بوو. چونکە چ صەدەقە، چ زەکات لە خانەی ئەودا شەویان نەدەکردەوە و چۆن دەهاتن ئاواش دەبەخشرانەوە. ئێستا دەپرسین: ئایا هەرگیز ڕێی تێدەچێت مرۆڤێك کە لە بەرامبەر بچووکترین شتی گوماناویدا بەم شێوەیە هەڵسوکەوت بکات و ژیانی هەردەم لەنێو هەستیارییەکی لەم جۆرەدا بەسەر ببات، توخنی کارێك بکەوێت کە سوور بزانێت حەرامە؟! باشە کەی بووە ئیرادەیەکی لەم جۆرە لە ئاست کارێکدا سستی بنوێنێت کە بە دڵنیاییەوە بزانێت گوناهە؟! نەخێر، لە ئاست هیچ گوناهێکدا سستی نەنواندووە و ڕێی بە هیچ گوناهێك نەداوە دزە بکاتە دنیای ڕۆحیەوە. ڕۆح و ئیرادەی هەمیشە پاك و بێگەرد بووە. هەر وا ژیاوە و هەر واش بەرەو "رفیق الأعلى" بەرز بووەتەوە.

## ٣. "سورەتی هود پیری کردم"

جارێکیان حەزرەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) لە پێغەمبەری خوا دەپرسێت: "یا رسول الله، دەبینم تاڵی سپی کەوتووەتە سەرتان. هەر لەپڕێکا پیر بوون. خوا نەکا نەخۆشییەك شتێکتان هەیە؟" سەرداری هەردوو دنیاش وەڵامی دەداتەوە:

---

[1] أحمد بن حنبل، المسند ١٩٣/٢؛ حكيم، المستدرك ١٧/٢.

شَيَّبَتْنِي هُودُ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ "سورەتەکانی هود و الواقعة و المرسلات پیریان کردم."[1] ئاخر لە سورەتی هوددا پێی وترابوو: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ (هود : ١١٢) "چۆن فەرمانت پێ کراوە ئاوا ڕێك و ڕاست بە!" ئەم ڕاستڕەوی و ئیستیقامەتە، ئیستیقامەتێك بوو خوای باڵادەست خۆی بۆ خۆشەویستەکەیی کێشابوو. ئەو شتەش کە لێی داواکرابوو، پاراستنی ئەم ڕاستەهێڵە بوو...

سورەتی "المرسلات"یش باسی جیاکردنەوەی دەستە دەستەی دۆزەخی و بەهەشتییەکان و حاڵی پەرێشانی مرۆڤەکان دەکات کە چۆن لەتاو ترسناکیی دیمەنەکان وەختە بتۆقن. سورەتی "الواقعة"ش بە هەمان شێوە؛ ئەم گرۆیانە دەخاتە پێشچاو و نمایشی بارودۆخیان دەکات. جا ئیتر باس و دیمەنەکانی نێو ئەم سورەتانە، سامیان خستبووە دڵی ئەو نازدارەوە و پیریان کردبوو...

## ٤. ڕوانینی بۆ ئاخیرەت

ڕۆژێکیان یەکێك لە هاوەڵان لە ماڵی خۆیدا قورئانی دەخوێند. دەنگی قورئانەکە لە هەمان کاتدا لە دەرەوەش دەبیسترا. ڕێك لەو کاتەدا کە ئەم هاوەڵە گەیشتبووە ئایەتی:

﴿ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ۝ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴾ (المزمل : ١٢-١٣)

پێغەمبەری خوا بەوێدا تێدەپەڕی. لەناکاو ڕەنگی زەرد بوو و کەوتە سەر چۆك. دەتوت ئایەتەکان بەرۆکی ئەو ڕادوەشێنن. بەڵێ، تا ئەو ڕادەیە لە هەڕەشەی ئەم ئایەتانە ترسابوو.[2]

خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ) لەو ئایەتانەدا دەیفەرموو: "بێگومان ئێمە کۆت و

١ ترمذي، تفسير (٥٦) ٦.
٢ بيهقي، شعب الإيمان ٥٢٢/١.

زنجیر و دۆزەخمان ئامادە کردووە. هەروەها خۆراکێك کە لە گەروو دەگیرێت. ئەمە سەرەڕای سزای بەئێش و ئازار.“

لە ڕاستیدا ئەگەر کەسێك هەبێت پێویست نەکات خەم لەو ئایەتانە بخوات، ئەوە پێغەمبەری خوایە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ). بەڵام، ئەو وانەی ئەدەب و ڕێز و ڕەفتاری شایستەی بەردەم پەروەردگاری فێردەکردین...

## ٥. پێغەمبەری خوا لە ئاست نەزەری ئیلاهیدا

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بۆمان دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا پێی وتم: ”قورئانم بۆ بخوێنە!“ منیش وتم: ”یا رسول الله، ئاخر من چۆن قورئان بۆ تۆ بخوێنم لە کاتێکدا قورئان بۆ خۆت دابەزیوە!“ ئەویش فەرمووی: ”پێم خۆشە لە غەیری خۆیشمەوە گوێم لێبێت.“ ئیتر منیش دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی النساء، هەر ئەوەندەی گەیشتمە ئەو ئایەتی کە دەفەرموێت:

﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾ (النساء : ٤١)

یەکسەر پێغەمبەری خوا فەرمووی: ”بەسە، ئیدی بەسە!“ کە سەرم بەرز کردەوە، دەبینم وا پێغەمبەری خوا دەگری و بە خوڕەم فرمێسك لە چاوانی دەبارێ. هەنسکی وای دەدا، وەخت بوو دڵی لەت لەت ببێ و لەوە زیاتر بەرگە نەگرێت.[١]

ئایەتەکە وێنای یەکێك لە دیمەنە سامناکەکانی ڕۆژی دوایی دەکرد و دەیفەرموو: ”ئینجا دەبێ حاڵی ئەو خەڵکە چۆن بێ، کاتێك لە هەر ئوممەتێك شایەتێکمان هێنا و، تۆشمان هێنا بە شایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە.“

---

١ بخاري، فضائل القرءان ٣٣، ٣٥، تفسیر سور (٤) ٩؛ مسلم، صلاة المسافرین ٢٤٧-٢٤٨.

## ٦. بیرکردنەوە و تێڕامانی

دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائیشە (رضيَ اللّٰهُ عَنها) بۆمان دەگێڕێتەوە: شەوێکیان پێغەمبەری خوا پێی وتم: "ئەی عائیشە! ڕێم دەدەیت ئەمشەو پەرستشی پەروەردگارم بکەم؟" منیش عەرزم کرد: "زۆر پێم خۆشە لەگەڵتدا بم، بەڵام هەر شتێك تۆ پێت خۆش بێت، منیش پێم خۆشە."

ئەمجا پێغەمبەری خوا هەستا و دەستی کرد بە نوێژکردن. ئەو شەوە تا بەرەبەیان ئەم ئایەتەی خوێند و فرمێسکی ڕشت: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾ (آل عمران : ١٩٠) "بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند." کاتێك گزنگی بەیان دەرکەوت، حەزرەتی بیلال کە بۆ بانگ خوێندن هاتبوو، پێی وت: "یا رسول اللّٰه، بۆ ئەوەندە زۆر لە خۆت دەکەیت! خۆ خوای گەورە لە گوناهی بەر و دوات خۆش بووە." لە بەرامبەر ئەمەدا پێغەمبەری سەروەرمان پێی (صَلَّىَ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرمووی: أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً "مەگەر نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزار بم بەرامبەر ئەو خوایەی کە ئەو هەموو لوتف و چاکەیەی لەگەڵدا کردووم؟!"[1]

ئینجا وەرە بزانە بۆچی فرمێسك لە چاوانیەوە ڕێچکەی بەستبوو؟ ئەو، بەگوێرەی پێوەرەکانی خۆی، لەوە دەترسا کە نەتوانێت لەسەر دوا لوتکەی سوپاسگوزاری سەنگین بێت، هەر لەبەر ئەوەش دەگریا. دەپرسین: ئایا دەتوانن بیر لەوە بکەنەوە کە زاتێکی وا گوناه ئەنجام بدات یاخود مەیلی بە لای گوناهدا بچێت؟..

ئەو پێشەوا نازدارە، لە بابەتی ئەنجام نەدانی قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە و

---

١ إبن حبان، الصحيح ٣٨٦/٢. بۆ بینینی شێوەیەکی کورتتری فەرموودەکە، بڕوانە: بخاري، تهجد ٦.

نەکەوتنە ناو گوناهەوە چەندە هەستیار و تا چ ڕادەیەك وردبین بوویێت، لە بابەتی گوێڕایەڵی کردنی ئەمر و فەرمانەکانیشدا تا ئەو ڕادەیە هەستیار و وردبین و دەست لەسەر سنگ بووە. خۆ ئەگەر بەتەنها لەم گۆشەیەوە بڕوانینە پاکیزەیی و مەعصومییەتەکەی، لەو باوەڕەدام پێویست نەکات بەدوای هیچ بەڵگەیەکی تردا بگەڕێین.

لە ڕاستیدا لە توانای هیچ کەسێکدا نەبوو بتوانێت بەو جۆرە بژی کە ئەو دەژیا. لە پەرستشە تاکە کەسییەکانیدا لەگەڵ خۆیدا زۆر جددی و لە بەرامبەر نەفسیشیەوە زۆر توند بوو. وەك ئەوە وابوو هەموو ژیانی بەپێی عیبادەت بەرنامەڕێژ کرابێت.. دەتوت ساتێك نییە عیبادەتی تێدا نەکردبێت. کاتێکیش دەڵێین عیبادەت، ئەوا نابێت تەنها لە چوارچێوەی نوێژ و ڕۆژوودا سنوورداری بکەین. چونکە ئەو بە هەر کارێك هەستابایە، بە هەستی عیبادەتەوە پێی هەڵدەستا و، دەستی ببردایە بۆ هەر شتێك، گیانێکی پەرستش و بۆ خوابوونی دەکرد بە بەردا.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە شتێك بدەین؛ ئەوە بوو لە پەسنی ئەو زاتەدا دەستەواژەی "زاهیدی زاهیدان"مان بەکارهێنا. بەڵام دەبێت ئەوە لای هەموان ڕوون بێت کە ئێمە لەبەر ناتوانایی و کورتهێنیی هەگبەی وشەسازی پەنامان بردە بەر ئەو دەستەواژەیە. دەنا، وا پێویست بوو دەستەواژە و وشەیەکی تر لە پەسنی زوهدی ئەو سەروەرەدا بەکار بهێنین.

## ٧. چاپك بوونی لە خێردا

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تەشریفیان هاتە مزگەوت، ڕاستەوخۆ چووە پێش جەماعەتەوە و نوێژی دابەست. ئەوەندەمان زانی نوێژەکەی بڕی و بەپرتاو بەرەو خانەی بەختەوەری کەوتەڕێ. هێندە سەغڵەت بوو، ئەوەی

بیبینیایە وایدەزانی ئاگر کەوتووەتەوە و ئەمیش دەیەوێت بگاتە فریادی. ئەوەندەی نەبرد گەڕایەوە. بەڵام ئەمجارەیان سەغڵەتییەکەی ڕەوی بووەوە. ئەوجا چووە پێشەوە و پێشنوێژی بۆ کردین. لەپاش تەواوبوونی نوێژ، هاوەڵان پرسیاری ئەو سەغڵەتی و خرۆشانەیان لێکرد، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: "کەمێك لەمەوپێش هەندێك شتیان بۆ هێنام تا بەسەر هەژاراندا دابەشی بکەم، منیش لەبیرم چوو بیبەخشمەوە. ڕێك لەو کاتەدا کە نوێژەکەم دابەست، ئەوەم هاتەوە بیر. جا پێم خۆش نەبوو نوێژ بکەم و لە ماڵەکەمدا شتێکی وا هەبێت. بۆیە چووم بە عائیشەم وت بیبەخشێتەوە."[1] ئا بەمە دەوترێت زوهد، ئا بەمە دەوترێت ناسکی، بەمە دەوترێت تەقوا، هەر بەمەش دەوترێت پەیوەندی ئەو بە دنیاوە...

چەندین جار دنیا لەپێش چاویدا خۆی نواندوە و ویستوویەتی خۆی لا خۆشەویست بکات، بەڵام ئەو هەموو جارێك ڕووی لێ وەرگێڕاوە و بە پشتی دەست داوێتیە دواوە.[2]

## ٨. برسێتی و تینوێتیی چەند ڕۆژە

زۆر جاری وا هەبووە بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ پاروویەکی نەبردووە بۆ دەمی. بەدرێژایی ژیانی جارێك نەبووە تێری خواردبێت، جا با ئەو تێرخواردنە لە نانەجۆیەکی وشکی ڕەقهەڵاتووش بێت. چەندین مانگ بەسەریاندا تێدەپەڕی و لە ماڵەکەیدا ئاگرێك نەدەکرایەوە بۆ لێنانی چۆڕێك شۆربا.[3]

جارێکیان بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەتی دەکرد. لەپاش نوێژ، ئەبوهورەیرە (رضيَ اللهُ عَنْهُ) لێی پرسی: "ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ناساغی وا بەدانیشتنەوە

١ بخاري، الأذان ١٥٨؛ نسائي، سهو ١٠٤.
٢ بيهقي، شعب الإيمان ٣٦٥/٧؛ أبو نعيم، حلية الأولياء ٣٠/١.
٣ بخاري، رقاق ١٧؛ مسلم، زهد ٢٠-٣٦.

نوێژ دەکەیت؟" وەڵامی حەزرەت بە جۆرێك بوو دنیای پێ بێتە لەرزە: "ئەی ئەبوهورەیرە، چەندین ڕۆژە شتێکم دەست نەکەوتووە بیخۆم. برسێتی هێزی لەبەر بڕیوم و توانای ئەوەم نەماوە بەپێوە ڕابوەستم. لەبەر ئەوە بەدانیشتنەوە نوێژ دەکەم."

ئەبوهورەیرە دەڵێت: هەر کە گوێم لەمە بوو، خۆم پێ نەگیرا و دەستم کرد بە گریان. پێغەمبەری خواش لەتاو من ئاگای لە حاڵی خۆی نەما و کەوتە دڵدانەوەم: "مەگری ئەبوهورەیرە، مەگری! برسێتی ئێرە مرۆڤ لە سزای ڕۆژی دوایی ڕزگار دەکات."[1]

ئەو سەرکردە و پێشەوایەك بوو. لەنێو خەڵکەکەیدا برسیی چەند ڕۆژەی تێدا بوو. بۆیە دەبینی پێوەرەکانی ژیانی خۆی بەگوێرەی گوزەرانی ئەو جۆرە کەسانە ڕێکخستبوو.

لە ڕوانگەی ژیان و گوزەرانی ماددیەوە لە گشت شوێنکەوتووانی هەژارتر بوو.. بە ویستی خۆشی ئەم جۆرە ژیانەی هەڵبژاردبوو. خۆ گەر بیویستایە، ئەوا دەیتوانی ژیانێکی خۆشگوزەرانانە بەسەر بەرێت. ئەمە هەر هیچیشی تێنەدەچوو بۆ ئەو. گەر تەنها ئەو دیاریانەی هەڵبگرتایە بۆ خۆی کە بۆی دەهاتن و نەیبەخشینایەتەوە، ئەوا سەروزیادی ئەوە بوو کە لەو ڕۆژگارەدا خۆشگوزەرانترین ژیانی بۆ دەستەبەر بکات. بەڵام ئەو هەرگیز بیری بە لای شتی وادا نەچوو.

بە هیچ جۆرێکیش نابێت ئەمە وا لێکبدرێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی دەوری کە پەروەردەی دەستی خۆی بوون، پشتیان لە دنیا کردووە و بەجارێ دەستیان لێ شتووە. مەسەلەکە بەو شێوەیە نییە کە هەندێ لە زمان شوومەکان گرتوویانە بە دەمیانەوە و دەڵێن: "پارووە نان و عەبایەك." و لەم ڕێیەشەوە پێوەرێکی تایبەت بە پێغەمبەری خوایان کردووە بە بابەتی گاڵتە

١ أبو نعيم، حلية الأولياء ١٠٩/٧.

و توانج لێدان. به پێچەوانەوە هەر کەسێك بیەوێت دەتوانێت قازانج بکات و دەوڵەمەند ببێ و بەو ئەندازەیەی خوای گەورە فەرمانی کردووە زەکاتی لێ بدات و لەرێی خوادا بیبەخشێت. بەڵێ، هیچ کەس دژی قازانجێکی لەم جۆرە نییە.. بگرە بەدەستهێنانی قازانجی حەڵاڵ لەو شتانەیە کە ئیسلام خەڵکی بۆ هەڵناوە. لەگەڵ ئەمەشدا، وای پێویست دەکرد کە پێغەمبەری خوا و کۆمەڵە هاوەڵانی ڕیزی یەکەمی بازنە نوورانییەکەی، ڕاستگۆیانە و تا دوا هەناسە دەست بەو بەها و تێڕوانینەوە بگرن کە چەند نموونەیەکی بەرجەستەیمان لەسەرەوە عەرز کردن.. گەرنا، مەحاڵ بوو بتوانرێت سازگاری ڕۆح و باڵفتەیی دەروونی ڕۆژانی سەرەتای بانگەوازی ئەم کۆمەڵە، کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە گەشەسەندنی زیاتردا بوو و دەمێك بوو سنوورەکانی مەککە و مەدینەی تێپەڕاندبوو، بپارێزرێت. ئەم کۆمەڵە، کۆمەڵەیەك نەبوو جەستە و جیسمانییەت بێت و بەس. بەڵکو لە هەمان کاتدا کۆمەڵەی ڕۆح و دڵ و ئیرادە و ویژدانیش بوو. پێغەمبەری خواش هەوڵی دەدا کۆمەڵەکەی لەسەر ئەم پایانە و بەم بزوێنەرانە بەپێوە ڕاگیر بکات. هەر قوربانیدان و خۆبەختکارییەکی لەوان داوا کردبێت، سەرەتا خۆی پێی هەستاوە و بەوێنەی گشت بابەتەکانی تر، لەم بابەتەشدا بووبووە سەرمەشق و پێشەنگی شاگردەکانی. فەرموون ئێوە و تابلۆیەك لە کاریگەرترین نموونەکان:

کات نیوەشەو بوو، برسێتی تەنگی بە پێغەمبەری خوا هەڵ چنیبوو. بە جۆرێك، ئیتر خەویش نەدەچووە چاوانی. خۆ ئەگەر بیتوانیایە کەمێك چاوانی لێك بنێت، ئەوا با بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت، لەوانەبوو تۆزێك لەو ئازارە سەختەی برسێتی ڕزگاری ببوایە. بەڵام وا دیاربوو برسێتی نیازی نەبوو بەرۆکی بەربدات. لە ماڵ هاتەدەر و بەرەو لایەك کەوتە ڕێ. پاش کەمێك تارماییەکی بەرچاوکەوت. وا دەردەکەوت کەسێك بەرەو ڕووی بێت. سەرنجی خۆی دایە ئەو لایە، ناسییەوە.. ئەمە ئەو مرۆڤە بوو کە لە هیچ ساتێکی ژیانیدا لێی دوور نەکەوتبووەوە. چ لە

فکردا چ لە بزاوت و جوولەدا، هەمیشە هەر لە پەنایدا بووە. وا ئەمێستاکەش بەم نیوەشەوە و لەم گۆشە چۆڵەی مەدینەدا وەك ئەوە وابوو وادەی ژوانیان هاتبێت. بەڵێ، ئەو کەسە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو (رضيَ اللهُ عَنْهُ). پاش ئەوەی سەروەرمان سەلام لە یاری وەفاداری دەکات، ئینجا لێی دەپرسێت: "ئەی ئەبوبەکر! ئەوە بەم نیوەشەوە چی لە ماڵ هێناویتیە دەر؟" حەزرەتی ئەبوبەکر لەتاو بینینی پێغەمبەری خوا دەردەکەی خۆی هەر بیر نەمابوو. جا خۆ ئەو هەمیشە هەر وابوو. ئەی ئەوە نەبوو لەپێناو بەرگری کردن لە نازدارەکەی دڵی، ئەوەندە لێدانی خوارد تا ئەوەی لە هۆش خۆی چوو.. ڕۆژێکی ڕەبەق لەو حاڵەدا مایەوە. هەر کە چاویشی هەڵهێنا، یەکەم شتێ کە لە زاری دەرچوو، ئەم چەند وشەیە بوو: "پێغەمبەری خوا چی بەسەر هات؟" لە بەرامبەر ئەمەدا، دایکی تووڕە بوو و وتی: "وا خەریکە دەمریت، کەچی هێشتا دڵت هەر لای ئەوە؟!"[1] ئاخر نەیدەزانی ئەبو بەکر ئەو کاتە دەمرد کە دڵی لای ئەو نەبووایە. لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا سەرچاوەی ژیانی بوو. وا ئێستاش جوودایی ئازیز ئۆقرەی لێ بڕیبوو و هەستێکی نادیار بەرەو ئەوێ دابوویە بەر. ئەوەبوو لە وەڵامی پێغەمبەری خوادا وتی: "برسێتی قوربان! لە ماڵەوە شتێکم دەست نەکەوت بیخۆم، خەویشم لێ نەدەکەوت، وام بە باش زانی بێمە دەرەوە." بڕوانن، دنیای ئەمیش هەمان دنیایە..!

ڕاستەوخۆ بەدوایدا وتی: "باوك و دایکم بە قوربانت بن یا رسول اللّٰه. ئەی تۆ بۆ لە ماڵ هاتوویتە دەر؟" وەڵام هەمان وەڵام بوو. پێغەمبەری خواش هەر لەبەر برسێتی لە ماڵ هاتبووە دەر.

ڕێك لەو ساتەدا تارماییەکی تریش بەدەرکەوت. ئەو پیاوە باڵابەرز و بەویقارە، هەر دیاربوو کە حەزرەتی عومەرە. ئێ خۆ هەر دەبوو تابلۆکە پڕ ببێتەوە و پارچەکانی جێی خۆیان بگرن. ڕاستە حەزرەتی ئەبوبەکر لە لای ڕاستی ئازیزەوە

١ إبن كثير، البداية والنهاية ٣/٣٠.

بوو؛ بەڵام خۆ هێشتا هاوڕازە هەمیشەییەکەی دەستەچەپی دیار نەبوو. دەتوت بۆ ئەوەی تابلۆکە بە نیوەناچڵی نەمێنێتەوە، ئەویش بە هەڵەداوان هاتووە. بەڵێ، ئەو کەسە بەشان و شەوکەتەی بەرەو لایان دەهات، حەزرەتی عومەر بوو (رضيَ اللهُ عَنْهُ). وەختێ چاوی بەم دوو دۆستە خۆشەویستەی کەوت، ئەویش سەری سووڕما و نەیدەزانی چی ڕوویداوە. سەلامی کرد و وەڵامی درایەوە. ئینجا پێغەمبەری خوا هۆکاری هاتنە دەرەوەی حەزرەتی عومەری پرسی. ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە: "برسێتی ئەی پێغەمبەری خوا، برسێتی لە ماڵ هێناومیەتە دەر."

لەو کاتەدا پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) هاوەڵی بەڕێز "ئەبولهەیثەم"ی هات بە بیردا، ماڵیان هەر لەو نزیکانە بوو. ڕەنگە ڕۆژەکەشی لە باخەکەیدا چاوی پێی کەوتبێت. هەر هیچ نەبێت هەندێك خورمای پێشکەش دەکردن و ژانی برسێتییەکەیان دەڕەوییەوە. بۆیە فەرمووی: "وەرن با بچین بۆ لای ئەبولهەیثەم."

ئەوەندەی نەبرد خۆیان لەبەردەم ماڵی ئەبولهەیثەمدا دیتەوە. ئەبولهەیثەم (رضيَ اللهُ عَنْهُ) و هاوسەرەکەی نوستبوون. منداڵێکی بچووکیشیان هەبوو کە تەمەنی پێنج شەش ساڵانێك دەبوو. سەرەتا حەزرەتی عومەر (رضيَ اللهُ عَنْهُ) لە دەرگای دا، بە دەنگە گوڕ و بەتینەکەی خۆیەوە بانگی کرد: "ئەبالهەیثەم!" نە ئەبولهەیثەم و نە هاوسەرەکەشی گوێیان لەم دەنگە نەبوو، بەڵام یەکێك هەبوو گوێی لێبێت. ئەو ڕۆڵە وردیلانەیەی لە شیرینی خەودا بوو، لەپڕ لە جێگەکەی ڕاپەڕی و بە باوکی وت: "بابە هەستە، حەزرەتی عومەر هاتووە." ئەبولهەیثەم (رضيَ اللهُ عَنْهُ) وایزانی ڕۆڵەکەی خەونی بینیوە، بۆیە پێی وت: "بنوو ڕۆڵە گیان، بەم نیوەشەوە حەزرەتی عومەر ئیشی چییە بێرە!" منداڵەکە بەناچاری چووەوە سەر جێگەکەی. کاتێك بۆیان دەرکەوت دەرگا ناکرێتەوە، ئەمجارەیان حەزرەتی ئەبوبەکر بە دەنگە ئارامی بەخشەکەی خۆی بانگی کرد: "ئەبالهەیثەم!" منداڵە دیسانەوە ڕاپەڕی و هاواری کرد: "باوکە، حەزرەتی ئەبوبەکر هاتووە." کەچی باوکی دیسان خەواندییەوە. بەڵام

دواهەمین دەنگ، دەنگێك بوو تەنانەت مردووانی گۆڕستانیشی هەڵدەستاندەوە. بەڵێ، ئەوە دەنگی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ ٱلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بوو. هەر کە بانگی کرد: ”ئەبالهەیثەم!“ ئیدی منداڵە وەك تیرێك لە کەوان دەرچووبێ، ئاوەها دەرپەڕی. لە لایەك بەرەو دەرگاکە ڕای دەکرد، لە لایەکی تریشەوە بانگی لە باوکی دەکرد و دەیوت: ”بابە گیان هەستە، پێغەمبەری خوا هاتووە.“

ئەبولهەیثەم (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) نەیدەزانی چی ڕوویداوە. دەمودەست بەرەو دەرگاکە ڕایکرد. باوەڕی بە چاوەکانی نەدەکرد. ئا لەم وەختەی شەودا، سوڵتانی سوڵتانان تەشریفیان هێنابووە خانەکەی. ڕاستەوخۆ فەرمووی لێکردنە ژوورەوە و گیسکێکی بۆ دان بە زەویدا. ئەمە شەرەفێك بوو کە لەوانەبوو مرۆڤ لە ژیانیدا تەنها یەك جار بە نسیبی بێت. خۆشترین ساتەکانی ژیانی بوو. گەر ڕۆحی خۆیشی پێشکەش بکردنایە هێشتا هەر کەم بوو. خورمای هێنا، شیری هێنا، گۆشتی هێنا و خستیە بەردەم ئەم میوانە ئازیزانەی...

ئەوانیش ئەوەندەیان خوارد کە برسێتیەکەیان بشکێنێت. پاشان لێزمە ئەسرینی چاوانی سەروەرمان سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بە داباریین. ئینجا لەو لێوانەیەوە کە مەودا و قووڵییەکی تایبەتی دەبەخشییە یەکە بە یەکەی ڕووداو و پێشهاتەکان، ئەم چەند وشەیە هاتنەدەر:

”سوێند بەخوا سبەی دوارۆژ لەسەر ئەم نیعمەتانە حەق و حیسابتان لەگەڵ دەکرێت.“ لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ (التكاثر : ٨) ”پاشان سوێند بەخوا لەو ڕۆژەدا دەربارەی هەموو ناز و نیعمەتەکانی دنیا لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێت.“

جا ئیتر ئەمە ئەو بوو... ئەو مرۆڤە نایابە بێ وێنەیەی کە ژیانی لە چوارچێوەی ئەم پێوەرە ورد و قووڵانەدا بەسەر دەبرد. هەوڵدانێك بۆ دۆزینەوەی

لادان لە ژیانی ئاوەها مرۆڤێکدا، یان قین و نەفرینە، یان کەللەڕەقی و نەفامییە. حەزرەتی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) کە یەکێك بوو لە نزیکترین هاوەڵەکانی، بەم جۆرە باسی لایەنی زوهدی ژیانی ئەو سەرورەمان بۆ دەکات: "سوێند بەخوا جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوام دیوە لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە برساندا سکی خۆی گوشیوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەنکێك خورمای دەقەلی دەست نەکەوتووە بیخوات کە خراپترین جۆری خورمایە."[1]

لە کاتێکدا داوای لە هەرکێ بکردایە ڕازاوەترین و دەوڵەمەندترین سفرەیان دەخستە خزمەتی. جا چ پێویستی بەمە دەکرد؟ ئەو دیاریانەی بۆی دەهات، بە ڕادەیەك بوو بەشی ئەوە بکات هەموو ڕۆژێك خۆی و خاووخێزانی خۆشترین ژیان بەسەر بەرن. بەڵام ئەو چی بهاتایەتە بەردەست، دەیبەخشییەوە و هیچی بۆ بەیانی و دوو بەیانی نەدەهێشتەوە.[2]

کاتێکیش لێیان دەپرسی بۆچی سوود لە ناز و نیعمەتەکانی دنیا وەرناگریت، بەم شێوەیە وەڵامی دەدانەوە: "چۆن بیر لە سوود وەرگرتن لە نیعمەتەکانی دنیا بکەمەوە، لە کاتێکدا وا ئیسرافیل کەرەناکەی بە دەستەوەیە و چاوەڕێی فەرمانی پەروەردگاریەتی. جا ئیتر کەسێك کە لەناو بارودۆخێکی وەهادا بێت، چۆن دەکرێت هەروا و بێ هیچ پێوانە و کێشانەیەك سوود لە نیعمەتەکانی دنیا وەربگرێت؟"[3]

## هـ) خاکێتیی سەروەرمان

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تا بلێی مرۆڤی تەوازوع و خاکێتی بوو. ئاشکراشە نیشانەی مەزنی لە مەزناندا تەوازوعە و، نیشانەی بچووکیش لە

١ مسلم، زهد ٣٦؛ إبن ماجة، زهد ١٠.
٢ بخاري، بدء الوحي ٥-٦، زكاة ٥٠، رقاق ٢٠، صوم ٧؛ مسلم، زكاة ١٢٤، فضائل ٥٠.
٣ ترمذي، القيامة ٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٣٢٦/١، ٧/٣.

بچووکاندا لووتبەرزی و خۆ بەزلزانییە.[1] ئەو بە ڕێژەی خاکێتییەکەی، لە گەورە بووندا بوو. بەڵێ، ئەو مرۆڤێکی مەزن بوو، هەر بۆیەش خاکی بوو. ئەوەتا دەیفەرموو: مَنْ تَوَاضَعَ لِلّٰهِ رَفَعَهُ اللّٰهُ، وَمَنْ تَكَبَّرَ وَضَعَهُ اللّٰهُ "هەر کێ لەبەر خوا خاکێتی بنوێنێت، خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە. هەر کێش خۆی بەزل بزانێ، خوای گەورە زەلیل و ڕیسوای دەکات."[2] ئەمە وتەی ئەو سەروەرە خۆیەتی و لە ژیانیشیدا بەجوانی ڕەنگی دابووەوە. هەموان تەماشای خاکێتی و خۆنەویستیی فراوانی ئەویان دەکرد و تێدەگەیشتن کە گەورەیی و مەزنی چییە.

هەمیشە خوای باڵادەست خۆبەزلزان و لووتبەرز و فیزلێدەرانی بردووە بە ناخی زەویدا. ئەوە قارون، ئەوە ثەعلەبە، ئەوە فیرعەون، ئەوە نەمروود و ئەوەش هەموو شەددادەکان!..

ئەوەشی خاکێتی نواندبێت و خۆی بەکەم گرتبێت، بەرزی کردووەتەوە. ئەوە موسا (عَلَيْهِ السَّلَام)، ئەوە عیسا (عَلَيْهِ السَّلَام)، ئەوە ئیبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَام) و ئەوەش حەزرەتی محمد المصطفى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّم)...

خۆ بەکەم زانین و خاکی بوونەکەی پێغەمبەری خوا لە ئاستێکدا بوو، مرۆڤی سەرسام دەکرد. ئەو بەندە و پێغەمبەری خوا بوو. شەو و ڕۆژ سەری لە سوجدەدا بوو و عیبادەتی خوای گەورەی دەکرد، وەختێك عیبادەتیشی دەکرد، میانڕەویی خۆی دەپاراست و دەیفەرموو: سَدِّدُوا وَقَارِبُوا "لە ئیستیقامەت لامەدەن، میانڕەوی بپارێزن و بەردەوام هەوڵ بدەن لە ئیستیقامەت نزیك ببنەوە."[3] زیادەڕەوی و کەمڕەوی با لە عیبادەتیشدا بێ، ڕێچکە و ڕێبازی پێغەمبەری خوا نییە. چونکە پێغەمبەری خوا

---

1 ، بریسکەکان.
2 مسلم، البر ٦٩؛ ترمذي، البر ٨٢، طبراني، المجمع الأوسط ١٤٠/٥. (دەقی فەرموودەکە لە "المجمع الأوسط"ەوە وەرگیراوە.)
3 بخاري، الإيمان ٢٩؛ مسلم، صفات المنافقين ٧٨.

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بە تەواوی مانا مرۆڤی میانڕەوی و ئیستیقامەت بوو. مەگەر ئیستیقامەت هەر ئەو ڕێیە نییە کە ئیماندار لە پێنج فەرزەی نوێژدا لە خوای گەورە داوای دەکات؟ ئەو ڕاستەڕێیەی کە ڕێبازی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانە. ئەوانەی دەیانەوێت لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ ئەو زاتانەدا بن و هاوبەشی کۆڕیان بن، ئەوا پێویستە لە دنیادا لەسەر ئەو ڕێیە بن کەوا ئەوانی لەسەر بوون.

ڕۆحی دین سانایی و ئاسانکارییە. ئەو کەسەشی قورسی دەکات، سەرەنجام خۆی دەبێت بە ژێرییەوە و کارێك دەکات دین ببێت بە بارستاییەك لە ئەمر و نەهیی تاقەت پڕووکێنی وا کە ژیان لەگەڵیدا مەحاڵ بێت. لە کاتێکدا ئەو دینەی لەنێو بازنەی ئیستیقامەتدا ژینی مرۆڤەکان ڕەنگڕێژ دەکات، دینێکە سەرتاپا ئاسانی و یەکپارچە ساناییە. لە فەرمایشتێکی دیکەشدا بەم شێوەیە هاتووە: إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلَّا غَلَبَهُ "گومان لەوەدا نییە کە ئەم دینە ئاسانکارییە. هەرکێش ئەم دینە قورس و دژوار بکات، ئەوا خۆی لەژێریدا دەگلێت."[1]

جا ئیتر پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دینداری چۆن کردبێت و بە چ شێوەیەکیش داوای کردبێت، ئەوە ئەو تەرزە دیندارییەیە کە لە سنووری وزەی مرۆڤدایە و توانای بەسەریدا دەشکێت.

وَاعْلَمُوا أَنَّهُ لَنْ يَنْجُوَ أَحَدٌ مِنْكُمْ بِعَمَلِهِ

"بزانن کە هیچ کام لە ئێوە بەهۆی کردەوەکانیەوە دەربازی نابێت."[2]

ئەگەر کەسێك شەو و ڕۆژیش بەندایەتی بکات و هاوشێوەی ئەسوەدی کوڕی یەزیدی نەخەعی و مەسرووق و طاووسیش بێت لە عیبادەتدا، ڕەنگە هێشتا ئەم کردەوانە بەس نەبن بۆ ڕزگار بوونی.

---

١ بخاري، الإيمان ٢٩؛ نسائي، الإيمان ٢٨.

٢ بخاري، رقاق ١٨، مرضع ١٩؛ مسلم، صفات المنافقين ٧١-٧٣، ٧٥، ٧٦، ٧٨؛ إبن ماجة، زهد ٢٠.

وەختێك هاوەڵان ئەو فەرموودەیەی سەرەوەیان بیست، یەكسەر خەیاڵیان بۆ پێغەمبەری خوا چوو. ئاخر چونكە ڕەوشی پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هەم پێوەر بوو بۆ ئەوان، هەمیش سەنگی زامنی و دڵنیایی. بۆیە دەستبەجێ لە چارەنووسی پێغەمبەری خوایان پرسی: وَلَا أَنْتَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ "تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا (ناتوانیت بە كردەوەكانت ڕزگارت ببێت)؟"

جا وەرە بڕوانە لەخۆبووردەیی و خاكێتی.. بڕوانە ڕەفتارێك، گەرەك بێت بەندە لە خزمەت پەروەردگاریدا بینوێنێت.. گوێ بدەرە وەڵامێك، سەرسامكەر و هاوشانی گەورەییەكەی بێت: وَلَا أَنَا إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللّٰهُ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ "بەڵێ منیش، مەگەر ئەوە نەبێت خوای گەورە بە ڕەحم و فەزڵی خۆی دامبپۆشێت.."[1]

ئەوەبوو باسی خاكێتیی و خۆ بەكەم زانینمان كرد. جا وەك بینیتان، خۆ بەكەم زانی و خاكێتییەكەی تا ئەو ڕادەیە قووڵ و ڕەگ داكوتاو بوو.

پێم خۆشە بەر لەوەی بچینە سەر بڕگەیەكی تر لە بڕگە بۆن خۆشەكانی ژیانی ئەو نازدارە، كە ئەویش قووڵی عیبادەتەكەیەتی، جارێكی تر وەبیری هەموو لایەكی بهێنینەوە كە ئەو سەروەرە نموونەیەكە بۆ خاكی بوون و خۆنەویستی:

لە فەرموودەیەكی شیریندا دەفەرمووێت: شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي "شەفاعەتەكەم بۆ كەسانێكە لە ئوممەتەكەم كە گوناهی گەورەیان ئەنجامداوە."[2]

خوای گەورە (جَلَّ وَعَلَا) مافی شەفاعەتی ئەو سەروەرە لە ڕۆژی دواییدا بەو شێوەیە دەنرخێنێت. جا مەگەر هەموومان بە ئاواتی ئەوەوە نین؟ گوناهی بێ سنوورمان ئەنجامداوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دیسانەوە دان بەوەدا دەنێین كە كۆیلەی گەردنبەندی هەمیشەیی ئەوین و داوكارین ئێمەش بخاتە ژێر سایەی شەفاعەتەكەیەوە.

---

١ بخاري، رقاق ١٨، مرضع ١٩؛ مسلم، صفات المنافقين ٧١-٧٨.
٢ أبو داود، سنة ٢٣؛ ترمذي، القيامة ١١.

ڕاسته گوناهبارین، بەڵام هەرگیز سەری بەندایەتیمان بۆ کەس نەوی نەکردووە. گەر بوویێتیشي ن بە شتێك، ئەوا بووین بە کۆیلەی بەر قاپی ئەو سەروەرە... ئەم چەند دێڕەی مەولاناش دەکەینە زمانێك و هەستەکانمانی پێ دەخەینە گۆ:

من بنده شدم بنده شدم بنده شدم          من بنده بخدمت سرافکنده شدم

هر بندکه آزاد شود شاد شود          من شاد ازآنم که ترابنده شدم

بوومە بەندە! بوومە بەندە! بوومە بەندە!

من لە خزمەتی تۆدا بوومە دوو لەتە،

بەندە بە ئازادبوون دەگاتە شادی،

من شادی ئەوەم کە بۆ تۆ بوومە بەندە.

لەو باوەڕەشداین وەك چۆن خوای گەورە ئەم کوڕوزانەوە و پاڕانەوانەمان دەبیستێت و بە هانامانەوە دێت. ئاواش، وەختێك وەرزی شەفاعەت دێتە پێش، لە لایەن ئەو سەروەرەوە تکامان بۆ دەکرێت. جا بۆیە جارێکی تر ئێمەش بەم هەستەوە دەست بۆ دەسکی دەرگاکە دەبەین و دەڵێین: "شەفاعەت یا رسول اللّه".

بە ئیزنی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەری پێشەوامان شەفاعەت بۆ ئەو کەسانە دەکات کە گوناهی گەورەیان ئەنجام داوە. ئیتر ئێمەش هەر لە دنیادا ناوونیشانی خۆمانی پێ دەدەین و داوای لێ دەکەین بمانخاتە نێو بازنەی شەفاعەتەکەیەوە. لەو باوەڕەشدام کەسێکتان تێدا نەبێت خواست و خولیایەکی لەم شێوەیەی نەبێت. کەوابێ، پێویستە هەر لە ئێستاوە هەموومان دەخیلی ئەو سەردارە ببین و ناوونیشانی خۆمانی بۆ دابنێین. تۆسقاڵێکیش چییە گومانتان نەبێت لەوەی کە ئەم داوایەمان دەبیستێت. ئەی ئەوە نییە لە نوێژدا کاتێك تەحییات

دەخوێنین، دەڵێین: السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ، و ڕاستەوخۆ وتووێژی لەگەڵ دەکەین. باشە ئەگەر گوێی لێ نەبێت، دەی ئیتر چۆن وەك دوێنراو گوفتاری ئاڕاستە دەکرێت؟ کەواتە گوێی لێمانە و خوای گەورەش دەیەوێت لە نوێژدا ڕاستەوخۆ سەلامی لێ بکەین!

ئەوەتا لە فەرمایشتێکی تردا -لە ڕاستیدا ئەمە هەر ئەو فەرمایشتەیە کە ئێمە دەمانەوێت بچینە خزمەتی- پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) کە بازنەی شەفاعەتەکەیی تا ئەو ڕادەیە بە کراوەیی هێشتووەتەوە، هەر لە دوورترین بازنەی گەل و هۆزەکەیەوە هەتاوەکو نزیکترینیان ڕوویان تێ دەکات و پێیان دەفەرموێت:[1]

"ئەی خێڵی کەعب بن موڕڕە! بەدوای کڕینی نەفسی خۆتانەوە بن لە خوای گەورە. چونکە لە ئاخیرەتدا هیچم بۆ ناکرێت بۆتان!

ئەی بەرەی عەبدولمەناف! بەدوای کڕینی نەفسی خۆتانەوە بن لە خوای گەورە، چونکە لە ڕۆژی دواییدا هیچم لە دەست نایەت بۆتان!

ئەی کوڕانی عەبدولموتەلیب! بەدوای کڕینی نەفسی خۆتانەوە بن لە خوای گەورە، چونکە لە ئاخیرەتدا هیچم لەدەست نایەت بیکەم بۆتان!"

لە وەها سەردەمێکدا کە هەر هۆز و خێڵەو شانازییان بەو هۆزەڤان و جەنگاوەرانەوە دەکرد کە لە ناویاندا هەڵدەکەوت و کردبوویاننە هۆکاری خۆهەڵکێشان، پێغەمبەرێك دێت و بەو جۆرە قسە دەکات! بەڕاستی ئەمە هەڵوێستێکە لە ڕووی خاکێتیی و خۆنەویستییەوە لەوپەڕی گرنگی و بایەخدایە. ئەوێك کە نە شاعیرە و نە جەنگاوەر، بەڵکو سەرداری بوونەوەران و دوایەمینی پێغەمبەرانە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هۆز و نەتەوەکەیی ئاگادار دەکردەوە لەوەی کە لە حوزووری پەروەردگاردا هیچی لەدەست نایەت و ناتوانێت سوودیان پێ بگەیەنێت. بەمەش، هەر لە

١ بخاري، وصايا ١١، تفسير (٢٦) ٢؛ مسلم، الإيمان ٣٨-٣٥٢.

سەرەتای ڕێوە ئەگەری ئەوەی بنکێش دەکرد کە فیز لێبدەن و بەخۆیاندا بنازن و بڵێن: "پێغەمبەر لە ئێمەیە" و بەم هۆیەوە خۆیان لە خەڵکی بە گەورەتر بزانن. لە هەمان کاتیشدا بەرپرسیارێتیی سەرشانیانی وەبیر دەهێنانەوە.

ئەوە بوو لە دوورترین هۆز و تیرەوە دەستی پێکرد و وردە وردە نزیك بووەوە تا ئەوەی گەیشتە نزیکترین خزم و کەسەکانی، ئینجا فەرمووی: يَا صَفِيَّةَ عَمَّةُ رَسُولِ اللهِ! لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً "ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەری خوا، تۆش بڕۆ لە هەوڵی ئەوەدا بە چۆن نەفسی خۆت لە خوا بکڕیت، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ شتێکم لەدەست نایەت بیکەم بۆت!"

ئەزانن کام صەفییە؟ ئەو صەفییەیەی (رضيَ اللهُ عَنْها) کە خوشکی حەزرەتی حەمزە (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بوو. کاتێك لە ئوحوددا حەزرەتی حەمزە شەهید بوو، ئەم خوشکە بەوەفایە ویستی بچێت براکەی ببینێت. بەڵام پێغەمبەری خوا لە ترسی ئەوەی نەوەك بەرگە نەگرێت، هەوڵیدا ڕێگری لێ بکات. کەچی ئەم شێرەژنە، چ بە مەبەستی بینینی ڕۆحێکی بە خودا شادبوو بووبێت، یان بە مەبەستی قووڵ کردنەوەی قینەکەی.. ڕۆیشت و تێر سەیری جەستەی پارچە پارچەکراوی کاکەی کرد. بەڵێ، ئافرەتێکی بەهێزی خاوەن ئیرادە بوو. مەگەر پیاوێکی پیاوانە هێندەی ئەو خۆڕاگر و پتەو بووبێت. ئەو صەفییەیەی کە لە هەمان کاتدا دایکی ئەو حەزرەتی زوبەیرەش بوو کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە "حەوارییەکەم" ناوی دەبرد. ئەو صەفییەیەی کە دەیکردە داپیرەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش؛ ئەو گەنجە قارەمانەی کە لە کاتی بەرگری کردن لە کەعبە دژی حەججاج، هەڵواسرا و گەیشتە کاروانی شەهیدان. لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە، ئەو صەفییەیەی پووری حەقیی پێغەمبەری خوا بوو. کەچی سەرەڕای هەموو ئەمانە، ببینە وا سەروەری هەردوو جیهان هەمان شتیشی بەو دەفەرموو...

بەڵێ، پێغەمبەری خوا مرۆڤی هاوسەنگی و بەرچاو ڕوونی و کارزانی بوو. نەدەچوو وەك هەندێ کاڵفامی بێ ئاگا لاف لێبدات و بڵێ: "لە ئاخیرەتدا دەستی فریاگوزاری بۆ هەموو کەس درێژ دەکەم." تەنانەت لەنێو ئەوانەدا کە پێی نەوتبوون دەگەمە فریاتان، کیژەکەی خۆی، جگەرگۆشەکەی، تاکە بەری شیرینی ڕۆژانی پێغەمبەرایەتییەکەی، حەزرەتی فاطیمە (رضي الله عنها)شی تێدابوو. ئەوەتا هەمان شت بەویش دەڵێت: يَا فَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللهِ! لَا أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللهِ شَيْئاً "ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد، تۆش نەفسی خۆت لە خودا بکڕە، چونکە لە قیامەتدا ناتوانم هیچت بۆ بکەم."

ئەو فاطیمەیەی بێ ئەوەی گەردی تاقە گوناهێکیش لەسەر چاو و خەیاڵی بنیشێت، لەگەڵ حەزرەتی عەلیدا هاوسەرگیریی بەستبوو. جا خۆ بەر لەوەی تەمەنیشی بگاتە ٢٥ ساڵ کۆچی دوایی کردبوو. سەرجەمی ئەو ئەولیا و ئەصفیایانەش کە دواتر هاتوون، هەر هەمووی بەری ئەو وەچە نوورانییەی ئەو بوون.. ئەوێك لە ماڵێکدا پەروەردە بووبوو، ئەو ماڵە ماڵی پێغەمبەر بوو و هەردەم لێزمەی وەحی بەسەردا دەباری. ئەوێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بارەیەوە فەرموویەتی: "فاطیمە پارچەیەکە لە من."[1] دیسانەوە ئەوێك کە بە سەرداری ئافرەتانی بەهەشت ناسراوە،[2] بەڵام پێغەمبەری خوا بە ئەویش، بەڵێ بەم فاطیمەیەشی دەوت: "بڕۆ بەدوای کڕینی نەفسی خۆتەوە بە لە خوای گەورە. هەوڵ بدە ڕەهنی سەر نەفست هەڵبگریت."

جا ئایا هەرگیز ڕێی تێدەچێت و ئەگەری ئەوە هەیە کە؛ ئەم زاهیدترینی زاهیدانە، ئەم پێشەوای لەخواترسانە، ئەم زاتەی کەوا زاناترینە بە ئاخیرەت و ژیانی بەگوێرەی ئەو پێوەرانە بەسەر بردووە و هێندەی گەردیلەیەك کەمتەرخەم نەبووە لە

---

١ بخاري، فضائل الأصحاب ١٢، ١٦؛ مسلم، فضائل الصحابة ٩٣-٩٤.
٢ بخاري، فضائل الأصحاب ٢٩؛ ترمذي، مناقب ٣٠.

نواندنی ئەدەب و ملکەچیی شایان لە خزمەت پەروەردگاریدا و وەك هێمایەك بۆ گەورەییەکەی، خۆی بە "هیچ" داناوە و پشتی بە کردەوەکانی نەبەستووە، بێت و گوناهـ ئەنجام بدات، یاخود لە ڕێ لابدات و ڕاستڕەویی خۆی لەدەست بدات؟ هەزاران هەزار جار حاشا.

## و) پەرستش و بەندایەتییەکەی

چ جای عیبادەتەکەی کە هەر مەپرسە! ئەگەر کەسێك تەماشای عیبادەت و بەندەگییەکەیی بکردایە، وایدەزانی لە ژیانیدا هیچ ئیشێکی نییە و هەر خەریکی عیبادەتە. بەڵێ، ئەو نازدارە لە بەندایەتییەکەیدا تا ئەو ئاستە قووڵ بووبووەوە. مەگەر لە هەموو جوانی و چاکییەکدا ئەو هەروا نەبووە؟! جا بۆ چ کەسێك و لە چ مەیدانێکدا توانیویەتی پێی بگاتەوە؟ نەخێر، مەحاڵە هیچ کەسێك لە هیچ مەیدانێکدا پێی گەیشتبێتەوە..!

لە نوێژەکانیدا ئەوەندە بەقووڵی بەندایەتییەکەیی دەنەخشاند، خەریکە بڵێین نوێژێك نەمابوو لەرز دای نەگرتبێت و تیایدا نەشکی گەشی نەوەراندبێت. هاوەڵان باس لەوە دەکەن لە کاتی نوێژدا دەنگێك لە سنگییەوە دەهات کە لە دەنگی بەرداش دەچوو.[1] جا ئیتر ئازاری سەرگەردانیی مرۆڤایەتی کە لە ناخیدا پیشی دەخوارد و، ئەو ئەرکە سەنگینەی بەندایەتیش کە لە ئەستۆیدا بوو، گشتی بەجارێ ئەویان وەك مەنجەڵێکی کوڵهاتە لێ کردبوو. بەدڵنیاییشەوە ئەم حاڵەتە، لە هەوڵ و کۆششی ئەو سەروەرەوە سەرچاوەیان گرتبوو بۆ بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتی لە بەرزترین ئاستدا.

نوێژ کارێك بوو دەتوت بەشەهوەتەوە ئامەزرۆیەتی. هیچ چێژێکی تر ئەو چێژەی

---

١ أبو داود، صلاة ١٦١؛ نسائي، السهو ١٨.

نەدەدایە کە نوێژ دەیدایە. هەر لەبەر ئەوەشە کە ڕۆژێکیان فەرمووی: حُبِّبَ إِلَيَّ النِّسَاءُ، وَالطِّيبُ، وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ "(سێ شتم)لا خۆشەویست کراوە: ئافرەت، بۆنی خۆش، بینایی ڕاستەقینەی چاویشم لە نوێژدایە."[1]

ئافرەت لە گرنگترین ئەو توخمانەیە کە پیاو هەستی وابەستەیی بۆی هەبێت. وەختێ حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) بەدیهێنرا، ئەم هەستەشی لەگەڵدا بەدیهێنرا. زیادەی ئەم پەیوەندییە شەهوەتە. شەهوەتیش واتە ئەو کرێ و پاداشتە پێشینەی کە لەپێناو بەردەوام بوونی وەچەدا دەدرێت. خۆ ئەگەر ناوونیشانێکی وای لێ نەنرایە، ئەوا هیچ کەس بیری لە بەردەوامی دان بە وەچەکەی نەدەکردەوە. چونکە ئەوەی دەمێنێتەوە، کۆمەڵە بێگارییەکە و بەس. خۆ خۆشەویستی منداڵیش بە تەنها بەس نییە بۆ بەردەوامیی وەچە. لەبەر ئەوە خوای گەورە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) شەهوەتی دروستکردووە تاوەکو پیاو بە ئافرەتەوە و ئافرەتیش بە پیاوەوە ببەستێتەوە.

لە ڕاستیدا تێپەڕاندنی ئەم هەستە کە لە ماهییەتی مرۆڤانەماندا بوونی هەیە و لەگەڵ بەدیهاتنماندا شێلراوە، کارێکی ئەستەمە. خۆ ئەگەر ئەمە لە تواناشدا بووایە، ئەوا یەکەم کەس حەزرەتی ئادەم (عَلَيْهِ السَّلَام) بەم کارە هەڵدەستا. بۆیە سەروەریشمان لەم سروشتە دەدوا و تیشکی دەخستە سەر ئەم تایبەتمەندییە سروشتییە و دەیفەرموو: "ئافرەتم لا خۆشەویست کراوە." ئاخر ئەو پێغەمبەرێک بوو دەست لەملان لەگەڵ فیترەت و سروشتدا و لە پەیامەکەیدا شتێك نەبوو ناوی ڕەبەنایەتی بێت. ئەوەبوو ڕوو بەو هاوەڵانەی کە دەیانویست بە مەبەستی خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ عیبادەت و بەسەربردنی هەموو کاتەکانیان لە خوا پەرستیدا خۆیان بخەسێنن، فەرمووی: "خواناسترین و لەخوا ترسترینتان منم. بەڵام من پەرستش دەکەم و لەگەڵ خێزانەکانیشمدا دەبم. پشوو دەدەم و عیبادەتی شەوانیش دەکەم. ڕۆژوو دەگرم و نانیش دەخۆم. ئەمە ڕێگە و ڕێبازی منە، هەرکەسێك

[1] نسائي، عشرة النساء ١؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٢٨/٣، ١٩٩، ٢٨٥.

پشت لە ڕێبازی من بکات لە من نییە..."[1]

مرۆڤێك بوو، هاوسەنگی لە سەرتاپای ڕەفتارەکانی دەچۆڕا و بە کۆمەڵە بنەما و ڕێسایەکەوە هاتبوو گشتگیر و فیترەت ڕەنگ. ئەو دینەی هێنابووی "الحنفية السمحاء" بوو، لە هەمان کاتیشدا ناوی ئەو سیستەمە بوو کە هەموو کەسێك دەیتوانی بەئاسانی پێوەی بژی و جێبەجێی بکات. خۆ ئەو تەنها بۆ دەستە و تاقمێکی دیاریکراو نەهاتبوو.. بەڵکو بۆ هەمووان بوو و پەیامەکەشی هەمووانی لەئامێز گرتبوو.

خۆ ئەگەر بێینە سەر بۆنی خۆش، ئەوا دەبینین کە ڕۆحە هەڵبژاردەکان حەزیان لە بۆنی خۆشە. پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَام) بە ڕۆحیانەتەکەیەوە ئەوەندە ناسك بووبووەوە، لایەنە جەستەییەکەشی بە ئاستێك نیانی بەدەست هێنابوو، دەتوت شانبەشانی ڕۆحی دەڕوا و لەگەڵ فریشتەکاندا ئاوێتە بووە.

ڕۆحیات شتێکە و ڕۆحانیەتیش شتێکی تر. ئەوانەی هەم خاوەنی ڕۆحیات و هەم ڕۆحانیەتیشن، لە هەمان کاتدا خاوەن نەفسی صافیاتیشن. ئەوە تەنها پێغەمبەرانن کە دەتوانن بگەنە صافییە. لە لوتکەی ئەم مەقامەشدا دیسانەوە پێغەمبەری پێشەوامان دەبینین. تۆ وەرە بڕوانە، جەستەی تەنانەت لە میعراجیشدا وازی لە پێشبڕکێی خۆی نەهێنا لەگەڵ ڕۆحیدا. ڕۆح چووبێتە هەر شوێنێك، جەستەشی هاودەم لەگەڵ ڕۆحیدا لەو شوێنە ئامادە بووە.

ڕاستییەکەی وا نازانم ئێرە جێی دووبارە کردنەوەی ئەو وتووێژانە بێت کە هەر لە زووەوە دەربارەی چۆنیەتی میعراج کراون. ڕای زۆرینەی زانایان دەربارەی ئەم بابەتە ئەوەیە کە لە گەشتی میعراجدا جەستە و لەش و لاری حەزرەتی محمد (صَلَّى اللهُ

1 بخاري، النكاح ١؛ مسلم، النكاح ٥.

عَلَيْهِ‌وَسَلَّمْ) هاوگەشتی ڕۆحە موحەممەدییەکەی بووە.[1] جەستەی موبارەکی هێندە ڕۆحانیەت و نوورانیەتی بەدەستهێنابوو، لە هەر جێیەکدا ڕۆحە بەرزەکەی هەنگاوی نابێ، لەو جێیەدا نیگا و ڕوانینی جەستەشی ئامادە بووە.[2] کەسانی دی ڕەنگە بە ڕۆح یاخود لە خەونیاندا بتوانن میعراج بکەن. بەڵام میعراجی ڕۆح و جەستە، تەنها و تەنها بە نسیبی ئەو سەروەرە بووە. مەردی ئەو مەیدانە و شاسواری ئەو ڕێگەیە هەر خۆیەتی.

بۆنی خۆش خۆراکی فریشتە و ڕۆحانییەکانە. جا لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خواش (صَلَوَاتُ‌اللّٰهِ‌وَسَلَامُهُ‌عَلَيْهِ) چ بە ڕۆح و چ بە جەستە بووبووە بەشێك لەوان و تابلێی ئاوێتەیان بووبوو، بۆیە ئەوپەڕی حەزی لە بۆنی خۆش دەکرد و دەبووە مایەی ئاسوودەیی دەروونی.

جا ئیدی وەختێ پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: "ئافرەت و بۆنی خۆشم لا خۆشەویست کراوە." لە ڕێگەی ئەم "ڕووگە یەکخەرەوە"، بەجارێك پێداویستییەکانی ڕۆح و جەستەی ڕاگەیاندووە و، کۆمەڵە لایەنێکی تایبەتی خۆیشی باس کردووە..

بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم دوو بابەتە، بابەتانێکی سروشتی و فیترین و لە داخوازییەکانی مرۆڤ بوونن. بۆیە ئاساییە کەسانی دیش لەم بابەتەدا هاوبەشیی پێغەمبەری خوا بکەن. بە واتایەکی دی، خۆشویستنی ئافرەت و بۆنی خۆش، شتانێك نین تەنها تایبەت بن بە پێغەمبەری خواوە (صَلَّى‌اللّٰهُ‌تَعَالَى‌عَلَيْهِ‌وَسَلَّمْ). چونکە ئەمانە، لەڕێی ئەو هەستانەوە کە خوای گەورە لە فیترەتی مرۆڤدا جێگیری کردوون، خۆشویستراون و ئارەزوو دەکرێن. کەم تا زۆریش لە هەموو کەسێکدا بوونیان هەیە.

---

١ إبن کثیر، البدایة والنهایة ٣/١١٣ هی تریش.
٢ بۆ زانیاری زیاتر، تکایە بڕوانە: وتەکان، وتەی سی و یەکەم، لا ٨٤٩.

وەختێکیش دێینە سەر سێیەمین لایەن، ئیتر ئەمە ئەو شوێنەیە کە پێویستە هەڵوێستەیەکی لە ئاستدا بکەین چونکە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دەفەرموێت: "نوێژیش بینایی دیدە و یاری خۆشەیست و شەهوەتی منە."

کاتێك مژدەی هاتنی یەك لە خۆشەویستترینی کەسەکانمان پێ دەدرێت، چۆن دڵخۆش دەبین و لەخۆشیدا خەریکە باڵ بگرین، هەر بەو شێوەیە کاتێك پێغەمبەری خوا دەستی دەکرد بە نوێژ، هەستی بە چێژ و خۆشییەك دەکرد کە بە سەدەها قاتی ئەو خۆشیە بوو کە ئێمە هەستی پێ دەکەین. ئەها ئەگەر ماوەیەکی زۆر لە کچە نازدارەکە، فاطیمە (رضيَ اللهُ عَنْها) دوور بووایە و پاشان هەواڵیان بدایەتێ و بیانوتایە: "ئەوە فاطیمە دێت." چەندە دڵخۆش دەبوو و بە چ شێوەیەك شادمانی دەیگرتەوە، دەی بە بیستنی ئەو دەنگەش کە هەواڵی هاتنی کاتی نوێژی دەدا، زۆر لەوە زیاتر دڵخۆش دەبوو و زۆر لەوە زیاتریش شادمانی دەیگرتەوە. ئاخر چونکە نوێژ، خۆشەویست و ئەویندار و دڵخوازەکەی بوو.

لە فەرموودەیەکی دیکەدا کە ئیمامی طەبەرانی دەیگێڕێتەوە و پشتی ئەم فەرموودەیە دەگرێت، پێغەمبەری سەروەرمان دەفەرموێت: إِنَّ اللهَ جَعَلَ لِكُلِّ نَبِيٍّ شَهْوَةً، وَإِنَّ شَهْوَتِي فِي قِيَامِ اللَّيْلِ "خوای گەورە بە هەر پێغەمبەرێك حەز و ویست و شەهوەتێکی بەخشیوە. شەهوەتی منیش لە شەونوێژدایە."[١]

واتاکەشی ئەمەیە: "ئێوە هەنگاو بە هەنگاو شوێن چێژە جەستەیی و لاشەییەکانتان دەکەون. ئەو ئاماژانەی لەو چێژانەوە پێتان دەگات دەستتان دەگرن و بەرەو خۆیان ڕاتان دەکێشن، ئیدی ئێوەش دەکەونە شوێنیان. بەڵام من، هەر کە گوێم لە دەنگی "هەستە وەختی نوێژە"ی ئەو ئامۆژگارە دەبێت کە بە ویژدان ناسراوە، ئاماژەی ئەم دەنگە بە جۆرێك دەمخاتە دووی خۆی و بە چەشنێك

١ الطبراني، المجمع الكبير ٨٤/١٢.

دڵبردووم دەکات، کە ئیدی بەبێ نوێژ نامکرێت. ئەو ساتانەش کە شەونوێژ ناکەم و ناتوانم شەوان هەستم، ناخۆشترین سات و خولەکەکانی ژیانمن. پڕچێژترین و شادمانترین ساتەکانیشم، ئەو ساتانەن کە لە نوێژدام."

بەندایەتی و پەیوەست بوونی پێغەمبەری خوا بە حەق تەعالاوە و، شایەتی و داننانی بە یەکتایی و خوایەتیی خواوەندا ئەوەندە قووڵ بوو، تا ئێستاش زۆر کەس دەستەوسانن لە پەی پێ بردنیدا. ئەو فەرموودەیەی سەرەوەش ئاشکراترین نموونەی ئەمەیە.

دایکمان حەزرەتی عائیشە (رضي الله عنها) بۆمان دەگێڕێتەوە:

"شەوێکیان کە بەخەبەر هاتم، دەبینم پێغەمبەری خوا لە تەنیشتمەوە نەماوە. ئەگەری ئەوە هات بە مێشکمدا کە لەوانەیە چووبێت بۆ ماڵی یەکێك لە خێزانەکانی تری. وەختێك دەستم خشاند بە دەوروبەرمدا، دەستم بەر قاچی کەوت. ئیتر ئەو کات تێگەیشتم کە لە نوێژدایە. لە سوجدەدا بوو. گوێم دایە، بەکوڵ دەگریا و دەپاڕایەوە:

اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ (عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ وَلَا يُهْزَمُ جُنْدُكَ وَلَا يُخْلَفُ وَعْدُكَ وَلَا إِلٰهَ غَيْرُكَ)

"خودایە! پەنادەگرم بە ڕەزامەندیت لە خەشم و تووڕەییت، بە لێبووردەییت لە سزا و تۆڵەت. پەروەردگارا! بە کەسی تر نا، بەڵکە هەر بە خۆت پەنا دەگرم لە خۆت. (پەنادەگرم بە جەماڵت لە جەلالت، بە میهرەبانیت لە تووڕەییت، بەشەفەقەت و بەزەییت لە گەورەیی و شکۆداریت.) دان دەنێم بەدەستەوسانیم لە سەنا و ستایشتدا بەو ئەندازەیەی کە خۆت ستایشی زاتی خۆت دەکەیت."[1] "هاوسێیەتی و نزیکیت

١ مسلم، صلاة ٢٢١-٢٢٢؛ أبو داود، صلاة ١٤٨.

سەربەرزییە (هەر کەس هاوسێ و هاودەمت بێ، سەربەرز بووە.) سەنا و ستایشی تۆ بەرز و شکۆمەندە. سوپاکەشت هەرگیز نابەزێنرێت، لەو بەڵێنەی داوتە هەرگیز ناگەڕێیتەوە. هیچ خواوەند و پەرستراوێکیش نیە جگە لە تۆ."[1] بەڵێ، هۆگری و بەرەو پیرەوەچوونی بۆ نوێژ، دەتوت هۆگرییەکی شەهوەتییانەیە. ئێستاش با گوێ بۆ ئەبوذەر (رضيَ اللهُ عَنْهُ) بگرین بزانین چیمان بۆ دەگێڕێتەوە: "شەوێکیان پێغەمبەری خوا هەتا بەرەبەیان نوێژی کرد و ئەو ئایەتانەی خوێند کە دوعایان تێدایە. بەکوڵ ئایەتەکانی دووبارە دەکردەوە و نوێژەکەیی کردبووە مۆزایکێك لە خشوع و خضوع و ملکەچی. کۆمەڵە دوعایەکی دوور و درێژی هەمەچەشن هەن کە پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَلْفُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) لە نوێژە سوننەتەکان و سوجدە و ڕوکوع و قیامدا خوێندوونی. ئەو شەوە هەتا بەرەبەیان ئەم ئایەتەی خوێند و فرمێسك لە چاوانی ڕژا:

﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ (المائدة : ١١٨)"[2] ئیتر وەك دەبینن، بە هیچ جۆرێك لە نوێژ تێر نەدەبوو و هەرگیز نەدەگەیشتە پلەی تێربوون.

ئێستاش با بچینە خزمەت ئیبن مەسعود (رضيَ اللهُ عَنْهُ) و شەربەتی گێڕانەوەکانی بنۆشین. ئیبن مەسعود، هاوەڵی پایەبەرز و مایەی شانازیی کوفە.. بەڕاستی مەزهەبی حەنەفی زۆر قەرزارباری ئەم کەڵەپیاوەیە. زانایانی وەك عەلقەمە و ئیبراهیم نەخەعی و حەمادی کوڕی ئەبوسولەیمان کە مامۆستای ئەبو حەنیفە بووە، هەموویان لە کەشە ئاڵتونییەکەی ئەودا پێگەیشتوون. هاوەڵان وایان دەزانی کە لە ئالویەیتە. بەڵێ ئەوەندە لە ئازیزەوە نزیك بوو، بێ پرس و ڕا خۆی دەکرد

---

١ ترمذي، دعوات ٩٠؛ أبو داود، الأدب ٩٧؛ هيثمي، مجمع الزوائد ١٠/١٢٤.
٢ أحمد بن حنبل، المسند ٥/١٤٩.

بەخانەی بەختەوەریدا و دەهاتە دەرەوە.[1] جار جار سەروەرمان داوای لێ دەکرد قورئان بخوێنێت، ئینجا گوێی بۆ شل دەکرد و بەدوایدا دەیفەرموو: "هەرکەس دەیەوێت گوێبیستی قورئان بێت بەو جۆرەی کە دابەزیوە، ئەوا با گوێ لە ئیبن ئوممی عەبد (ابن مەسعود) بگرێت."[2] ئەو دەمەش کە حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) ئەم هاوەڵە بەرێزەی نارد بۆ کوفە، ئازاری جودایی و پەژارەی خۆی بەم شێوەیە دەربڕی: "ئەی خەڵکی کوفە! خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە فەزڵی ئێوەم داوە بەسەر خۆمدا، ئەوا هەرگیز ڕێم نەدەدا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودم لێ دوور بکەوێتەوە."[3] ڕۆح سووکێکی بەژن کورتی قاچ باریکەلە بوو.[4] بەڵام لەڕووی قەدر و بەهایەوە گەنجینەیەك بوو لە زانست. ڕاستتر بڵێین، زەریایەك بوو لە مەعریفە.

ئیبن مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێت: "ڕۆژێکیان بڕیارمدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا شەونوێژ بکەم. نیازم وابوو ئەو شەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بەسەر بەرم و ئەو چ عیبادەتێك بکات، منیش ئەوە بکەم. ئەوەندەی نەبرد نوێژی دابەست و منیش بە دوایدا دامبەست. بەڵام هەر نەدەچووە ڕکوعەوە. دوای ئەوەی سورەتی "البقرة"ی تەواوکرد، لە دڵی خۆمدا وتم: 'ئێستا دەچێتە ڕکوعەوە.' بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو. پاشان دەستی کرد بە خوێندنی (آل عمران) و بەدواشیدا (النساء)، ئینجا چووە ڕکوعەوە. ئایەتەکانی لەسەرخۆ دەخوێند. ئەگەر ئایەتێکی بخوێندایە و تەسبیحی تێدا بووایە، "سبحان الله"ی دەکرد. ئەگەر داوایەکی تێدا بووایە، دوعای دەکرد و دەپاڕایەوە. ئەگەر پەناگرتنێکی تێدا بووایە، پەنای بە خوای گەورە دەگرت. لە کاتی نوێژەکەدا ئەوەندە ماندوو بووم، تەنانەت ماوەیەك بیری خراپ هات بە مێشکمدا. (داخۆ دەبێ ئەو بیرە خراپە چی بووبێت؟

---

١ بخاري، فضائل الأصحاب ٢٧؛ مسلم، فضائل الصحابة ١١٠-١١١.
٢ بخاري، فضائل الأصحاب ٢٧؛ مسلم، فضائل الصحابة ١١٦-١١٧.
٣ إبن سعد، الطبقات الكبرى ١٥٧/٣.
٤ إبن عبدالبر، الإستيعاب ٩٩٠/٣.

ڕەنگە لە یەکەم ساتدا ئەوە بە مێشکی مرۆڤدا بێت کە: 'تۆ بڵێی وای زانیبێت کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) هاوشێوەی حەزرەتی سولەیمان (عَلَيْهِالسَّلَام) بەپێوە وەفاتی کردبێت؟! لەبەر ئەوە یەکێك لە گوێگران لێی پرسی: 'بیرت لە چی دەکردەوە؟' ئیبن مەسعودیش لە وەڵامدا فەرمووی: 'بیرم لەوە دەکردەوە نوێژەکەم ببڕم و دابنیشم.'"[1]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمریش ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە: "شەوێکیان لە پشت پێغەمبەری خواوە نوێژم دابەست. بێ وچان ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە و لە ناخەوە دەکوڵا:

﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ (إبراهيم : ٣٦)

"پەروەردگارا، بەڕاستی ئەوانە زۆرێك لە خەڵکیان گومڕا کردووە و سەریان لێ شێواندوون. جا کێ شوێنی من بکەوێت و بەگوێم بکات ئەوە بێگومان لەمنە، هەر کێش یاخی بێت و سەرپێچی بکات، ئەوا هەر خۆت "غەفور" و "رەحیم"یت.""

هەروەها جارێکی تریشیان لە یەکێك لەو ڕۆژانەی کە هەر ئاوەها خەمبار بوو، بەبێ وەستان هەر دەگریا. حەزرەتی جوبرەئیل هات و سەلامی خوای گەورەی پێگەیاند و وتی: "خوای گەورە دەپرسێ داخۆ حبیب الله بۆچی دەگری؟"

خوای گەورە زانای پەنهان و نادیارەکانە و هەر خۆی "علام الغیوب"ە. زانستەکەی دەوراندەوری هەموو شتێکی داوە و شتێك نییە نەیگرتبێتەوە، جا بۆ لە توانای کێدایە لە دەرەوەی زانست و توانست و ویستی ئەو زاتەدا بێت؟! بەڵام دەپرسێ.. جا ئیتر مەبەست لەم پرسیار کردنە چ "إشهاد"، واتە بە شاهێدی گرتن بێت، یان

١ بخاري، تهجد ٩؛ مسلم، مسافرين ٢٠٤.

چ ڕاگەیاندنی ناوازەیی و نایابیی حبیب الله بێت، هیچ جیاوازییەکی نییە.

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) لەتاو ڕێژنەی فرمێسکەکانی توانای وەڵام دانەوەی نەبوو. لەنێو لێوانیەوە تەنها ئەم وشەیە توانی بێتە دەر: "ئومەتەکەم.. ئومەتەکەم" دەرد و خەمەکەی ئاشکرا بوو؛ ئومەتەکەی... جوبرەئیل وەك بڵێی حاڵەتەکەی وەك خۆی یاداشت کردبێت، ڕۆیشت و وەڵامەکەی برد. پاش ئەمە، خوای باڵادەست بۆ جاری دووەم بە سەلامێکی ترەوە ناردییەوە و بەم وتانە دڵی خۆشەویستەکەی دایەوە:

إِذْهَبْ إِلَى مُحَمَّدٍ فَقُلْ لَهُ: إِنَّا سَنُرْضِيكَ فِي أُمَّتِكَ وَلَا نَسُوءُكَ "بڕۆ بۆ لای خۆشەویستەکەم (سەلامی پێ بگەیەنە) و پێی بڵێ: 'بەدڵنیاییەوە دەرهەق بە ئومەتەکەت ڕازیت دەکەین و هەرگیز ناهێڵین لە خەم و پەژارەدا بیت.'"[1]

ئەو نازدارە هەموو تەمەنی بە بەندایەتی و پەرستش بەسەر برد. نوێژ، خۆشەویسترین دڵخوازی ئەو بوو. شەو و ڕۆژ نوێژی کرد و هەر واش ژیا. ئەی مەگەر هەر ئەو نەبوو فەرمووبووی مرۆڤ چۆن بژی ئاواش دەمرێت؟[2] جا ئیتر وەك هەر فانییەکی تر ئەویش دەبوو بمرێت. بەڵام ئەو بە نوێژەوە ژیابوو، بۆیە هەر بە نوێژیشەوە ماڵئاوایی لە دنیا دەکرد...

ئیدی کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنی بوو. ئەوەندە هێزی تیا نەبوو چاوەکانیشی بکاتەوە. کاتێك سەتڵێك ئاوی ساردیان دەکرد بەسەری موبارەکیدا، چاوەکانی دەکردەوە و خۆ گەر توانای گۆکردنی تەنها وشەیەکیشی هەبووایە، ئەوا ئەو وزەیەی لە تەنها شتێکدا بەکاردەهێنا و دەیپرسی: "هاوەڵان نوێژیان کرد؟" کەچی بەکاربردنی ئەم تۆزە وزەیەش، ئەم تۆزە توانایەش، بەس بوو بۆ ئەوەی هێزی لەبەر

١ مسلم، الإيمان ٣٤٦.
٢ مسلم، الجنة ٨٣.

ببڕێت و دووباره لەهۆش خۆی بخاتەوە. جا وەختێك بە ئاوە ساردەكە دەهاتەوە هۆش خۆی، ئەو پرسیارەی دەیكردەوە هەر هەمان پرسیار بوو: "هاوەڵان نوێژیان كرد؟"

نەخێر نەیانكردبوو، جەماعەتەكەی چەندین سەعات بوو چاوەڕێی ئەو بوون. چاوەكان هەر لە دەرگای ئەویان دەڕوانی. داخۆ دەبێ كەی بێ پەردە لابدرێت و سەرلەنوێ خۆر لە مزگەوت هەڵبێتەوە... بەڵێ، هەموو خۆیان بۆ ئەو ساتە دانابوو. زۆرێكیان هەستیان بەوە كردبوو كە ئەو خۆرە لە ئاوابووندایە، بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیاندەویست باوەڕ بەوە بهێنن. كاتێك پێغەمبەری خوا زانی كە ئیتر توانای پێشنوێژی كردنی نەماوە، فەرمووی: "بە ئەبوبەكر بڵێن با ئەو پێشنوێژی بكات." وەختێكیش هەستی كرد تۆزێك باشتر بووە، كەوتە هەنگاونان بەرەو مزگەوت. حەزرەتی عەبباسی مامی لەژێر باڵێكیدا و حەزرەتی عەلیی هەم ئامۆزا و هەم زاواشی لەژێر باڵەكەی تریدا، بە پێ خشكێن بردیان بۆ مزگەوت. لە هەموو حاڵێكیدا سەرتاپا شكۆ و بەها و ئەفسوونی نوێژی لێ دەباری. پاشان لە پشت ئەو زاتەوە كە دوای خۆی دەبووە پێشەوا، ڕاوەستا و بەدانیشتنەوە نوێژەكەی كرد. تەنها دوو جار توانی بەم شێوەیە بێتە مزگەوت. لە جارێكیاندا پێغەمبەری خوا خۆی پێشنوێژی كرد و حەزرەتی ئەبوبەكریش دەنگەكەی دەگەیاندە ئەوانەی دواوە.[1] جارەكەی تریشیان لەدوای حەزرەتی ئەبوبەكرەوە نوێژی كرد.[2] پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بەم هەڵوێستەی، وەك بڵێی ئەو پێشەوایەی دەخستەڕوو كە دوای خۆی دەهات.

دووپاتی دەكەینەوە و دەڵێین: ئەو سەروەرە بە ڕادەیەك لەگەڵ نوێژ و جەماعەتدا ئاوێزان بووبوو، تا دوا ساتی ژیانیشی هەر دەستبەرداری جەماعەت نەبوو. تەنانەت ئەگەر بەسەر شانی دوو كەسیشەوە بووایە و نەشی توانیایە پێكانی لە زەوی ببڕیایە

١ بخاري، الأذان ٥١؛ مسلم، صلاة ٩٠-٩٧.
٢ ترمذي، صلاة ١٥١؛ أحمد بن حنبل، المسند ١٥٩/٦.

و بەدوای خۆیدا بیخشاندنایە، ئەو هەر دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی خۆی بە جەماعەت دەکرد...

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پێی وایە نوێژی جەماعەت "فەرزی عەین"ە.[1] چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: ﴿وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ (البقرة : ٤٣) "لەگەڵ ڕکوع بەراندا ڕکوع بەرن." هەندێ لە ئیمامەکانیش جەماعەت بە یەکێك لە مەرجەکانی دروستیی نوێژ دادەنێن. پێیان وایە نوێژێك بە جەماعەت نەکرێت نوێژ نییە.[2] بەڕای ئیمامی شافیعیش نوێژی جەماعەت فەرزی کیفایەیە.[3] لە مەزهەبی حەنەفیشدا سوننەتی موئەککەدەیە.[4] ئەمە ئەگەرچی هەندێ لە زانایانی مەزهەبی حەنەفی نوێژی جەماعەتیان بە واجب داناوە...[5]

ئێمە لێرەدا خۆمان نادەین لە قەرەی شیکاری فیقهی بابەتەکە. بەڵکو تەنها وەك بیرخستنەوەیەکی بچووك سەرێکمان لێدا. ئەگینا بابەتی سەرەکیمان بریتییە لە پەرستشی پێغەمبەری خوا و، ئەو هەستیارییەی لە بەندایەتییەکەیدا دەینواند و ئەو ڕۆچوونەی کە بە قووڵاییەکانی نوێژدا تۆماری کردبوو.

ئەگەر بێت و تەنانەت کەسێکی ئاساییش هۆشمەندانە نوێژ بکات، ئەوا ئەم نوێژە بەسە بۆ ئەوەی خاوەنەکەی لە خراپە و بەدکاری بگرێتەوە.[6] ئەی ڕاتان چۆنە بەرامبەر بە نوێژێك کە نوێژخوێنەکەی پێغەمبەری خوا بێت؟ ئاخر وەها نوێژێك چۆن و بە چ ڕەنگێك خاوەنەکەی -کە پێغەمبەری خوایە- ڕادەستی گوناهـ و تاوان دەکات. نا نەخێر، هەرگیز ڕادەستی نەکردووە و نایشی کات!

---

١ إبن قدامة، المغني ٣/٢؛ جزيري، الفقه على المذاهب الأربعة ٤٠٥/١.
٢ إبن قدامة، المغني ٣/٢؛ المرداوي، الإنصاف ٢١٠/٢.
٣ جزيري، الفقه على المذاهب الأربعة ٤٠٧/١.
٤ مرغيناني، الهداية ٥٥/١.
٥ إبن عابدين، حاشية ردالمحتار ٥٥٢/١.
٦ بڕوانە: سورەتی العنكبوت، ئایەتی ٤٥.

کاتێك دایکە عائیشەمان (رضي الله عنها) باسی نوێژی پێغەمبەری خوامان بۆ دەکات، دەفەرمووێت: "ئەوەندە بە پێوە دەمایەوە، هەر مەپرسە. بەجۆرێك دەچووە ڕکوعەوە هەر مەپرسە. سوجدەشی بە چەشنێ بوو هەر مەپرسە."[1] ئیتر بەم شێوەیە دایکی ئیمانداران بەم چەند وشەیە پەسنی جوانیی نوێژی پێغەمبەری خوامان بۆ دەکات.

خۆ ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی تر نەبووایە لە سەر بوونی خوای گەورە، ئەوا ئەو نوێژەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەنجامی دەدا، بەڵگەیەکی سەروزیاد بوو. چونکە لە هەموو نوێژەکەیدا، لە تەواوی ڕوکنەکانیدا، گەورەیی و شکۆمەندیی خوای گەورە تەجەللی دەکرد. جا ئایا کەسێك نوێژەکەی بەم شێوەیە بێت، هەرگیز ئارەزووی بە لای گوناهدا دەبزوێت؟

پەرستشەکانی ڕەنگی یەکپارچەییان گرتبوو. ئەوەتا لە کاتێکدا نوێژەکانی بە جوانترین شێوە بەجێ دەگەیاند، جۆرێکی دیکەی پەرستش، بۆ نموونە، ڕۆژووشی فەرامۆش نەدەکرد. بەلایەنی کەمەوە هەفتەی یەك دوو ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو. تەنانەت جاری وا هەبوو ئەوەندە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەڕۆژوو دەبوو، وا دەزانرا کە هەرگیز ڕۆژووەکەی ناشکێنێت و بەربانگ ناکاتەوە.[2] جاری واش هەبوو دەچووەوە سەر ڕێچکەی سروشتی و وەك هەر کەسێکی تر بەربانگی دەکردەوە. ئەوەندە هەیە ئەو ڕۆژانەی بەڕۆژوو دەبوو، بە بەراورد بە ڕۆژانی دی زۆر زیاتر بوون.[3]

نێوەنێویش ڕۆژووی ویصاڵی دەگرت. واتە؛ بەبێ ڕۆژوو شکاندن چەند ڕۆژێك لەسەر یەك بەڕۆژوو دەبوو. وەختێ هاوەڵانیش ئەمەیان دەبینی، دڵیان

---

١ بخاري، تهجد ١٥؛ مسلم، مسافرين ١٢٥.
٢ أبو داود، صوم ٥٣؛ ترمذي، صوم ٤٣؛ أحمد بن حنبل، المسند ٩١/٢.
٣ بخاري، صوم ٥٣؛ مسلم، صيام ١٧٨.

دەچووە سەری و دەیانویست چاو لە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) بکەن. بەڵام ئەمە کارێکی زۆر سەخت و گران بوو. جارێکیان کە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان بوو، پێغەمبەری خوا نییەتی ڕۆژووی ویصالی هێنا. هاوەڵانیش چاویان لە پێغەمبەری خوا کرد و نییەتیان هێنا. بەڵام کاتێك ڕۆژووەکە چەند ڕۆژێك درێژەی کێشا، هەموویان هێز و پێزیان لێبڕا و لە پەلوپۆ کەوتن. بەڵام ئەوەبوو جەژن بۆیان بوو بە بەرەکەت و هەموویان بە هاتنی جەژن دڵخۆش بوون. خۆ ئەگەر جەژن ڕۆژێك زیاتر دوا بکەوتایە، ئەوا هەموویان بەجارێ لێدەبوونەوە. کاتێك پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەحاڵیانی زانی، زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: "ئەگەر جەژنیش نەبووایە، من هەر بەردەوام دەبووم لەسەر ڕۆژووەکەم." بەدواشیدا ئەوەی بۆ ڕوونکردنەوە کە هێز و توانای ئەوان بەرگەی ئەم عیبادەتە ناگرێ و هەر خۆی دەتوانێ ئەنجامی بدات. ئەوجا فەرمووی: "چونکە خوای گەورە بە تەرزێك کە ئێوە لێی تێناگەن، خواردن و خواردنەوەم دەداتێ."[1]

بە تایبەت لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزاندا پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) قۆڵی لێ هەڵدەماڵی و هەموو ڕۆژەکانی بە عیبادەت بەسەردەبرد.[2] دەتوت بەدرێژایی ئەو ڕۆژانە پشتی موبارەکی بەر زەوی ناکەوێت.

ئەو نازدارە لە سەختترین ڕۆژەکانی هاوینیشدا ڕۆژووی دەگرت. لە زۆرێك لە جەنگەکانیشدا ئەو هەر بەڕۆژوو بوو. جاری وا هەبوو جەنگ بە شێوەیەك ڕووی لە سەختی و دژواری دەنا، کە بەرگەگرتنی ئەستەم بوو. ئەوەبوو لە یەکێك لەو جەنگانەدا جگە لە خۆی و عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە (رضيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، کەسی تر نەمایەوە بەڕۆژوو بێت.[3] ئاخر ئەو خۆی فەرموویووی: "ڕۆژوو قەڵغانێکی پارێزەرە

١ بخاري، صوم ٤٩؛ مسلم، صيام ٥٩.
٢ بخاري، ليلة القدر ٥؛ مسلم، الإعتكاف ٧.
٣ مسلم، صيام ١٠٨-١٠٩؛ أبو داود، صيام ٤٥.

بۆ مرۆڤ لە بەرامبەر گوناهدا.«[1] بۆیە باشترین و پتەوترینی ئەو قەڵغانانەش خۆی پۆشیبووی و لەم ڕێیەشەوە پارێزراویی بەدەست هێنابوو.

## ی) هەرێمی نزای پێغەمبەری خوا

دوعا عیبادەتە،[2] دوعا کرۆك و کاکڵەی بەندایەتییە،[3] دوعا ناوونیشانی گەڕانەوە و ڕووکردنە پەروەردگارە. مەحاڵە لە شوێنێکدا باس لە بەندایەتی بکرێت و لە گەڵیشیدا باسی دوعا نەکرێت. مەگەر خوای گەورە نافەرموێت: ﴿ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ ﴾ (الفرقان : ٧٧) "ئەگەر دوعا و نزاکانتان نەبێت، چ نرخ و بەهایەکتان هەیە؟" ئەی هەر خۆی نییە کە دەفەرموێت: ﴿ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ (غافر : ٦٠) "دوعا بکەن تا لێتانی قبووڵ بکەم."

دوعا، پەیوەندییەکی بەهێزە لەنێوان بەندە و خوای باڵادەستدا (عَزَّوَجَلَّ). بە دەربڕینێکی تر، دوعا شێوازی پێشکەش کردن و گوزارشت کردنی بەندەیە لە بیرکردنەوە و نیازەکانی لە حزووری پەروەردگاردا. ئیتر بەم جۆرە، بەندە لە هەموو ئەو شتانەیدا کە ناتوانێت پێیان بگات و بە توانستی خۆی بەدەستیان بێنێت، دێت و لە قادیری موتڵەق کە خاوەن توانستی ڕەهایە، داوایان دەکات. جا ئیدی دوعا ناوی ئەم داواکارییەیە. دوعا، ئاوازێکی شیرینە لە شێوەی حەلەزۆندا لە بەندەوە بۆ پەروەردگار و هەتاوەکو عەرشی مەزن بەرز دەبێتەوە.

دوعا، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بچووك کراوەتەوە و ترنجێنراوەتە کۆتایی پێنج فەرزەی نوێژ و هەندێ پەرستشی دیاریکراوی دیکەوە، خۆی لە ڕاستیدا گەورەترین پێداویستی ژیان و دوای ژیانیشە. ژیان بەبێ دوعا شتێکە تەنانەت

١ بخاري، صوم ٢، توحيد ٣٥؛ مسلم، صيام ١٦٢-١٦٣.
٢ ترمذي، تفسير (٢) ١٦؛ أبو داود، وتر ٢٣.
٣ ترمذي، دعاء ١.

خەياڵ کردنیشی ئەستەمە. ئەم ژیانەی کە ئێمەی تێداین، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی یەکپارچە بریتییە لە دوعا. دوعا، ڕازی ڕەزامەندی خوایی و کلیلی خانەی هەمیشەیی بەهەشتیشە. دیسانەوە دوعا نیشانەی ئەو بەندایەتییەیە کە لە "عەبد"ەوە بۆ "رب" بڵند دەبێتەوە و، سونبولی ئەو ڕەحمەتەشە کە لە "رب"ەوە بۆ سەر "عەبد" دادەبارێت. ڕاستتر بڵێین؛ دوعا ڕێك خاڵی تیشکۆی پەیوەندی نێوان خوای باڵادەست و بەندەیە. دوعا، لە ڕوویەکەوە عیبادەتە و لە ڕوویەکی تریشەوە میعراجێکی بەرز و بڵندە و عالەمی ئیمکان بە عالەمی لاهوتەوە دەبەستێتەوە. میعراجێکی پیرۆزی وایە کە پلیکانە بە پلیکانە مرۆڤ بەرەو لای خوای خۆی بەرز دەکاتەوە.

بیریشمان نەچێت کە، بەردەوامیی دەستی ڕەحمەت بەسەرمانەوە هەر لە سایەی دوعاوەیە. لە هەمان کاتدا دوعا برووسکەگیری غەزەبی ئیلاهیشە. عبودییەتێکی کاریگەری ئەوتۆیە دوعا؛ ڕەحمەت و ڕەزامەندیمان بۆ کێش دەکات و لە غەزەب و تووڕەیش بە دوورمان دەگرێت. زۆربەی جار شعووری دوعا لەو خاڵەدا دەبزوێت کە تواناکانی مرۆڤ دەگەنە بنبەست و لەبن دێن -خۆزگا ئەم شعوورە هەر لە سەرەتاوە ببزوایە- خۆی لە خۆیدا دیاری کردنی خاڵێك بۆ دوعا، کە پێی بوترێت خاڵی دەسپێك و کۆتا، یان هەر نییە، یاخود کارێکی ئەستەمە. چونکە مرۆڤ تەنها ساتێکیشی نییە تێیدا بێ نیاز بێت لە دوعا. کەوابوو، ئەرکی سەرشانی بەندەش ئەوەیە کە بۆ تەنها ساتێکیش دوور نەکەوێتەوە لە دوعا و پاڕانەوە لەو پەروەردگارەی کە بۆ تەنها ساتێکیش بە تەجەللی و درەوشانەوەکانی لە بەندەکەی دوور ناکەوێتەوە. چونکە بەند، بە دوعا دەگاتە بەردەم قاپی پەروەردگار و، هەر بە دوعاش لەو بەرقاپییەدا گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرێت و، هەر دوعاشە دەبێتە هۆکاری ئەوەی ڕێژنە بارانی ڕەحمەتمان تاوتاو بەسەردا ببارێت.

دوعا لەو ڕووەوە کە بۆ ئێمە دەڕوانێت، بریتییە لە داواکردن. ئەوەتا ئێمە

پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانمان لە پەروەردگاری خۆمان داوا دەکەین. کەچی زۆرجار نە دەزانین چی داوا بکەین، نە دەشزانین چۆن داوای بکەین. ئەمە وا دەکات کە تەنانەت لە داواکردنیشدا کەم ئەدەبی لە بەرامبەر زاتی "ذو الجلال" دا بنوێنین. ئەوەتا حەزدەکەین ئەو شتانەی داوایان دەکەین، بەگوێرەی ئارەزووی خۆمان بێت نەوەك بەگوێرەی ویستی خاوەن ویستی ڕەها. هەر بۆیەش دەمانەوێت هەموو ویست و داخوازییەکانمان دەمودەست بەخێرایی بهێنرێتە جێ و، ئەو حەز و ویستانەشمان کە ناهێنرێنە جێ، وا دەزانین ڕەتکراونەتەوە و بەو هۆیەشەوە تووشی بێ ئومێدی دەبین.

ڕوونتر بڵێین، هەمیشە دەمانەوێت ئەو ئیرادە ڕەهایە وەك پاشکۆ و پەیکی ئیرادە جوزئییەکەی خۆمان ببینین. هەموو ئەمانەش شتانێکن پێچەوانەی ڕێوشوێن و ئەدەبیاتی دوعاکردنن. ئەو دوعایەش کە بەوەها نییەتێکەوە دەکرێت، زۆر لەوە دوورترە ببێتە پەیوەندی لەبەینی پەروەردگار و بەندەکەیدا. لە کاتێکدا ئێمە دەزانین ڕەچاوکردنی ئاداب و ئەرکەکانی دوعا، یەکێکە لە مەرجەکانی وەڵامدانەوەی، بگرە لە پێشترینیشیانە.

جاری وا هەیە دوعا لە شێوەی خواست و تاسەمەندییەکی ڕاستەقینەدا و تەنها وەك نیازێك لە دڵەوە بەرز دەبێتەوە. لەم حاڵەتەشدا بەندە هیچ شتێك نادرکێنێت، ڕەنگە تەنانەت لێوەکانیشی نەجوڵێنێت. بەڵام دڵنیایە لەوەی کە زاتی عَلّام الغُیوب ئاگای لێیەتی و زانایە بە ڕازی دڵی. بۆیە ئیتر ئەویش پشتێنی تەوەککولی بۆ دەبەستێ و ڕازی دڵی بە دەست دێنێت. ڕێك وەکو حاڵەتەکەی حەزرەتی ئیبراهیم لەو ساتەدا کە خستیانە ناو ئاگرەوە. لەوەها خاڵێکدا کە گشت تواناکان لە بن هاتبوون و سەرجەمی هۆکارەکان لەکار کەوتبوون، بە شێوەیەك کە هەرگیز چاوەڕوان نەدەکرا، فەرمانی ئیلاهیی: ﴿ يَٰنَارُ كُونِي بَرۡدٗا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ (الأنبياء : ٦٩) "ئەی ئاگر! لەسەر ئیبراهیم سارد و سەلامەت بە (ئیبراهیم

مەسوتێنە)." گەیشتە فریای و بوو بە سەرچاوەی کۆمەکی و پاڵپشتی بۆی.

گەیاندنی هەست و ڕازەکانی دڵ بە پەروەردگار لە ڕێی زمانەوە، ئەمەشیان جۆری دووەمی دوعایە. لێرەدا بەندە تەنها عەرزی حاڵی خۆی دەکات و ویستەکەی نادرکێنێت.جاری واش هەیە، هەم عەرزی حاڵی خۆی دەکات، هەم ویستەکەشی دەردەبڕێت. قورئانی پیرۆزیش لەسەر زاری پێغەمبەرانەوە نموونەی هەردوو جۆرەکەی دوعای هەڵبژاردووە. یەکەمیان دوعاکەی حەزرەتی ئەییوبە (عَلَيْهِ السَّلَام) کە دەفەرموێت: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (الأنبياء : ٨٣) "(ئەی پەروەردگارم) بەڕاستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە و تۆیش میهرەبانترینی میهرەبانانی." هەروەها دوعاکەی حەزرەتی یونسیش (عَلَيْهِ السَّلَام) کەدەفەرموێت: ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (الأنبياء : ٨٧) "پەروەردگارا هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە تۆ(پاك و بێگەردی هەر بۆ تۆیە)، بەڕاستی چوومەتە ڕیزی ئەوانەوە کەوا ناحەقییان کردووە." نموونەی جۆری دووەمیش، دوعاکەی حەزرەتی زەکەریایە (عَلَيْهِ السَّلَام) کە لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە و دەفەرموێت : ﴿هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ (آل عمران : ٣٨) "پەروەردگارا، لە لایەن خۆتەوە نەوەیەکی چاك و پاکم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ بیسەری دوعایت."

لە لایەکی ترەوە، جەخت کردنەوەی قورئانی پیرۆز لەسەر ئەم بابەتە و، هەروەها ئەوەش کە ڕاستەوخۆ خۆی ئەو دوعایانە فێری سەروەرمان دەکات کە کردنیان پێویستە، لە ڕوانگەی دەرخستنی گرنگی بابەتەکەوە جێی سەرنجە. باشە ئەگەر ئەمە وا نەبووایە، ئایا قورئانی پیرۆز لە ڕێی سەدان ئایەتەوە ئەوەندە جەختی لەسەر ئەم بابەتە دەکردەوە؟ جگە لەمە، بە سەدەها بگرە هەزارەها فەرموودەی شیرینیش کە لە پێغەمبەری سەروەرمانەوە ڕیوایەت کراون، دەڕژێنە هەمان خانەوە. ئەوەتا لە لایەکەوە زەمین و سەرنجەکان بۆ سەر گرنگی و بایەخی ئەم بابەتە

ڕادەکێشن، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو دوعا و نزایانە فێری ئەم ئومەتە دەکەن کە لە هەر بڕگەیەك لە بڕگەکانی ژیاندا پێویستە بکرێنە توێشووی ڕێ. جا بۆیە دەبینین کاتێك مرۆڤ هەریەك لە هەست و بیرکردنەوەکانی لە شێوەی ویست و داواکاریدا پێشکەش دەکات، دەیەوێت ئەمە بەباشترین شێوە و، بە وشەگەلێکی کەم و پوخت و، واتاگەلێکی گشتگیر و فراوان دەربڕێت. دەی گەورەترین یارمەتیدەر و پشتیوانیش لەم بوارەدا، بە پلەی یەکەم قورئانی پیرۆز و لە پلەی دووەمیشدا ئەو دوعا و نزایانەن کە فەرموودە شیرینەکان فێریان کردووین.

بەڵێ وایە، چونکە ئەو زاتەی هەستی داواکردنی پێ بەخشیوین، هەر خۆشی لەو دوعایانەدا چۆنیەتی داواکردنی فێرکردووین. بێ هیچ گومانێکیش ئەو کەسەی جوانترین و کاریگەرترین نزا و پاڕانەوەی فێرکراوە، حەزرەتی محمد المصطفی‌یە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وصَحْبِهِ وَسَلَّمَ). ئاخر چونکە چاکترین ناسەر و ناسێنەری ئەو زاتەی بە دوعا لە دەرگای دەدرا، ئەو بوو.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مرۆڤی ئیستیقامەتە. جا خۆ بەندایەتیش بریتییە لە ئیستیقامەت. ئەوەتا کاتێك خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿ وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ (یس : ٦١) ”تەنها من بپەرستن، ڕاستەڕێ ئا ئەمەیە.“ ئەوا ئاماژە بۆ ئەم حەقیقەتە دەکات. لە هەموو هەڵسوکەوت و کردەوەکانی پێغەمبەری خوادا پێوانە و هاوسەنگییەك هەبوو. هاودەم لەگەڵ ئەوەی سوپا مەزنە جیهان ڕزگارکەرەکەی ئیسلامی بەرەو ئەملا و ئەولا بەڕێ دەخست، لە هەمان کاتیشدا هەرگیز دەستبەرداری ڕێسا هەمیشەییەکەی نەبووە، کە خۆی لە ئازار نەدانی تەنانەت مێروولەیەکیشدا دەبینییەوە. بەڵێ، بەردەوام دەستی بە هۆکارەکانەوە دەگرت، بەڵام هەرگیز دوعاشی پشتگوێ نەدەخست.

ئەوکەسەی خوازیارە چاوی بە تەمەنێك بکەوێت کەوا شەو و ڕۆژی لە ڕاز و

نیاز و ناڵیندا بەسەربراوە، ئەوا با تەماشایەکی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) بکات. بەڵێ، با تەماشای بکات تاوەکو مرۆڤایەتی لێیەوە دوعا و ئادابەکانی و، ئەو دەسکەوتە ماددی و مەعنەوییانەش بە چاوی خۆی ببینێت کەوا دوعا دەست مرۆڤی دەخات. بەڵێ، با مرۆڤایەتی ئەمە ببینێ و بۆ خۆی دانیشێ پەندی لێ وەربگرێت.

تاوەکو ئێستا بەسەدەها کەس هەستاون بە کۆکردنەوەی دوعاکانی سەروەرمان لە دووتوێی بەرگە کتێبدا و چەندین کۆمەڵە نزایان لێ پێك هێناوە. خوای باڵادەست نووسەری ئەم چەند دێڕەشی لەم لوتفەی خۆی بێبەش نەکرد؛ جا خۆ ئەو هیچ کەس بێ بەش ناکات! ئەوەبوو لەژێر ناونیشانی "مَجْمُوعة الأَدْعية المَأْثُورة"دا نزا و پاڕانەوەکانی سەروەرمان کۆکرایەوە. بە پێی توانا هەوڵدرا ئەم بەرهەمە لەڕووی قەبارەوە بچووك دەربچێت.

تەنانەت خوێنەرانی ئەم بەرهەمە بچکۆلانەیەش، ئەو ڕاستییە بە چاوی خۆیان دەبینن کە تەنانەت لە بابەتی دوعاشدا گەیشتنەوە بە سەروەرمان کارێکی مەحاڵە. هەر دەڵێی هەموو ساتێکی ژیانی بە نزا و پاڕانەوە بەسەربردووە. خۆ ئەگەر کەسێك هیچ کارێکی تر نەکات و تەنها خەریکی دوعاکردن بێت، ئەوا کۆی ئەو دوعایانەی کە ئەو کەسە بە درێژایی ژیانی دەیانکات و تەمەنێك دەخایەنن، ئینجا ئەگەر بگاتەوە بە ژمارەی ئەو دوعایانەی کە لە پێغەمبەری خواوە ڕیوایەت کراون...

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) دوعاکانی بەسەر ژیانیدا بەش کردبوو و بەردەوام بەسەر ئەم کریستاڵە نوورینانەدا ڕێی دەکرد. دوعا، ویردی دانەبڕاوی سەر لێوانی و ئاهـ و فیغانی گڕسەندووی ناخی بوو. بۆ تەنها ساتێکیش چییە بێ دوعا نەبووە و هەرگیز ئەم کاسە کەوسەرییەی سەر لێوانی دانەناوە. مەردی مەیدانی بزاوت و داوەری ژیری بوو، کەچی لە عیبادەت و دوعاشدا هاوتا و وێنەی نەبوو.

هاوەڵانیش کۆمەڵگەیەك بوون ڕەنگی پەرستشیان گرتبوو. بەڵام هەر وەختێ بیانویستایە شان بەشانی ئەو نازدارە بڕۆن، لەپێ دەکەوتن و بەجێ دەمان -ڕۆحی قطمیر قوربانی ئەو لەپێ کەوتە و بەجێماوانە بێ- کەچی ئەو نازدارە ئەوەی ناوی ماندوویوون بوو نەیدەزانی و بێ وچان بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن. ئاخر خوای گەورە بۆ ئەوە بەدی هێنابوو تا هەمیشە بەرەو پێش بڕوات و لە پێشەنگیدا بێت.

لە میعراجیشدا جوبرەئیل (عَلَيْهِالسَّلَامُ) هەوڵی دا شان بەشانی بڕوات، بەڵام عورووجی سەروەر گەیشتە خاڵێك، ئیتر ئەویش توانای لێبڕا... ئەوەبوو پێی فەرموو: "بکەوە ڕێ ئەی پێغەمبەری خوا، هەرخۆت شاسواری ئەم مەیدانەیت." بەڵێ، مرۆڤێك بوو، وەك ئەوە وابوو پێشبڕکێ لەگەڵ فریشتەکاندا بکات.

پێغەمبەری خوا (صَلَّىَاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) لە بەرزترین لوتکەی هەستی بەندایەتی و بڵندترین بورجی نزادا بوو. لە بڵندترینی ئاسۆکانەوە تەماشای گەورەیی و شکۆمەندی خوای باڵادەستی دەکرد و، لێوان لێو بوو لە واریدات و، بە تاسەیەکی بێگەردی واوە کە تێربوونی نەدەزانی، دەیفەرموو: "مَا عَرَفْنَاكَ حَقَّ مَعْرِفَتِكَ يَا مَعْرُوفُ[1] و لەتاو نەناسینی تەواوەتی پەروەردگاری -ئەو نەناسینەی کە خودی ناسینی ڕاستەقینەیە و حەزرەتی ئەبوبەکر بە اَلْعَجْزُ عَنِ الْإِدْرَاكِ إِدْرَاكٌ "هەر ئەوەندەی تێبگەین کە دەستەوسانین لە تێگەیشتن، ئیتر ئەوە بۆ خۆی خودی تێگەیشتنە."[2] گوزارشتی لێکردووە- ئاخی تاسەی سەندبوو. بەگوێرەی ئاسۆ پیرۆزەکەی خۆی هەر دەیفەرموو: هَلْ مِنْ مَزِيدٍ؟..

١ المناوي، فيض القدير ٤١٠/٢؛ الألوسي، روح المعاني ٧٩/٤، ٢٠٢/١٧.

٢ قشيري، الرسالة القشيرية، لا ٣٠٠؛ إمام غزالي، إحياء علوم الدين ٢٥٢/٤، ٣٠٥، المقصد الأسنى لا٥٤. (ئەم شێوەیەی دەقەکە لە "إحياء علوم الدين"ەوە وەرگیراوە.)

## چەپکێك لە نزاکانی

ئەوەی ڕاستی بێت بەنیاز نین لەم برگەیەدا بچینە خزمەت تەواوی نزا شیرینەکانی پێغەمبەری پێشەوا و شیکاری هەموویان بکەین. لای جەنابیشتان ئاشکرایە کە تەنها بە مەبەستی ئاماژە پێدانێك بە گەورەیی سەرورمان (صَلَوَاتُ اللّٰهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) لە نزا و پاڕانەوەدا دەستمان دایە ئەم بابەتە. ئێستاش پێم خۆشە لە نێوەندی هەزاران دوعای ئەو سەروەرەدا، چەند دانەیەکیان بە نموونە بهێنینەوە و خاڵی کۆتایی ئەم باسەش دابنێین.

## ١. پێش خەوتن

نوستن برا بچووکی مردنە.[1] جا بۆیە کاتێك مرۆڤ دەچێتە پێخەفی خەوەوە، دەبێت بەم هەستەوە چاوانی لێك بنێت. چونکە لەوانەیە ئەم چاولێکنانەی، دوایەمین چاولێکنانی ئەو کەسە بێت لە دنیادا. کەوابێ پێویستە چوونە ناو جێگا، هاودەم لەگەڵ بێداری و سەرنجێکی ورددا بێت نەوەك غەفڵەت و بێ ئاگایی.

پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەر لەوەی بچێتە ناو جێگاوە ئەم دوعایانەی دەخوێند: سەرەتای سورەتی "البقرة" و سێ ئایەتی کۆتایی ئەو سورەتە،[2] آية الكرسي،[3] سورەتی "يس"،[4] سورەتی "السجدة"،[5] سورەتی "الملك"،[6] پاشان یەکی سێ جار سورەتی "الإخلاص" و "المعوذتين" واتە سورەتەکانی "الفلق" و "الناس" و یەك

١ طبراني، المجمع الأوسط ٢٨٢/١، ٣٤٢/٨؛ بيهقي، شعب الإيمان ١٨٣/٤.
٢ دارمي، فضائل القرءان ١٤.
٣ ترمذي، فضائل القرءان ٢؛ دارمي، فضائل القرءان ١٤.
٤ هيثمي، مجمع الزوائد ٩٧/٧؛ إبن حجر، المطالب العالية ٣٥٨/٣.
٥ ترمذي، فضائل القرءان ٩، دعوات ٢٢؛ إبن حجر، المطالب العالية ٣٥٨/٣.
٦ ترمذي، فضائل القرءان ٩، دعوات ٢٢.

جاریش سورەتی "الکافرون".[1] پاشان هەردوو دەستی لێکدەنا و فووی پیادەکرد و چەندێك دەستی بگەیشتایە، دەیهێنا بە جەستەی موبارەکیدا.[2] دواتریش کۆمەڵێك دوعای زۆری تری دەخوێند کە لێرەدا بە هۆی درێژەکێشانی باسەکەوە، بواری ئاماژە پێدانیانمان نییە و خوێنەری ئازیز حەواڵەی ئەو بەرهەمە ناوبراوەی سەرەوە و سەرچاوەکانی تری دوعا دەکەین. خوازیاران دەتوانن لە ڕێی ئەو سەرچاوانەوە بچنە خزمەت گوڵزاری نوورینی ئەو دوعایانە و بەرۆکی هەموو سات و گۆشەیەکی ژیانیان بەگوڵ خەملاو بکەن.

## ٢. کاتی چوونە ناو جێگا

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ أَفْضَلُ صَلَاةٍ وَسَلَامٍ) کاتێك دەچووە ناو جێگەوە ٣٣ جار سبحان‌الله، ٣٣ جار الحمد لله، ٣٣ جار (لە ڕیوایەتێکدا ٣٤) الله‌اکبری دەکرد و بەدواشیدا گەلێ دوعای تری دەخوێند.[3] یەکێك لەو دوعایانەش ئەمەیە:

اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، اللّٰهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ، بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا

"خودایە، وا خۆمم دایە دەست تۆ و ڕووم کردە تۆ و هەموو کاروبارێکی خۆمم سپاردە تۆ. ئومێد بە ڕەحمەتت و ترس لە سزات پشتم بە تۆ بەست. هیچ پەنا و داڵدەیەك نییە لە خۆت مەگەر هەر بۆلای خۆت. باوەڕی تەواوم هێناوە بەو

---

١ أبو داود، الأدب ١٠٨؛ ترمذي، دعوات ٢٢.
٢ ترمذي، دعوات ٢١-٢٢.
٣ بخاري، فضائل الصحابة ٩، دعوات ١١؛ مسلم، ذكر ٨٠.

کتێبەی نازڵت کردووە و بەو پێغەمبەرەیش کە ڕەوانەت کردووە. (مەرجە پێغەمبەر تەصدیقی پێغەمبەرایەتییەکەی خۆی بکات.) خودایە، بمپارێزە لە سزای خۆت لەو ڕۆژەدا کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە، تەنها بە ناوی تۆوە دەمرم و هەر بە ناوی تۆشەوە زیندوو دەبمەوە."[1]

ئینجا دەستی ڕاستی دەخستە ژێر سەری و ئەژنۆکانی کەمێك دەنوشتاندەوە و لەسەر لای ڕاست دەنووست.[2] ئەمە نووستنێك بوو لە پێناو هەستانەوەدا. ئاخر چونکە ئەو هەمیشە لە جۆش و خرۆشی هەستانی شەودا بوو.

## ٣. هەستانی بۆ شەونوێژ

هەستانەوەشی بۆ شەونوێژ بەم دوعایە دەڕازاندەوە:

اللّٰهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنتَ قَيِّمُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنتَ مَلِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، ولَكَ الْحَمْدُ أَنتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ

"خودایە، سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە. تۆ قەییوم(ڕاگیرکەری) ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی کە تێیاندایە. دیسان سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ ئەو خاوەن موڵکەیت کە خاوەنی ڕاستەقینەی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی کە تێیاندایە. دیسانەوە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ نووری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەیشی کە تێیاندایە."[3]

لە ڕاستیدا خوێندنی ئەم نزایە بەو نیوەشەوە زۆر واتادارە. چونکە لە شەودا

١ بخاري، دعوات ٦-٧؛ ترمذي، دعوات ١٦.
٢ أبو داود، الأدب ٩٨؛ نسائي، صيام ٧٠؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٤٠٠، ٤١٤.
٣ بخاري، تهجد ١، توحيد ٨، ٣٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٣٥٨.

ئاسمان بەهەموو شکۆ و ڕەونەقێکیەوە دەردەکەوێت. ئەستێرەکانیش ورشەیان دێ و چاو دەتروکێنن. هەموو ئەم دیمەنە دڵڕفێنانەش مەگەر هەر خوا خۆی بزانێ چاووگی چ واتاگەلێك لە دەروونی مرۆڤدا دەتەقێنن. سەر ڕووی زەمینیش دڵبەستەی هەمان هەماهەنگییە. جا ئیتر لەم نزایەدا حەمد و سەنای ئەو پەروەردگارە دەکرێت کە لەنێو هاوسەنگییەکی سەرسووڕهێن و جوانییەکی بێ وێنەدا ئاسمان و زەمینی ڕاگیرکردووە.

زۆربەی زانایان وای بۆدەچن کە ناوی پیرۆزی "القَيُّوم" یەکێك بێت لە ناوەکانی "الإسمُ الأعظَم". ئەوەتا پێغەمبەری سەروەریشمان لە کاتی حەمد و سەنای پەروەردگاریدا، زۆربەی جار جیلوە و درەوشانەوەکانی ئەم ناوەی دەکردە تکاکار و بەو جۆرە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی دەکرد.

"مُلْك"یش و"مِلْك"یش هەر هی خوای گەورەیە (جَلَّ جَلَالُهُ). کەواتە "مَلِك"یش و "مَالِك"یش تەنها هەر ئەوە.

بڕواننە ئەو عەهد و پەیمان و صەداقەتەی، دوو سێ سەعات لەمەوبەر بەڵێن و پەیمانەکەی نوێ کردەوە و خەوت. وا ئێستاش کە بەخەبەر دێت، یەکەم کارێ بیکات، نوێکردنەوەی بەڵێن و پەیمانەکەیەتی. چونکە ئەوەندە نابێت لەو گەشتەی جیهانەکانی ئەودیوەوە بەرەو جیهانی بینراو گەڕاوەتەوە کە لە خەودا بەناویاندا گەڕابوو. بۆیە دەبوایە پەیمانەکەی نوێ بکاتەوە.

ئینجا لەسەر دوعاکەی بەردەوام دەبێت:

وَلَكَ الْحَمْدُ أَنتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ الْحَقُ وَلِقَائُكَ حَقٌّ وَقَوْلُكَ حَقٌّ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ وَمُحَمَّدٌ (صَلَّىاللهُتَعَالَىعَلَيْهِوَسَلَّمْ) حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللّٰهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَنتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنتَ الْمُؤَخِّرُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ

''سوپاس و ستایش بۆ تۆ، تۆ حەقیت. بەڵێنت ڕاستە. دیدارت ڕاستە. فەرمایشتت ڕاستە. بەهەشت و دۆزەخیش ڕاستن. پێغەمبەران و حەزرەتی محمد (صَلَّىاللهُتَعَالَىعَلَيْهِوَسَلَّمْ) ڕاستن. ڕۆژی قیامەتیش ڕاستە.

خودایە، خۆم ڕادەستی تۆ کرد. ئیمانم بە تۆ هێنا. پشتم بە تۆ بەست، بۆ لای تۆ گەڕامەوە، تەنها بە کۆمەکی تۆ بەربەرەکانێ دەکەم و داوەریشم تەنها بۆ لای تۆیە. دەسا لە گوناهی لەمەوپێش و لەمەودوام خۆشبە (بوارم مەدە لە داهاتوودا گوناھ بکەم، دەرگاکانی گوناهم بەڕوودا دابخە). لەو گوناهانەشم خۆشبە کە بەنهێنی یان بەئاشکرا ئەنجامم داون. لە هەموو ئەمانەش زیاتر لەو گوناهانەشم خۆشبە کە خۆت زۆر لە من باشتر دەیانزانیت (چونکە لەوانەیە ئاگاداری ئەوە بم کە بەدڵمدا دێت. بەڵام مەرج نییە ئاگاداری ئەو شتانە بم کە بە "سر" و "خفي" و "أخفی"مدا گوزەر دەکەن. دەسا ئەگەر بێ ئەوەی من پێم زانیبێت، لادانێك لەم هەستانەمدا ڕووی دابێت، ئەوا لەبەر ئەوەش لێم خۆشبە. هەر خۆت پێشخەریت هەر خۆشت پاشخەر. هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە تۆ، خاوەن هێز و دەسەڵات و تواناش بەتەنها خوای گەورەیە.''[١]

کاتێك دەوترێت "حەق"، ئەوا بەگوێرەی دەستووری: ''ڕەهایی ناوبردن دەڕوانێتە

١ بخاري، تهجد ١، توحيد ٨، ٣٥؛ أحمد بن حنبل، المسند ١/٣٥٨.

کەماڵی ئەو زاتە." یەکەمین شت کە دێت بە مێشکی مرۆڤدا، خوای گەورەیە (سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى). بەمەش پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی ڕایدەگەیەنێت کە هەر شتێك لە لایەن ئەو خودا حەقەوە بێت، حەق و ڕاستییە.

ئەوەبوو پێش ئەوەی بخەوێت تەسلیمیەتی خۆی عەرزی پەروەردگاری کردبوو. ئینجا هەر کە خەبەریشی دەبێتەوە، دووبارە تەسلیمیەتی خۆی دووپات دەکاتەوە و ئیمانەکەی ڕادەگەیەنێت. ئیتر بەم چەشنە، هاودەم لەگەڵ ئیمانێکی وەها و هەستێکی تەسلیمیەتی قووڵی لەم جۆرەوە هەنگاو دەنێتە ڕۆژێکی نوێی ژیانیەوە. دوعاکەش بەم بڕگەیە دێتە پایان: لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللهِ. جا خۆ ئەگەر مرۆڤ پەنا نەباتە بەر هێز و دەسەڵاتی خواوەندی باڵادەست (جَلَّ جَلَالُهُ)، ئەوا ناتوانێت لەژێر باری قورسی ئەرکەکانی سەرشانیدا دەربچێت. چونکە ئیمان و تەوەککول و تەسلیمیەت شتانێکن تەنها بە ویستی خوای گەورە بەدەست دێن. خۆ ئەگەر ئەو ویستی لەسەر نەبێت و پشتیوان و یاریمەتیدەر نەبێ، ئەوا کێ هەیە بتوانێت ئەو بدۆزێتەوە و بە دیداری شادبێت؟ جا مادەم وایە، هەرکەسەو بەگوێرەی ئاستی خۆی، ناچارە کە پەنا بەرێتە بەر حەول و قووەتی خوای گەورە.

جا ئیتر سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ) بەم هەست و بیرەوە و لەپاش ڕەخساندنی کەشێکی مەعنەوی لەم جۆرە، دەستی دەکرد بە نوێژ و زوڵفی تاری شەوی بە تافەی فرمێسکەکانی ئاودامان دەکرد.

بەتایبەت لەو نوێژە سوننەتانەدا کە بەتەنیا ئەنجامی دەدان، زۆر دوعای دەکرد و هەتا بکرایە درێژی دەکردەوە. کاتێکیش دەستی دەکرد بە نوێژ، پێش سوورەتی فاتیحە ئەم دوعایانەی دەخوێند: اَللّٰهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ "خودایە نێوانی من و گوناهەکانم دوور بخەرەوە. وەك چۆن

نێوانی خۆرهەڵات و خۆرئاوات دوور خستووەتەوە."[1]

اَللّٰهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ "خودایە، لە هەڵەکانم پاکژم بکەرەوە، هەروەك چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك و پەڵە پاك دەکرێتەوە."[2]

دوای ئەمانەش "سبحانك"ی دەخوێند و لەپاش ئەم هەموو تەسبیح و تەقدیسە ئەوجا دەستی دەکرد بە خوێندنی سورەتی "الفاتحة". ئەگەرچی لەم نێوەندەدا پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) چەندین دوعای تریشی دەخوێند، بەڵام ئێمە دیسان ئازیزانمان ڕەوانەی کۆکراوەی نزاکان دەکەین و بەم ئەندازەیە دەست هەڵدەگرین.

## ٤. بەیانیان کە هەڵدەستا

ئازیزی گیانان لەگەڵ تیرۆژی بەرەبەیاندا، ئەم دوعایە دەبووە ئاورنگی سەر پەڕەی سەوسەنی زوبانی:

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلَائِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ بِأَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ

"خودایە، وا ڕۆژم کردەوە و دان دەنێم بەوەدا کە: خۆت و هەڵگرانی عەرش و فریشتەکان و سەرجەمی بوونەوەران بە شاهێد دەگرم کە وا تۆ ئەو خوایەیت کە جگە لەو، هیچ خوایەکی تر بوونی نییە و محمد (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمْ)یش بەندە و نێرراوی تۆیە."[3]

---

١ بخاري، تهجد ١٦؛ مسلم، مسافرين ١٢٥، ٢٠٣-٢٠٤.
٢ بخاري، الأذان ٨٩، دعوات ٣٩؛ مسلم، مساجد ١٤٧.
٣ أبو داود، الأدب ١١٠؛ ترمذي، دعوات ٧٨.

بەڵێ، هەموو ئەوانە بە شاهێد دەگرم و دەیانهێنمە زمان. لەنجەولاری درەختەکان و شنە و لەرینەوەی گەڵاکان و هاژە و خوڕەی ئاوەکان دەخەمە پاڵ شاهێدییەکەی خۆم و وەك دەنگێك کە لە سەنفۆنیاوە بەرز بوویێتەوە، ئاوا منیش سەدای زوڵاڵی هەموویان، پێشکەش بە تۆ دەکەم.

لە ڕاستیدا ئەم پێشکەشکردنەی سەروەرمان (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، زادەی بەرینی هەست و ئیدراك و، قووڵی ئەو پەیوەندییەی بوو کە لەگەڵ پەروەردگاریدا هەیبوو. خۆ گەر بێت و کەسێکی تر هەمان ئەو ڕستانەش دووبارە بکاتەوە، هێشتا هەر ناتوانێت بگاتەوە بە هەمان ئاست و، هەرگیز ئەو قووڵییەی دەستگیر نابێت.

وەك دەبینین، پێغەمبەری پێشەوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سەرجەمی بوونەوەران، بەتایبەت نزیکترین فریشتەکان لە پەروەردگارەوە و، ئاسمان نشینان کە سەرپەرشتی بوونەوەران دەکەن، دەگرێت بە شایەت.. و ئەو حەمد و سەنایەی دەیەوێت پێشکەشی پەروەردگاری جیهانیانی بکات، ئاوێتەی هەناسەکانی ئەوانی دەکات و بەو شێوەیە عەرزی حوزووری ئیلاهی دەکات. لە ڕاستیدا ئاوێتە بوونی نزاکانی سەروەرمان لەگەڵ هەناسەی فریشتەکاندا، هەست و تێگەیشتنێکی وا لای ئێمە دروست دەکات، کە ئەمە پوختەکەیەتی: کاتێك لە دەرگای گەورەکان دەدەین، سەرەتا پێویستە بەدوای دەستێکدا بگەڕێین کە لە دەرگاکە بدات... بۆیە خاوەن فیراسەتێکی مەزنی وەك حەزرەتی عومەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، لە کاتی وشکە ساڵییەکەی مەدینەدا، دەستی حەزرەتی عەبباس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دەگرێت و دەیباتە سەر بەرزاییەك، ئینجا دەستی حەزرەتی عەبباس بەرز دەکاتەوە و بەم جۆرە دەپاڕێتەوە: "خوایە گیان، ئەمە دەستی مامی خۆشەویستەکەی خۆتە، دەسا تو خاتری ئەم دەستە بارانمان بۆ ببارێنە." هاوەڵان دەڵێن هێشتا دەستی دانەنابووەوە، باران بەلێزمەدەستی کردە بارین. ئەمە فیراسەتێکی عومەری بوو و ئەم وانەیەشی لە سەروەرمانەوە وەرگرتبوو کاتێك نزا و پاڕانەوەکانی تێکەڵ بە هەناسەی فریشتەکان دەکرد. کەڵە دەردمەندی سەدەش بە هەمان هەست و شعوورەوە دوعا دەکات و دەڵێت:

إِلَهِي اَلذُّنُوبُ أَخْرَسَتْنِي وَكَثْرَةُ الْمَعَاصِي أَخْجَلَتْنِي وَشِدَّةُ الْغَفْلَةِ أَخْفَتَتْ صَوْتِي فَأَدُقُّ بَابَ رَحْمَتِكَ وَأُنَادِي فِي بَابِ مَغْفِرَتِكَ بِصَوْتِ سَيِّدِي وَسَنَدِي الشَّيْخِ عَبْدِ الْقَادِرِ الْكَيْلَانِي...

"خودایه، گوناهەکان لاڵیان کردووم. زۆری سەرپێچییەکانیشم ڕووزەرد و شەرمەزاریان کردووم. چڕی پەردەی بێ ئاگاییشم دەنگی کپ کردووم. جا بەم حاڵەوە لە دەرگای ڕەحمەتت دەدەم و لەبەر قاپی لێبووردەییتدا دەنگ و هەناسەی گەورە و سەردارم "شێخ عبدالقادری گەیلانی" دەکەمە تکاکار و بە نزا ناسکە هاوڕازەکەی کە لای دەرگاوان قبوڵکراوە، لەقاپی میهر و بەزەییت دەدەم."[1]

لە نێو زیکرەکانی بەیانیانی پێغەمبەری خوادا چاومان بەم نزا شیرینەش دەکەوێت:

اَللّٰهُمَّ فَاطِرِ السَّماوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ، فَإِنِّي أَعْهَدُ إِلَيْكَ فِي هَذِهِ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَأُشْهِدُكَ وَكَفَى بِكَ شَهِيداً

"خودایە، ئەی ئەفرێنەری ئاسمانەکان و زەمین، ئەی زانا بە جیهانی پەنهان و ئاشکرا، ئەی خاوەن دەسەڵات و شکۆ و بەخشندەیی، وا من لەم ژیانی دنیایەدا پەیمانت پێ دەدەم و بە شایەتیشت دەگرم، هەر خۆشت بەسیت بۆ شایەتی."[2]

ئەوەی جێی تێڕامانە لێرەدا، بەکارهێنانی ناوی "الفاطر"ە. چونکە ئێمە دەزانین وشەگەلێکی تریشمان هەن کە هاوواتای ئەم ناوەن، لەوانە: الباریٔ - الخالق - الجاعل. دەکرێ لە بەکارهێنانی وشەی "الفاطر"دا ئەم واتایانەی خوارەوە بەهەند وەرگیرابێت:

---

1 بخاري، إستسقاء ٣، اصحاب النبي ٢٢؛ حكيم، المستدرك ٣/٣٧٧.
2 أحمد بن حنبل، المسند ٥/١٩١؛ طبراني، المجمع الكبير ٥/١١٩.

هەر تۆ ئاسمانەکان و زەمینت بەگوێرەی فیترەت بەدیهێناوە و ڕامت کردوون بۆ ئەو یاسا فیترییانە. لەنێو ئەم یاسا فیترییانەدا، هەر یەك لە زانستەکانی پزیشکی و فیزیا و کیمیا و فیزیای گەردوونی و گەردوونزانی هەریەکەیان یاسا و ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە. هەر دەڵێی هەموو بەیانییەك ئەم یاسایانە نوێ دەبنەوە و سەرلەنوێ خۆیان نمایش دەکەنەوە. بەڵێ، ئەوە تۆیت کە ئەم ڕێسا و سیما پڕشنگدارەت پێ بەخشیون.

## ٥. دەمەو ئێواران

پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆردا ساتەکانی گزنگی بەو دوعایەی سەرەوە و سەدەهای وەك ئەوە دەڕازاندەوە، وەختێك خۆریش ئاوا دەبوو و تاریکی ڕەشماڵی ڕەشی خۆی هەڵدەدا، ئەم دوعایەی دەخوێند. جا ئەو دوعایانە دەبوونە خۆری ڕۆژانیشی و شەوانیشی. شەوانی پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بەوێنەی ڕۆژگارەکانی ڕۆشن و پڕشنگدار بوون. نزا و پاڕانەوەکان، لە ئاسمانی شەوی ئەو نازدارەدا دەتوت چرای نووربەخشن. جا ئیتر ئەویش هەرگیز هەڵکردنی ئەو چرایانەی فەرامۆش نەدەکرد:

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَمْسَيْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلَائِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ بِأَنَّكَ أَنْتَ اللهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ

"خودایە، وا من ئێوارەم بەسەردا هات، خۆت و هەڵگرانی عەرشت و فریشتەکانت و سەرجەمی بوونەوەرانت بە شایەت دەگرم کە هەر خۆت "اللّٰه"یت و هیچ پەرستراو و خودایەکی تر نییە جگە لە تۆ، تاك و تەنها و بێ شەریکیت و

حەزرەتی محمد (عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)یش بەندە و نێردراوی تۆیە.»[1]

هەر ڕوکنێکی نوێژەکانی ئەو سەروەرە (صَلَوَاتُ اللهِ وَسَلَامُهُ عَلَيْهِ)، وەك پەیژەیەکی نوورانی وەهایە کە بەرەو عەرش بەرز بوویێتەوە. پلیکانەکانی ئەو پەیژەیەش لە دوعا پێکهاتووە.

ئەو کەشە نوورانییەش کە لە دەمی خۆ ئامادەکردن بۆ نوێژدا دروست دەبێت، پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەو نوورانی بوونەوە هەیە کە لە ناو نوێژدایە.

دەم بە دوعا دەچووە ئەدەبخانە و هەر بەدەم دوعاشەوە دەهاتە دەر. لە دەسپێکی دەستنوێژدا دوعایەکی دەکرد و لە کاتی شوشتنی ئەندامەکانیشیدا دوعایەکی تر، وەختێکیش لە دەستنوێژ دەبووەوە، کۆمەڵێك دوعای تر. لەدوای بانگ دوعایەکی دەکرد. وەختێکیش دەستی دەکرد بە نوێژ دوعایەکی تر، کە بەرەو مزگەوت هەنگاوی دەنا، کە دەچووە ناو مزگەوت، کە لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە، لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا کۆمەڵە دوعایەك هەبوو کە دەیخوێند. کاتێك نوێژی دادەبەست، ڕاستەوخۆ بەدوای تەکبیری دەستپێکردندا دوعای دەکرد. لە ڕکوع، سوجدە، قیام، لەنێوانی دوو سوجدەکە، تەحیات و لەپاش سەلام دانەوەشدا کۆمەڵە دوعایەکی جۆراوجۆر هەبوون و تا بکرایە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) درێغی نەدەکرد لە خوێندنیاندا.

---

1 ترمذي، دعوات ٧٨؛ أبو داود، الأدب ١٠٠.

## ٦. له ناو نوێژدا

له پاش تەکبیری دەستپێکردن ئەم دوعایەی دەخوێنێ:

وَجَّهْتُ وَجْهِي لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنِ الْمُسْلِمِينَ. اَللّٰهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَنْتَ رَبِّي وَأَنَاَ عَبْدُكَ. ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعاً إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ...

"من ڕووم کردە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەمینی بەدی هێناوە و جگە لەو پشتم لە هەموو شتێکی تر کردووە و تەسلیمی ئەو بووم. هەرگیز لەوانەش نیم کە هاوبەش بڕیار دەدەن. بە دڵنیاییەوە هەموو نوێژ و پەرستش و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە. ئەو زاتە هیچ هاوەڵ و هاوبەشێکی نییە. منیش هەر بەمە فەرمانم پێکراوە و یەکێکم لە موسڵمانان. خودایە تۆ مەلیکیت، هیچ خوایەکی تر نییە جگە لە تۆ. تۆ پەروەردگاری منی و منیش بەندەی تۆ. ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە و دان دەنێم بە گوناهەکانمدا، سا لە هەموو گوناهەکانم خۆشبە، چونکە جگە لە تۆ، هیچ کەسی تر نییە لە گوناهان خۆشبێت."[1]

یەکێکیش لەو دوعایانەی کە لە ڕکوعدا دەخوێنرێت ئەمەیە:

اَللّٰهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

---

١ مسلم، مسافرين ٢٠١؛ ترمذي، دعوات ٣٢؛ أبو داود، صلاة ١١٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ٩٤/١.

"خودایە، ڕکوعم بۆ تۆ برد، باوەڕم بە تۆ هێنا و خۆم دایە دەست تۆ. گوێ و چاو و مۆخ و ئێسقان و کۆئەندامی دەمارم، وە هەر شتێك پێیەکانم هەڵیان گرتبێ، ملکەچ و گوێڕایەڵی خواوەندی پەروەردگاری جیهانیانن."[1]

کە لە ڕکوعیش هەڵدەستایەوە ئەم دوعایەی دەخوێند:

اَللّٰهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّماوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ

"خودایە حەمد و سەنا هەر بۆ تۆیە. پڕ بە پڕی ئاسمانەکان و پڕ بە پڕی زەمین و پڕاوپڕی ئەوەش وا لە نێوانیاندا و پڕاوپڕی هەرشتێکی تر کە لەمەودوا ویستت لەسەری بێت(و بەدی بهێنیت)، حەمد و سەنا بۆ تۆ خودایە."[2]

کاتێك دەچووە سوجدەشەوە دەیفەرموو:

اَللّٰهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبارَكَ اللّٰهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ. اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّةُ وَجِلُّهُ وَأَوَّلُهُ وَآخِرُهُ وَعَلَانِيَتَهُ وَسِرَّهُ

"خودایە، سوجدەم بۆ تۆ برد، باوەڕم بە تۆ هێنا و خۆم ڕادەستی تۆ کرد. وا ڕووم سوجدەی برد بۆ ئەو زاتەی بەدی هێناوە و شێوەی پێ بەخشیوە و گوێ و چاوی لێ دەرهێناوە. مەزنی و بڵندی بۆ ئەو خوایەی کە چاکترینی تەقدیرکارانە![3] خودایە، لە هەموو گوناهەکانم خۆشبە، بە گەورە و بچووکیەوە، بە سەرەتا و کۆتاییەوە، بە پەنهان و ئاشکراشیەوە."[4]

---

١ مسلم، مسافرين ٢٠١؛ ترمذي، دعوات ٣٢؛ أبو داود، صلاة ١١٨؛ أحمد بن حنبل، المسند ١١٩/١. (مەتنی تەواوی دوعاکە بەم شێوەیە، لە "المسند"دا هاتووە.)

٢ مسلم، مسافرين ٢٠١؛ ترمذي، دعوات ٣٢؛ أبو داود، صلاة ١١٨.

٣ مسلم، صلاة ٢١٦؛ أبو داود، صلاة ١٤٧.

٤ مسلم، مسافرين ٢٠١؛ أبو داود، صلاة ١١٨؛ ترمذي، دعوات ٣٢.

جگە لە پەرستشەکان مرۆڤ چی تر دەکات؟ دەخوات و دەخواتەوە، دەخەوێت و هەڵدەستێت.. پێدەکەنێ و دەگری.. خەمبار و دڵخۆش دەبێت.. هاوسەرگیری دەکات، دەبێتە خاوەنی ماڵ و منداڵ.. پۆشاکێکی نوێ دەپۆشێ.. سەفەر دەکات یان لە سەفەر دێتەوە.. جیهاد دەکات، دەجەنگێت و لە جەنگ دەگەڕێتەوە.. لە یەکێکەوە هەواڵێکی خۆش یان ناخۆش دەبیستێ.. بە دیداری دۆستێکی ئازیزی شاد دەبێت.. نەخۆش دەکەوێت، پاشان چاك دەبێتەوە.. دەخەوێت.. خەوێکی خۆش یاخود ترسناك دەبینێت، هەموو ئەمانە و سەدەها کاری تر ئەنجام دەدات و سەدان حاڵەت و بارودۆخی بەسەردا دێت. جا ئیتر سەروەرمان (صَلَّىٰاللهُعَلَيْهِوَسَلَّمْ) بۆ هەر یەکێك لەم حاڵەتانە، دوعایەکی تایبەت بەو حاڵەتەی دەخوێند و بەم شێوەیەش لایەنی مرۆڤانەی خۆیی لە زەریای لاهوت هەڵدەکێشا.

لەلایەکی ترەوە چەندین ڕووداو هەن کە لە دەرەوەی خودی مرۆڤ ڕوودەدەن و پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆیان بە مرۆڤەوە هەیە. بۆ نموونە؛ بەڵاگەلێکی هاوشێوەی وشکەساڵی، قات و قڕی، بێ بارانی، ئاگرکەوتنەوە، لافاو، گەردەلوول ئەگەر چی ڕاستەوخۆش زیانیان بۆ تاك نەبێت، بەڵام دیسان بە ناڕاستەوخۆیی دەبنە مایەی زەرەر و زیان. ئیتر بۆیە هەم بەنیازی یەکانگیربوون لەگەڵ کۆمەڵگە و، هەم بە ئامانجی گەڕانەوە و ڕووکردنە پەروەردگار، لەو بارودۆخانەدا پێغەمبەری خوا (عَلَيْهِالصَّلَاةُوَالسَّلَامُ) چەندەها نزای خوێندووە.

هەر لە گوڵزاری نزا و پاڕانەوەکاندا چاومان بە "جەوشەن"یش دەکەوێت. جەوشەن کۆمەڵە دوعایەکە و بەو هۆیەوە کە لە ڕێی ئالوبەیتەوە ڕیوایەت کراوە، لە لایەن پێشەوایانی سوننەوە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە. بەڵام ئەم دوعایە، ویردی سەر زوبانی هەموو گەورە و پیاوچاکان بووە و هەرگیز خوێندنیان فەرامۆش نەکردووە. بەڵێ، ئەوەی تەماشای جەوشەن بکات، لەوێدا زۆر ڕوونتر ئاستی قووڵی پێغەمبەری خوای بۆ دەردەکەوێت لە دوعاکردندا.

جا هەروەك لە سەرەتای ئەم بەشەشدا وتمان، دەرگای ئەم باسەمان بۆ ئەوە والآ نەکرد تا بچینە خزمەت هەموو دوعاکانی سەروەرمان. مەبەستمان پیشاندانی ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا (صَلَّىٰ اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) تەنانەت لە دوعاشدا هاوتا و هاوشانی نییە و هەموو ساتێکی ژیانی بە دوعاکردن بەسەربردووە. هەڵبەتە بەبێ تۆژینەوە لە سەرجەمی دوعاکان، مەحاڵە بە حق الیقین بەم دەرئەنجامە بگەین. بەڵام هەرچۆنێك بێت بە مەبەستی بەرچاوڕوونی، هەوڵماندا مشتێك لە خەرمانی ئەو دوعایانەتان عەرز بکەین. وەك چۆن چۆڕاوگێك دەبێتە بەڵگە لەسەر چاوگێك، ئەو کارەش کە ئێمە پێی هەستاین بەدەر نییە لەمەو دەبێت بەو چاوەوە تەماشا بکرێت.

بەڵێ، شایەتی دەدەین و ئیمان و باوەڕمان وایە کە ئەو پێشەوایە لە هیچ بەشێکی هیچ فەزیلەتێکدا هاوتا و وێنەی نییە و لوتکەنشینێکی ئەوتۆیە کە لە لوتکەی هەموو خەسڵەت و ڕەوشتە بەرز و بڵندەکاندایە. ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە هەر لە سەرەتای ئەم کتێبەوە تا ئێرە، لە هەوڵی نوێکردنەوە و چەسپاندنی ئەم ئیمانەماندا بووین. جا ئەگەر کەموکوڕی و ناتەواوییەك هەبێت، ئەوا پەیوەندی بە تێگەیشتن و شێوازی باسکردنی ئێمەوە هەیە و، ئەو لە هەموو جۆرە کەموکورتییەك پاك و بێگەردە. چونکە ئەو حەزرەتی محمد المصطفىیە (صَلَّىٰ اللهُ تَعَالَىٰ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ).

مەحاڵە لە ژیانی ئەم زاتەدا کە هەموو ساتێکی بە ڕووکردنە پەروەردگاری نوورئەفشان کردبوو، ڕێت لە چرکەساتێك بکەوێت تاریك و نووتەك بێت. ژیانی سەرتاپا پارچەیەکە لە دوعا و پاڕانەوە. بەڵێ، ئەو ڕۆژەی چاوی بەدنیا هەڵهێنا دەیوت: "ئوممەتەکەم.. ئوممەتەکەم" لە مەحشەریشدا دیسان هەر وا دەڵێت.[1] هەموو دەرد و خەمی ئەو "ئوممەتەکەیەتی"...

---

١ بخاري، تفسير سورة (٢) ١، توحيد ٣٦؛ مسلم، الإيمان ٣٢٢، ٣٢٦، ٣٢٧.

# نووری ئەمر

ئەوانەی چەندەها ساڵە هەزارەها جار شوێنیان گۆڕی و، وێڵی لقێکن کە خۆیانی پێوە ڕاگیربکەن، ئەوانەش کە وا لەم سیستەم بۆ ئەو سیستەم و، لەم ڕێباز بۆ ئەو ڕێباز لە هەناسەبڕکێدان، زوو بێت یان درەنگ، مایەپووچی و بێ ئاکامیی کرد و کۆششەکانیان دەبینن و، بە پرتاو بەرەو مەکتەبەکەی حەزرەتی موحەممەد(ﷺ) ڕادەکەن، ئەو مەکتەبەی کە هەرگیز نشوستی بەخۆیەوە نەدیووە.

ئایا توانیومانە ئەو سەروەرەی کە شاهی تەختی دڵانە، بە شێوەیەك شایانی قەدر و قیمەتی ئەو بێت، بە مرۆڤی ئەم سەردەمە بناسێنین و، بڵێسەی تاسە و شەیدایی لە ناخیاندا تاو بدەین؟..

نەخێر! ئەگەر مرۆڤایەتی ئەوی بناسیایە، دەبووە مەجنوونی و دەیدایە ئەو کەژ و هەردە. هەر کاتیش یادی شیرینی ئەو ڕۆژەکانی پێچابا، دڵی دەکەوتە جۆش و، چاوەکانی ئەسرینیان بۆ دەڕشت. ئیتر ئەو کات بۆ چوونە نێو جیهانی پاکی پێغەمبەرایەتییەکەیەوە، دەکەوتە پەرواز و لە پێناو گیان بەبەردا کردنەوەی خۆڵەمێشی دڵەی سووتاوی، کە لەتاو عەشقی ئەو گڕی سەندبوو، خۆی دەدایە بەر شنەی با تا بەرەو هەوارگەی ئەوینی ئەو ڕاپێچی بکا ...

ئەگەر عەقڵ و هەستەکانیشمان هەرگیز پەیی پێ نەبەن، ئەوا دەروونەکان بوونەتە پەروانەی دەوری ئەو شەمعە، ئەو خۆرە.. لە داهاتوویەکی زۆر نزیکدا، ئەو عەقڵە دەربەدەر و پەرێشانانەی کە تا ئێستا نەیانتوانیووە بەرەو ئەو بدەنە پرتاو و، بە وێنەی مێشی زستان لەملاو ئەولادا پەکیان کەوتووە، بۆ ئەم حاڵەیان دەستی پەشیمانی دەگەزن و بە خۆیان دەڵێن: ئاخ و داخ! ئێمە بۆ نەبووینە پەروانە و بەرەو ئەو نەڕۆیشتین؟ " بەڵام ئەو کات لەوانەیە بۆ هەندێکیان زۆر درەنگ بێت و هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبێت...






نرخ ٣٠٠٠ دینار

